ژمارە ٧٣

ڕۆڤار بڵاوکراوەیەکی ڕۆشنبیرییە
هەر ژمارەی
تایبەتە بەداهێنەرێک
دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم
دوو مانگ جارێک دەریدەکات

رۆڤار

## ژمارەکانی ڕابردووی ڕۆڤار

ئیبراهیم ئەحمەد، محەمەد مەولود (مەم)، کەمال مەزهەر، لەتیف حامید، سوارەی ئیلخانی زادە، محێدین زەنگەنە، ئەحمەد هەردی، یەڵماز گۆنای، ئیسماعیل بێشکچی، موحەرەم موحەمەد ئەمین، دڵدار، مەستورەی ئەردەڵانی، مەولانا خالیدی نەقشبەندی، جەمال عیرفان، مەلا عەبدولکەریمی مودەریس، جەلالی میرزا کەریم، عەبدولخالق مەعروف، هێمن، حسێن حوزنی موکریانی، ئەمین فەیزی، کامەران موکری، جەلال تەقی، حەمە ساڵح دیلان، هەژار، شاکیر فەتاح، کاکەی فەلاح، عەلائەدین سەجادی، شێخ محەمەدی خاڵ، حسێن عارف، عەلی ئەشرەفی دەروێشیان، سەلیم بەرەکات، پێشەوا قازی محەمەد، مەحمود مەلا عیزەت، فایەق بێکەس، عەبدوڵڵا پەشێو، جگەر خوێن، بابەتاهیری عوریان، عەرەب شەمۆ، دڵشاد مەریوانی، مەنسوری یاقوتی، حەسەنی قزڵجی، برایم ئەمین باڵدار، مەسعود محەمەد، بەختیار زێوەر، نەجمەدینی مەلا، مەلا جەمیل ڕۆژبەیانی، لەتیف هەڵمەت، حاجی قادر، پیرەمێردی نەمر، مەلا مەحموودی بایەزیدی، شێخ ڕەزا، شەریف پاشای خەندان، جەمیل صائیب، ئەحمەد موختار جاف، عەبدولڕەحیم ڕەحیمی هەکاری، میر شەرەف خانی بەدلیسی، وەفایی، گۆران، بەدیع باباجان، جەمال شارباژێڕی، مارف بەرزنجی، نالی، مەحوی، ئەنوەر قەرەداخی، حەمەی مەلا کەریم، سەید عەلی ئەسغەری کوردستانی، ئیبراهیم یونسی، قەرەنی جەمیل، مەلای گەورە، تۆفیق وەهبی بەگ.


**سوپاس بۆ بنکەی ژین**

بۆ ئەم ژمارەیەی محەمەد ئەمین زەکی بەگ، بە سوپاسێکی زۆرەوە بنکەی ژین کۆمەڵێك وێنەی دانسقە و بابەت و دێکیۆمێنتی گرنگیان بەڕۆڤار بەخشی، پڕ بەدڵ سوپاسی بنکەی ژین دەکەین و بەهیوای هاوکاریی بەردەوام لەنێوان هەردوو لادا.

رۆڤار



سەرپەرشتیار
ڕەووف بێگەرد

بەڕێوەبەری نووسین
کامەران سوبحان

دەرهێنەری هونەری
ئومێد محەمەد

دیزاینی بەرگ
ئارام عەلی

تایپیست
ئارام مەحمود

هەڵەچنی
سەلام مستەفا

ناونیشان
سلێمانی- شاڕێی سالم
دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم

ژمارەی تەلەفۆن
3120890

Web Site
www.serdem.net

پەیوەندیکردن بەڕۆڤارەوە لەڕێگەی ئیمێڵی
Rovar.rovar@yahoo.com

چاپخانەی
دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم

مۆتیفی ئەم ژمارەیە
نەرمین مستەفا

پێڕست

# سەرووتار

## ئەمین زەکی بەگ

ئەم ژمارەیەی ڕۆڤارمان تایبەتە بە مێژوونووس و ڕۆشنبیرێکی گەورەی نەتەوەکەمان کە (محەمەدئەمین زەکی بەگ)ە، کاتێک ناوی ئەم پیاوە دەبەین، ڕاستەوخۆ یادەوەریمان دەچێتە سەر نووسینەوەی مێژووی نەتەوەی کورد، بەتایبەتیش کتێبە بەناوبانگەکەی (خولاسەی تەئریخی کورد و کوردستان) کە پێمان وایە هیچ مێژوونووسێکی تری کورد تا ئەو کاتە هێندەی ئەمین زەکی خزمەتی بە مێژووی ڕاستەقینەی نەتەوەی کورد نەکردووە، بۆیە شایەنیەتی ڕۆڤارێکی شایستە بە توانا و بەرهەم و شاکارەکانی بۆ دەربکەین.

*لەم ڕۆڤارەدا، جیا لە ژمارەکانی پێشوومان , کۆمەڵێک نووسەر و مامۆستای زانکۆ و پسپۆڕی مێژوویی و هونەرمەند، بەشدارییان کردووە و هەریەکەیان لەسەر لایەن و ڕەهەندێکی جیاوازی ئەو قسەیان کردووە، چونکە ئەو تەنها مێژوونووس نەبووە، بەڵکو سیاسییەکی دیار و پەلەمانتار و وێنەکێش و فۆتۆگرافەریش بووە، کۆبوونەوەی ئەم هەموو بەهرەو توانایە لەکەسێکی وادا شایەنی ئەوەیە لەسەرجەم ئەو بوارانەدا خوێندنەوە و بەدواداچوونی بۆ بکرێت.

*لایەنێکی درەوشاوە و فەرامۆشکراوی ئەمین زەکی بەگ، توانا و سەلیقەی هونەریی ئەو بووە، لە بواری فۆتۆگرافی و وێنەکێشاندا، بەتایبەتیش بۆ کەسێک بەرپرسی دەوڵەت و کاری سیاسیی بکات و لەولاشەوە سەرقاڵی کاری هونەریی بێت، بۆ ئەم مەبەستەش (ڕۆڤار) هەردوو هونەرمەند و مامۆستای کۆلیژی هونەری زانکۆی سلێمانی (د.جەزا بەکر و وەهبی ڕەسول)ی سەرپشک کرد بۆ خوێندنەوە و شیکارکردنی ئەو چەند تابلۆیەی ئەمین زەکی بەگ کە لەدوای خۆی ماوەتەوە، بۆ ئەوەی قسە لەسەر لایەنی تەکنیک و ئاستی هونەریی و شێوازی کارکردنی وێنەکێشانی ئەمین زەکی بەگ بکەن، ڕەنگە پێشتر کەم خوێنەر هەبووبێت ئەوەی زانیبێت کە ئەمین زەکی وێنەکێش و هونەرمەندیش بووە.

*دوا خاڵ لەسەر ئەم ڕۆڤارەی ئەمین زەکی بەگ ئەوەیە، جگە لەو کۆمەڵە وتار و نامە و تابلۆ و کتێب و دێکیۆمێنتانەی کە لەسەر ئەم مێژوونووسە بڵاومان کردووەتەوە، چەند پارچە شیعر و پەخشانێکی هەریەک لە (فایەق بێکەس، بێخود، پیرەمێرد، عەبدولڕەحمان بەگی بابان، تۆفیق وەهبی، شێخ محەمەدی خاڵ، شاکر فەتاح) بڵاودەکەینەوە، کە لە یادی چلەی ئەمین زەکی بەگدا لەسلێمانی خوێندوویانەتەوە، ئەو چلەیەش لەسەر ئەرکی مامۆستا عەلائەدین سوجادی سازکراوە و دواتریش ئەو بەرهەمانەی لەچوارچێوەی نامیلکەیەکی بچووکدا بەچاپ گەیاندووە.

ڕۆڤار

# محەمەدئەمین زەکی کێیە؟

سدیق ساڵح

«حاجی عەبدولڕەحمانی مەحموودی سادق باپیر»ی دانیشتووی گەڕەکی (گۆیژە)ی شاری سلێمانی، کە وڵاخدار بووە و کاروانی وڵاخی گواستنەوەی کەلوپەلی بازرگانیی نێوان سلێمانی و شارەکانی دیکەی ئەم ناوچەیە و دەرەوەی هەبووە، دوو ژنی هێناوە، لە یەکەم- محەمەدئەمین و محەمەدڕەشید «کاکەڕەش»، لە دووەم «حەبیبەی حاجی محەمەدعەبدوڵڵای داراغا»- محەمەدعەلی و محەمەدساڵح و ئیبراهیم و ڕەعنا و بەهێی هەبوون. لەوانە، هەر «عەباس»ی کوڕی کاکەڕەش کە چووەتە تورکیا، نەگەڕاوەتەوە و لێی ماوەتەوە،

بەڵام محەمەدی کاکەڕەش و بەرەی دووەم خێزانی حاجی عەبدولڕەحمان لە کوردستان ماونەتەوە. لەناو هەموو منداڵەکانی ئەو پیاوەدا، تەنیا محەمەدئەمین هەڵکەوتووە و وەکوو کەسێکی هەڵاواردەی ناوبەدەرەوە ناسراوە و مێژوویەکی بۆ خۆی و بنەماڵە و نەتەوەکەی تۆمار کردووە.

محەمەدئەمین زەکی ساڵی ١٢٩٥ی ڕۆمی (١٨٧٩) لە دایك بووە. منداڵ بووە کە دایکی مردووە و تووشی گرانەتا هاتووە، ناچار لە زستاندا خراوەتە ناو بەفر تا «تا»یەکەی بهێنرێتە خوارێ. ئەمە دواتر دووچاری نەخۆشیی ڕۆماتیزمی کردووە. پاشان نراوەتە بەر

خوێندن لە حوجرەی مەلا عەزیز، فێری فارسی و نووسین بووە. لە ١٨٩٢دا خراوەتە مەکتەبی مولکیی تاقە قوتابخانەی ئەوکاتەی شار. ١٨٩٣ براوەتە پۆلی دووەمی مەکتەبی ڕوشدییەی عەسکەری، کە هەر ئەو ساڵە بە هیممەتی «سەعید پاشای خەندان»ی ڕۆڵەیەکی سلێمانی کراوەتەوە، بە یەکەم دەرچووە. هەردوو ساڵی سێیەم و چوارەمیش یەکەم بووە. ١٨٩٦/١/٢٤ بڕوانامەی تەواوکردنی قوتابخانەکەی وەرگرتووە. هەر لە پۆلی سێیەمیشەوە بەهرەی وێنەکێشیی لێ دیاری داوە.

باوکی، مەبەستی بووە هەمان ڕێچکەی کاری ئەو بگرێ و حەزی نەکردووە درێژە بە خوێندن بدات، بەڵام محەمەدئەمین ملی نەداوە و بە زویری لەگەڵ هاوڕێکانیدا بە ڕێی (کفری)دا ڕووی کردووەتە بەغدا بۆ خوێندن لە قوتابخانەی ئەعدادیی عەسکەریی ئەوێ. ئیدی لەوکاتەوە تا خوێندنی تەواو کردووە، «کاکەڕەش»ی براگەورەی —بەتایبەتی- ژێربەژێر بەبێ ئاگاداریی باوکی پارەی بۆ ناردووە و خەرجیی خوێندنی کێشاوە. خۆی ددانی پێداناوە کە ئەگەر «کەکەڕەش»ی برای نەبوایە، لە دواڕۆژدا دەبووە، یا بەقاڵ، یا کەسێکی دەستەپاچەی کاروباری ژیان پێ بەڕێوە نەچوو! یەکەم ساڵی ئەم قۆناغەی بە پلەی یەکەم بڕیوە. «مەعرووف ئەفەندی»ی مامۆستای مێژوو پەیی بە بەهرەداریی بردووە، لەبەر ئەوە چاودێریی کردووە و پشتی گرتووە. دووەم ساڵیش دووەم بووە. لەم ساڵەیشەوە زۆربەی کاتی خۆیی بۆ وێنەکێشان تەرخان کردووە، «ڕەئووف ئەفەندی»ی مامۆستای وێنە و «فایەق ئەفەندی»ی بەڕێوەبەریش هاندەری بوون. ئەو ماوەیە چەند تابلۆیەکی نەخشاندووە و پێشکەشی کردووە؛ تابلۆی مزگەوتی شێخ عەبدولقادری گەیلانیی بە قول¬ئاغاسیی دەریایی و یەکێکی دیی -ئەو بەرە کە لە قشڵەی عەسکەری و شەقامەوە بەسەر ڕووباری دیجلەدا دەڕوانێ- بە مامۆستای وێنە و هیی (کازمییە) بە موشیر پاشا و بەڕێوەبەر بەگ. تابلۆیەکی (کازمییە)یشی پاشتر لەگەڵ خۆدا بردووە بۆ ئەستەمووڵ، پێشکەشی وەزارەتی جەنگی کردووە. هەر ئەو ماوەیە چووەتە چاپخانە لە (عەباخانە) بۆ یارمەتیی مامۆستای وێنە، پێکەوە هێڵکێشی خشتە و وێنەی دیکەیان کردووە. پاش ئەو دوو ساڵەی بەغدا، لەگەڵ هاوپۆلەکانیدا بە ئەبووغرێب، عانە، دێرزوور، ڕققە، حەڵەبدا چوونەتە ئەسکەندەروونە و لەوێوە بە پاپۆڕ بۆ مەرسین، ڕۆدس، قەڵای سوڵتانییە، ئەمجا ئەستەمووڵ بۆ (مەکتەبی حەربییە). لەبەر ئەوەی تابلۆیەکی پێشکەشی وەزارەتی جەنگ کردووە، ڕێی دراوە بچێتە (ڕەسمخانە). لە پۆلی یەکەمدا حەڤدەیەم بووە. هاوڕێیەتیی لەگەڵ ماجد بەگی عوسمان پاشای سلێمان پاشای قەوواسی قوماندانی پێشووی جەندرمەی بەغدادا پەیدا کردووە. لەوێ، باری داراییی خراپ بووە. لە پۆلی دووەمدا «٣٥»ەم و لە سێیەمدا —پۆلی کۆتایی- (ساڵی ١٨٩٩) «١٥»یەم بووە. «٢٦»ەم پلەی نێو ئەو ٣٤ قوتابییە بووە کە لە قوتابخانەی ئەرکان وەر گیراون. لە پۆلی یەکەمی ئەرکان پێنجەم، لە پۆلی دووەم «٢٢»ەم و لە پۆلی سێیەم (ساڵی ١٩٠٢) «٢٤»ەم بووە. ئەمجا بە پلەی نەقیبی مومتاز چووەتە لەشکری شەشەم لە بەغدا. ١٩٠٣ براوەتە (ئیدارەی ئەملاکی سنیە) وەك ئەندازیار، تا ڕاگەیاندنی مەشرووتە لە ١٩٠٨دا لێی ماوەتەوە. دواتر براوەتە لەشکری دووەم لە (ئەدرنە). لەوێڕا چووەتە ئەستەمووڵ، کراوە بە ئەندامی لیژنەی نەخشەسازی کە «میرلیوا شەوقی پاشا» فەرماندەی بووە، بەشداری سازکردنی نەخشەی ئەستەمووڵ و دەوروبەری بووە. ١٩٠٧ وەك ئەفسەرێکی تۆپۆگرافی بووە بە ئەندامی لیژنەی دیاریکردنی سنووری نێوان تورکیا- ڕووسیا لە ناوچەی قەفقاس. ١٩١٢ کە شەڕی باڵکان هەڵایساوە، بە داوای خۆی براوەتە لەشکری پێنجەم لە بەرەی (جەتاڵجە)، بووە بە دووەم ئەرکان¬حەرب.

١٩١٣ لەگەڵ وەفدێکی عەسکەریدا نێردراوەتە شاری (کلێرمۆن) لە فەڕەنسە بۆ مەشقی عەسکەری، ساڵێك ماوەتەوە. کە گەڕاوەتەوە، خراوەتە بەشی تەکنیکیی پێویستیی گشتی. پاش مانگێك براوەتە بەشی یەکەمی ئەرکان. ١٩١٤ بۆ دووەم جار کراوە بە ئەندامی لیژنەی دیاریکردنی سنووری ڕووسیا. لەگەڵ لیژنەکەدا چووەتە تفلیس، بەڵام کە یەکەم جەنگی جیهانی بەرپا بووە، دوادواییەکانی ١٩١٤ لە تفلیسەوە کەوتووەتە ڕێ و دیسەمبەری ئەو ساڵە گەیشتووەتەوە ئەستەمووڵ.

هێندەی نەخایاندووە کراوە بە ئەرکان¬حەرب لە قول¬ ئۆردووی یەکەم. پاش ماوەیەك بە داوای مارشاڵ فۆندەر غۆڵتس پاشا تا سێ مانگ بەشداریی خولێکی فڕۆکەوانیی کردووە. سێپتەمبەری ١٩١٥ بووە بە موقەددەم، نێردراوە بۆ ئەرکان¬ حەربی لەشکر لە عێراق. لە نۆڤەمبەردا گەیشتووەتە جێ لە (سەلمان پاك). ٨ی نۆڤەمبەری ١٩١٥ بە فەرمانی سەرۆکی ئەرکانی گشتی چووە بۆ ڕیزی ئەرکان و وەزیفەی

بەڕێوەبەری جموجوولی پێ دراوە لە سەلمان پاك و شێخ سەعد و كووت. ئەپریلی ١٩١٦ ڕاسپێردراوە بۆ وەرگرتنی چەكەكانی «جەنەڕاڵ تاوسەند»، كە لە كووت خۆی بەدەستەوە داوە، لە ٢٩ی مانگدا لە بری سوپای تورك وەری گرتوون.
كە لەشكری شەشەم لە عێراق بە فەرماندەیی خەلیل پاشا پێك هاتووە، كراوە بە بەڕێوەبەری بەشی هەوالگری. كە بەغدا لە مارسی ١٩١٧دا لەلایەن سوپای ئینگلیزەوە داگیر كراوە، لەگەڵ لەشكرەكەدا گەڕاوەتەوە بۆ مووسڵ. زۆری پێ نەچووە ڕووی كردووەتە ئەستەمووڵ. ١٩١٧/٧/١ بە داوای «مستەفا كەمال پاشا»ی فەرماندەی لەشكری حەوتەم، بووە بە یاریدەدەری سەرۆكی ئەركانی ئەو لەشكرە لە ئەستەمووڵ، لەگەڵیشیدا چووە بۆ حەڵەب. كە مستەفا كەمال لە فەرماندەیی لەشكر لابراوە و فەوزی پاشای چەقماق جێی گرتووەتەوە، لەتەك ئەو لەشكرەدا چووە بۆ فەلەستین. ٨ی ئۆكتۆبەری ١٩١٧ ئامادەی بەرەی شەڕی خەلیل ڕەحمان، قودس و نابلوس بووە، تا ١٩١٨/٩/١٥ لەو ناوە ماوەتەوە. نێردراوە بۆ لەشكری سێیەم و ١٠/٢٠ پێوەندیی پێوە كردووە.
كۆتاییی ئەو ساڵە براوەتە بەشی مێژووی جەنگ، تا ناوەڕاستی ١٩٢٤ لەوێ بووە. ئەو ماوەیە بەشداری كۆبوونەوەی دامەزراندنی (جەمعییەتی تەعالیی كوردستان) بووە لە ئەستەمووڵ، بە ئەندامی یەكەم دەستەی بەڕێوەبردنی هەڵبژێردراوە. هاوزەمان چەندین مەدالیا و نیشانی ڕێزلێنانی وەرگرتووە: نیشانی جەنگ- ١٩١٦، نیشانی زیوی لیوەشاوەیی- ١٩١٦و نیشانی جەنگی نەمسایی- ئۆكتۆبەری ١٩١٧.
١٩٢٤/٧/٢٤ گەڕاوەتەوە بۆ عێراق. دوای چەند ڕۆژێك بووە بە مامۆستای مەدرەسەی عەسكەری. بە تاقیكردنەوە خراوەتە ناو سوپای عێراق و بووە بە فەرماندەی فەوجی شەشەم. كۆتایی ١٩٢٤ كراوە بە فەرماندەی مەدرەسەی عەسكەری و خانەی مەشق ¬پێ كردن (دار التدريب). جووڵای ١٩٢٥ لە سوپا هاتووەتە دەرێ، بووە بە نائیبی لیوای سلێمانی لە یەكەم خولی ئەنجومەنی نوێنەرانی عێراق¬دا (١٩٢٥/٥/١٦-١٩٢٨/١/٢٨)و بە دووەم جێگری سەرۆك هەڵبژێردراوە. ئۆگەستی ئەو ساڵە كراوەتەوە بە عەقید لە سوپادا. ١٩٢٥/١١/٢٤ بووە بە وەزیری ئەشغاڵ و گەیاندن لە دووەم وەزارەتی عەبدولموحسین سەعدوون (١٩٢٥/٦/٢٦-١٩٢٦/١١/٢١)و پاشتر لە دووەم وەزارەتی جەعفەر عەسكەری¬ (١٩٢٦/١١/٢١-١٩٢٨/١/١٤)دا.
١٩٢٧/٨/٦ بووە بە وەزیری مەعاریف تا ١٩٢٨/١/٨ كە وەزارەتی تێدا هەڵوەشاوەتەوە. پاش چوار مانگ دیسان بووەتەوە بە نائیبی سلێمانی لە دووەم خولی ئەو ئەنجومەنەدا (١٩٢٨/٩/٢٨-١٩٣٠/٧/١)، بە یەكەم جێگری سەرۆكی ئەنجومەن هەڵبژێردراوە. ١٩٢٩/٤/٢٨ كراوە بە وەزیری جەنگ لە یەكەم وەزارەتی تۆفیق سویدی (٤/٢٨-١٩٢٩/٩/١٩)دا. لە چوارەم حكوومەتی عەبدولموحسین سەعدوون¬ (٩/١٩-١٩٢٩/١١/١٣)دا بووە بە وەزیری ئەشغاڵو گەیاندن. كە ١٩٢٩/١١/١٤ عەبدولموحسین خۆی كوشتووە، وەزارەت هەڵوەشاوەتەوە، ئەمیش لێی هاتووەتە دەرێ. پاش چوار ڕۆژ بۆ جاری چوارەم كراوەتەوە بە وەزیری هەمان وەزارەت لە كابینەی ناجی سویدی (١٩٢٩/١١/١٨-١٩٣٠/٣/١١)دا. كە نووری سەعید بۆ دووەم جار وەزارەتی پێك هێنایەوە (١٩٣١/١٠/١٩-١٩٣٢/١١/٣)، لە هەمان جێ بووەتەوە بە وەزیر، بە وەكالەت وەزارەتی بەرگریشی لە ١-١٩٣١/١١/٣٠ خراوەتە ئەستۆ.
١٩٣٣/٣/٢٥ بووە بە بەڕێوەبەری گشتیی وەزارەتی ئابووری و گەیاندن. ٩/١٢ی هەمان ساڵ كراوەتە بەڕێوەبەری گشتیی ئاودێری. ١٩٣٤/٩/٨ كراوەتەوە بە بەڕێوەبەری گشتیی وەزارەتی ئابووری و گەیاندن. لە سێیەم كابینەی جەمیل مەدفەعی¬دا (٣/٤-١٩٣٥/٣/١٧) بووەتەوە بە وەزیری ئابووری و گەیاندن. ٣/١٧ی هەمان ساڵ بە هۆی هەڵوەشانەوەی وەزارەتەوە، كشاوەتەوە. لە دووەم وەزارەتی یاسین هاشمی¬دا (١٩٣٥/٣/١٧-١٩٣٦/١١/٢٩) بۆ هەشتەم جار كراوەتەوە بە وەزیری ئابووری و گەیاندن.
كودەتای عەسكەریی ١٩٣٦/١١/٢٩ی بەكر سدقی بووە بە مایەی تێكچوونی وەزارەت، لە وەزارەت هاتووەتە دەرێ. بووەتەوە بە نائیبی سلێمانی لە هەشتەم خولی ئەنجومەنی نوێنەراندا (١٩٣٧/١٢/٢٣-١٩٣٩/٢/٢٢)و بە دووەم جێگری سەرۆك هەڵبژێردراوە. لە نۆیەم خول (١٩٣٩/٦/١٢-١٩٤٣/٦/٩) و دەیەم خول (١٩٤٣/١٠/٩-١٩٤٦/٥/٣١)دا بووەتەوە بە نائیبی سلێمانی. ئەو ماوەیە لە پێنجەم وەزارەتی نووری سەعیددا (٢/٢٢-١٩٣٠/٣/٣١) كراوەتەوە بە وەزیری ئەشغاڵو گەیاندن. لە سێیەم وەزارەتی ڕەشید عالی گەیلانی¬دا (١٩٤٠/٣/٣١-١٩٤١/١/٣٠) كراوە بە وەزیری ئابووری. لە شەشەم وەزارەتی نووری سەعیددا (١٩٤١/١٠/٩-١٩٤٢/١٠/٤) بۆ جاری دەیەم كراوەتەوە بە وەزیری ئەشغاڵ و گەیاندن.
لەبەر ئەوەی ڕۆماتیزم زۆری بۆ هێناوە و كەوتووەتە

چارەسەری خۆی، پاش سێ مانگ و لە ١٩٤٢/٢/١٠دا دەستی کێشاوەتەوە. ئۆکتۆبەری ١٩٤٣ بە نائیبی سلێمانی هەڵبژێردراوە. لێرەوە و لە ١٩٤٣/١٢/٢٥ بەدواوە تا کۆچی دوایی لە ١٩٤٨/٧/١٠دا وەك ئەندام (عەین) لە ئەنجومەنی پیراندا ماوەتەوە.
محەمەدئەمین زەکی، ساڵانە لە حوزەیران بەدواوە چووەتە شەقڵاوە و هەوارگەی سەڵاحەدین. ساڵی ١٩٤٨ سەرۆکی لیژنەی یارمەتیدانی لیقەوماوانی پێنجوێن بووە، هاتووەتە سلێمانی. پاش یەك دوو ڕۆژ کۆچی دوایی کردووە و لە گردی سەیوان نێژراوە.
محەمەد ئەمین زەکی، زمانەکانی عەرەبی، فارسی، تورکی، ئینگلیزی، فەڕەنسی، ئەڵمانی و ڕووسیی زانیون. هەر لە منداڵییەوە خولیای مێژوو و ئەدەبیاتی هەبووە. یەکەم جار شیعرێکی لاوانەوەی بۆ سەیید تەهای بەرزنجی نووسیوە. لە ڕوشدییەی عەسکەری شیعرێکی دیکەی وتووە. سێیەم شیعری ساڵی ١٨٩٧ لە ئەعدادیی عەسکەریی بەغدا نووسیوە.
کە پیرەمێردی شاعیریش لە دوورگەی هەگبەلی «نەژاد»ی کوڕیی بووە، چامەیەکی بۆ نووسیوە. بەڵام درێژەی بە شیعرنووسین نەداوە، چونکە پیرەمێرد قەناعەتی پێ هێناوە واز لە شیعر بهێنێ. پاش تەواوکردنی مەدرەسەی ئەرکان، کەوتووەتە خولیای بابەتی مێژوویی و عەسکەری، وەزیفەی نووسەری عەسکەریی لە ڕۆژنامەی تورکیی «وەقت»یشدا دیوە.
بەرهەمە تورکییەکانی:
١. عثمانلی اردوسی، بغداد، ١٣٢٤ه.
٢. عثمانلی اسفاری حقندە تدقیقات، استانبول، ١٣٣٦هـ.
٣. عراق نصل غائب ایتدك، استانبول، ١٣٣٦ه.
٤. عراق سفری خگالرمزی، استانبول، ١٣٣٦.
٥. حرب عمومیدە عثمانلی جبهەلری وقایعی، استانبول، ١٣٣٧هـ.
٦. سلمان پاك میدان محاربەسی و ژیلی، استانبول، ١٣٣٩هـ.
٧. بغداد وصوك حادثە چیاعی، استانبول، ١٣٣٩ه.
٨. عراق تاریخ حرب مختصری، استانبول، ١٣٣٩ه.
٩. کوت الامارە هجوم و محاصرەسی، [دوو بەرگی دەستنووسە، لە ئەرشیفی عەسکەریی بریتانیا پارێزراوە].
١٠. حیات خاگراتی [سێ دەفتەری دەستنووسە، یەکەمیان کراوە بە عەرەبی].
بەرهەمە کوردییەکانی:
١. موحاسەبەی نیابەت، بەغداد، ١٩٢٨.
٢. خوڵاصەیەکی تاریخی کوردوکوردستان لە قەدیمەوە تا ئیمڕۆ، جلد ١، بەغداد، ١٩٣١.
٣. خوڵاصەیەکی تاریخی کوردوکوردستان لە قەدیمەوە تا ئیمڕۆ، جلد ٢١، بەغداد، ١٩٣٧ [ئەم دوو بەرگی کتێبە محەمەدعەلی عەونی کردوویە بە عەرەبی و ساڵانی ١٩٣٩و ١٩٤٨ لە قاهیرە لە چاپی داون].
٤. دوو تەقەلای بێ سوود، بەغداد، ١٩٣٥ [ڕێی بڵاوبوونەوەی نەدراو لە چاپخانەدا دەستی بەسەردا گیرا. بەرێز سەباح غالب ئەو ساڵانەی پێشوو لەناو پاشماوەی کەرەستەکانی «ئەدمۆندز»دا دۆزییەوە و ساڵی ١٩٨٤ بە لێکۆڵینەوەیەکەوە لە چاپی دا].
٥. مشاهیر الکرد وکردستان، [بە کوردی بە ناوی (کوردی بەناوبانگ)ەوە نووسیویە، سانیحەی کچی کردوویە بە عەرەبی؛ یەکەم بەرگی ١٩٤٥ لە بەغدا، دووەم بەرگی بە دەستکاریی محەمەد عەلی عەونی یەوە ١٩٤٧ لە قاهیرە لە چاپ دراوە].
٦. تاریخی سلێمانی وە وڵاتی، بغداد، ١٩٣٩. [محەمەد جەمیل بەندی ڕۆژبەیانی کردوویە بە عەرەبی، چاپی یەکەمی- بەغدا، ١٩٥١، چاپی دووەمی- سلێمانی، ٢٠٠٢].
بەرهەمی عەرەبی:
- تقریر محمد أمین زکی نائب السلیمانیه بشأن الجیش العراقی، مطبعه الحکومە، بغداد، ١٩٢٩، ٣٤ص.
محەمەدئەمین زەکی، بە قسەی میر بەصری، ئەم بەرهەمانەیشی هەبووە: دەستنووسێکی بیرەوەریەکانی سێر دۆگلاس هێگ، ڕاپۆرتی گرنگی سەبارەت بە ئاودێری و توتن هەبووە. هەر بە هیمەتی ئەو دائیرەی (ئینحیساری توتن) دامەزرێنراوە.
جێی باسە، (بنکەی ژین) هەموو وتار و نووسین و کتێبەکانی بە چوار بەرگ لە چاپ داوەتەوە. چی لە بارەی محەمەدئەمین زەکیشەوە نووسراوە، لە بەرگێکدا کۆی کردووەتەوە و لە چاپی داوە.
محەمەد ئەمین زەکی، پیاوێکی هێمن، سەنگین، لەخۆبوردوو، پشوودرێژ، نەرم و نیان و بەهرەمەند بوو. وەك شیعری نووسیوە و شیعری شاعیرانی گەورەی کورد و فارسی خوێندووەتەوە، دەستی وێنەکێشانی هەبووە. ئێستا هەر دوو تابلۆی هونەریی لە بەردەستدا ماوە، کە هیچ دوور نییە بە یەکەمین بەرهەمەکانی هونەری شێوەکاریی کوردی و عێراقیش دابنرێ.

## چەند سەرنجێکی ڕەخنەگرانەی مێژوویی سەبارەت بە نووسینەکانی

# محەمەدئەمین زەکی بەگ

## لە بارەی مێژووی کورد و کوردستانەوە لە سەردەمی ئیسلامیدا

د. حوسامەددین نەقشبەندی*

کوردستان
جلد ١-٢-٣
محمدامین زکی
نوسیوەتی
لە چاپخانەی دار السلامی بغدادا لە چاپ دراوە
١٣٥٠ هجری، ١٩٣١ میلادی
انتشارات سیدیان-مهاباد

محەمەدئەمین کوڕی حاجی عەبدولڕەحمان کوڕی مەحموود کوڕی سادق باپیر، لە بنەماڵەیەکی ناسراوی سلێمانییە، ساڵی ١٨٧٩ لە دایکبووە. ناوی «محەمەدئەمین» ئاوێتەیە، لە «محەمەد» و «ئەمین» پێك هاتووە، وەك نەریتی باوی ئیسلام. ناسناوی «زەکی»، هەر لە منداڵییەوە لەبەر زیرەکی و دەرکەوتنی لەناو هاوەڵەکانیدا، وەك د. کەمال مەزهەر ئەحمەد بۆی چووە، خراوەتە پاڵ ناوەکەی، تا وای لێ هاتووە بە «محەمەدئەمین زەکی» ناو دەربکات.

**نووسینەکانی محەمەدئەمین زەکی لە بواری مێژوودا کە مەبەستمانە، ئەمانەن:**

١- خولاصەیەکی تاریخی کورد و کوردستان لە مەبدەئی تاریخەوە تا ئیمڕۆ: بە دوو جڵدە و بە زمانی کوردی، ساڵی (١٩٣١ز) لە چاپخانەی (دارالسلام)ی بەغدا چاپ کراوە. جڵدی یەکەم بریتییە لە (٣٩٨) لاپەڕە، جڵدی دووەم (٤٣١) لاپەڕەیە. محەمەد عەلی عەونی (١٨٩٧-١٩٥٢ز) هەردوو جڵدەکەی کردووە بە عەرەبی: جڵدی یەکەمیان ساڵی ١٩٣٩ بە ناونیشانی (خلاصه تأریخ الکرد وکردستان من أقدم العصور التاریخیه حتی الآن)ەوە لە میسر لە چاپ داوە. وەرگێڕ، بەو زانیارییە زۆرە کە خستوویەتیە سەری و بە دانانی پێڕستێکی فراوانیش بۆ ناودارانی مێژوویی، بەهای کتێبەکەی لە ڕووی زانستییەوە زیاد کردووە. ساڵی ١٩٦١ چاپی دووەمی جڵدی یەکەمی (خولاصە) کرایەوە لە بەغدا و ژیاننامەی دانەریشی لێ زیاد کرا. هەروەها ١٩٨٢ لە (لەندەن) و ١٩٨٥ لە (بەیرووت) و (٢٠٠٦) (بنکەی ژین) لە سلێمانی چاپێکی تری هەردوو بەرگەکەی لە یەك جڵددا بە ئامادەکردنی ڕەفیق ساڵح بڵاوکردەوە؛ ئەمەی دوایی، جڵدی یەکەمیان (٢٩١) لاپەڕەیە، پێشەکییەکی د. کەمال مەزهەر ئەحمەد و ڕاستکردنەوەی چەند هەڵەیەکی مێژوویی بە قەڵەمی محەمەد جەمیل ڕۆژبەیانی بۆ زیاد کراوە.

جڵدی دووەمی (خولاصە)، محەمەد عەلی عەونی بە ناونیشانی (تأریخ الدول والامارات الکردیه في العهد الاسلامی)یەوە وەریگێڕاوە بۆ زمانی عەرەبی و ساڵی ١٩٤٥ بە (٤٤٠) لاپەڕە لە میسر بڵاوی کردووەتەوە. ساڵی ١٩٤٨ هەر لە میسر و ١٩٨٦ لە لەندەن لە چاپ درایەوە. ئەم بەرگە، ڕەفیق ساڵح لە چاپەکەی (بنکەی ژین)دا بە (٣٠٤) لاپەڕە ئامادەی کردووە و نووسینێکی دکتۆر کەمال فوئادیشی لە بارەوە لە عەرەبییەوە بۆ کردووە بە کوردی و خستوویەتیە سەری.

بەڵام بەداخەوە چاپی (خوڵاصەی تاریخی کورد و کوردستان)ـەکەی (دەزگای سەردەم) بۆ جاری سێیەم و لە یەك بەرگدا، دەستکاریی ئیملاکەی کراوە. ئەمەیش هەڵەیەکی زۆر گەورەیە و ئەمانەتی زانستیی تێدا پێڕەو نەکراوە، لە کاتێکدا دەبوو هەر بە شێوازی کوردییەکەی محەمەدئەمین زەکی خۆی بڵاو بکرێتەوە و بە هیچ جۆرێك دەستکاری نەکرێ.

٢- تاریخی سلێمانی وە وڵاتی: ١٩٣١ لە بەغدا بە (٢٩٤) لاپەڕە بڵاو کراوەتەوە. جەمیل بەندی ڕۆژبەیانی ساڵی ١٩٥١ وەرگێڕانە عەرەبیەکەی بە ناونیشانی (تاریخ السليمانية وأنحائها) وە بە (٣١٦) لاپەڕە و پێڕست و سەرنجەوە لە چاپ داوە. وەزارەتی ڕۆشنبیریی حکوومەتی هەرێمی کوردستان/ سلێمانی ساڵی ٢٠٠٢، وەرگێڕانە عەرەبیەکەی بە هێندێ دەستکاریی سەرنجەکانی مەلا جەمیل خۆیەوە، بڵاوکردووەتەوە. ڕەفیق ساڵح جارێکی تر دەقە کوردیەکەی ئامادە کردووەتەوە و (بنکەی ژین) لە ٢٠٠٥دا بە (٢٦٥) لاپەڕە لە چاپی داوەتەوە. (دار الزمان) لە دیمەشق ساڵی ٢٠٠٦ دەقە عەرەبیەکەی بڵاو کردووەتەوە.

٣- مشاهیر الکرد وکردستان: بریتییە لە کۆکراوەی چەند بابەتێکی بڵاوکراوە و بڵاونەکراوەی محەمەدئەمین زەکی بە ناونیشانی (کوردی بەناوبانگ)ـەوە، ساڵانی (١٩٣٩-١٩٤٩) بەشی زۆریان لە گۆڤاری "گەلاوێژ"دا لە بەغدا بڵاو بووەتەوە. خاتوو "سانیحە"ی کچی کۆی کردووەتەوە و کردوویە بە عەرەبی. ساڵی (١٩٤٥) چاپی یەکەمی بە ناونیشانی (مشاهیر الکرد وکردستان فی العهد الاسلامی) یەوە لە بەغدا بە چاپی گەیاندووە. چاپی دووەمی ساڵی ١٩٤٧، بە پێداچوونەوە و لێزیادکردنی محەمەد عەلی عەونییەوە، لە بەغدا بڵاو بووەتەوە. چاپی نوێی ڕەفیق ساڵح ئامادەی کردووە و (بنکەی ژین) ساڵی ٢٠٠٥ بە (٤٩٥) لاپەڕە بڵاوی کردووەتەوە، سەرباری ئەوە کە وتەی محەمەدئەمین زەکی و پێشەکیی بە قەڵەمی محەمەد عەلی عەونی و ژیاننامەی محەمەدئەمین زەکی و پێڕستی ناودارانی بۆ کتێبەکە زیاد کردووە.

تێڕوانینی

**محەمەدئەمین زەکی بۆ مێژوو:**

محەمەدئەمین زەکی تێڕوانینێکی زانستییانەی بۆ مێژوو هەیە؛ پێی وایە نابێ خۆمان ببەستینەوە بە ڕابردووەوە و بۆ ڕابردوو بژین، پێویستە مێژوو بەکار بێنین بۆ خزمەتی ئەمڕۆ و داهاتوومان. لەم بارەیەوە دەڵێت: ((هەر میللەتێك ئایندەی خۆی خستە پشت گوێ و ڕابردووی فەرامۆش کرد، ئەوە مانای وایە بەرەو نەمان دەڕوات. هەر گەلێك ڕۆڵێکی لە ژیاندا هەبێت، پێویستە ئاشنای ڕابردووی خۆی بێ و داهاتوویشی لەبەر ڕۆشنایی ئەو ڕابردووەدا چاك بکات، بۆ ئەوەی داهاتوویەکی وا مسۆگەر بکات بیگەیەنێ بە ڕیزی گەلانی بەرز و پێشکەوتوو. لاوازی و لەناوچوون بۆ ئەو گەلانەیە کە تەنها بۆ ڕابردوو و بە ڕابردوویان دەژین، پاڵەوانانی ڕابردوویان بە نەمریی دەهێڵنەوە و کارەکانیان دەژمێرن، بەڵام بۆ خۆیان لەوپەڕی ئاستی خراپ و لەژێر باری هەژاری و چەوساوەییدا دەژین)) .

محەمەدئەمین زەکی لەسەر قسەکانی خۆی دەڕوا و دەڵێت: ((مەبەستم لەو قسانەی سەرەوە ئەوە نییە بەهای ڕابردوو و مێژوو کەم بکەمەوە، بە پێچەوانەوە ڕێز و شکۆمەندیی زۆر لە مێژوو دەنێم، چونکە مەزنترین ڕووداویان بۆ ئێمە تۆمار کردووە. ئێمە سوود لە بیروباوەڕ و کردەوەکانیان وەرناگرین، ئەگەر لەگەڵ ژیانی سەردەم و ئێستادا نەگونجێن، ئەمەش بە مەبەستی چاککردنی ئێستا و خۆئامادەکردن بۆ داهاتوو بە باشترین شێوە)) .

دەربارەی سوودی مێژوو، دەڵێت: ((بە راستی تاریخ ئاوێنەیەکی عبرتە و انسان و اقوام ئەبێ دائما استفادەی لی بکەن و لە سببی سەرنەگرتنی بەعضـی ئیش و قیام باش ورد ببنەوە و توشی عینی نتیجە و فلاکت نەبن)) .

محەمەدئەمین زەکی مەرجی داناوە بۆ تۆمارکردنی مێژووی ڕاستەقینە و دەڵێت: ((زۆر تکایان لێ ئەکەم [مەبەستی لاوانە] کە وەکو بعضـی محررینی دوینی و ئەمرو، لە تاریخ نوسیندا تابعی حس و خیال نەبن، لە خوینانەوە هیچ هەلنەبەستن و حادثاتی تاریخیە نەگورن بو ئەو بحثانەی کە ئەینوسن، وثیقەیەکی معتبرو معروف نیشان بدەن، ئەگەر وا نەکەن رنجیان بە ضایع ئەچی و نوسینەکەیان قیمەتیکی علمی نابی، لەلایەکی تریشەوە، خویان و قومەکەشیان ترو ئەکەن. من بە گویرەی تدقیقات و تتبعاتی خوم، بە تواوی تیگەیشتوم کە قومی کورد و تاریخەکەی هیچ محتاجی ئەم نوعە شتانە نیە، مفاخری تاریخی زورە، ئەبی بوی بگەرپین و بیدوزینەوە، وضیفەی پیگەیشتوانی کورد ئەمەیە)) .

**هەڵەکانی محەمەدئەمین زەکی لە بواری مێژووی سەردەمی ئیسلامیدا:**

پێش ئەوەی بچینە ناو بابەتەکە، دەمانەوێ ئەوە بڵێین: ئەم ڕەخنانەی ئێمە تەنیا لەسەر نووسینەکانی محەمەدئەمین زەکی بەگن لە بواری مێژووی ئیسلام، بە تایبەت لە سەردەمی دەوڵەتی عەباسیدا، کە میرنشینە کوردیەکانی -بەتایبەت لە سەدەی چوارەمی کۆچی- دەیەمی زایندا تێدا دەرکەوتن. ئەمەیش لەگەڵ پسپۆڕیی خۆماندا کە بواری مێژووی کوردە لە سەردەمی ئیسلامیدا دەگونجێ.

هەروەها دەبێ لە پێشەوە ئەوەش بڵێین کە محەمەدئەمین زەکی خۆی دەڵێ: ((من قەط ادعای ئەوە ناکەم کە ئەم کتیبە [مەبەستی کتێبی "خوڵاصە"یە] تاریخیکی تەواوە و بی قصورە، بەلکو عکسی ئەمە ئەلیم، قصوری زورە و نقصانە و تەنیا ئەساسیکە بو لاوان و خویندوارانی کورد، ئەتوانن بە شینەیی اکمالی بکەن)) .

ئا ئەمەیە وتەی مرۆڤێکی زانا کە ددان بە کەم و کورتیی نووسینەکەیدا دەنێ و لە خۆی بایی نەبووە خۆی بە پیاوێکی زانستی پیشان بدات، وەك هەندێك لە مێژوونووسانی کوردی ئەم سەردەمە، یان هەندێ لە مامۆستایانی زانکۆ و هەڵگری پلەی پرۆفیسۆری، کە لایان وایە هەر خۆیان زانان و قەبووڵ ناکەن کەسێکی تر هەبێ و ڕەخنەیان لێ بگرێ و هەڵەکانیان لە بواری مێژوودا دەر بخات.

لێرەدا بە پێویستی دەزانین ئاماژە بەوە بکەین کە هەندێ لە مێژوونووسانی خۆمان ڕەخنەی مێژووییان گرتووە لە بەشێکی نووسینەکانی محەمەدئەمین زەکی، وەك خوالێخۆشبوو مەلا جەمیل ڕۆژبەیانی، دکتۆر کەمال فوئاد و مستەفا شێخ نیعمەتوڵلا و ... هتد. ئێمە لێرەدا ئەو ڕەخنانە دووبارە ناکەینەوە.
دەربارەی بڵاوبوونەوەی ئایینی زەردەشتی لەناو کورددا، محەمەدئەمین زەکی دەڵێ: ((دینی زردەشتی لە ئیران و میدیادا پەیا بووبوو. وە لەدوای ئەمە کە لە طرف یەکی لە حکمدارانی شرقی ایران "گشتاسب"ـەوە قبول کرا، عادتا بوو بە دینیکی رسمی. قومی کوردیش لەپاش بەینیك ئەم دینەیان قبول کرد)) .

ئەم بۆچوونەی محەمەدئەمین زەکی پەسند ناکرێ، چونکە "گشتاسب" خۆی هاوچەرخی زەردەشت بووە و لە سەردەمی ئەودا ئاینی زەردەشتی لە ڕۆژهەڵاتی ئێران پەیدا بوو، هێشتا وا بڵاونەبووبووەوە کە ببێتە دینێکی ڕەسمی لە سەرتاسەری وڵاتی ئێران. گواستنەوە و بڵاوبوونەوەی لە میدیادا پێویستی بە ماوەیەکی درێژ هەبوو. لەبەر ئەوە ئێمە لامان وایە کوردە میدیەکان لە سەردەمی دارای گەورەوە کە ساڵی (٣٣٨)ی پێش زاین هاتووەتە سەرتەخت، زەردەشتی بوون. بەم پێیە، دەتوانین بڵێین ئاینی زەردەشتی سەدەی چوارەمی پێش زاین لە میدیادا بڵاو و

جێگیر بووە، چونکە زەردەشت سەدەی حەوتەمی پێش زاین (٦٠٠-٦٦٠)، واتە نزیکەی سێسەد ساڵ پێش ئەو مێژووە، پەیدا بوو. هەر لە جێگەیەکی تری هەمان کتێبدا "خولاصە"، محەمەدئەمین زەکی ئەم بۆچوونە هەڵەیەی ڕاست کردووەتەوە و دەڵێت: ((ضاهر وایە کە لە زمانی "داریوس"ی گەورەدا عقیدە و ئاینی پیش زردشت بە تواوی لەناو چوە و دینی زردشتی بوە بە دینی رسمی ایران)) .

دەربارەی ئایینی (مانی) و (مەزدەك) و پێڕەویکردنیان لەلایەن کوردەوە، محەمەدئەمین زەکی دەڵێت: ((ضاهر وایە کە مذهبی (مانی) و (مەزدك) تأثیری نەکردوتە کوردستان و خەلکی ئەم ولاتە، تا ضهوری اسلامیت لەسەر دینی زردشتی بون)) .

ئەم بۆچوونەی محەمەدئەمین زەکی، پێچەوانەی ئەوەیە کە "ابن الندیم" و "الشهرستانی" باسیان کردووە. لای "ابن الندیم" وا هاتووە کە ئاینی مەزدەکی لە وڵاتی چیاکان (بلاد الجبال) و شاری (دینەوەر) بڵاو بووەوە. شاری دینەوەر پێش فەتحی ئیسلامی و لە سەدەی چوارەمی کۆچیدا زۆربەی دانیشتوانی کورد بووە.

هەروەها "الشهرستانی" دەڵێت: ((مەزدەکی هەر لە ناوچەی شارەزوور پەیڕەو کراوە و (الكوكیە) یەکێکە لە گرووپەکانی مەزدەکی لە شارەزوور)) .
مامۆستا "تۆفیق وەهبی بەگ" پێی وایە مەزدەکی هەر لە سەدەی شەشەمی زاینییەوە لە نزمایی شارەزوور و ناوچەی ئێستای سلێمانی و کەرکوك و هەولێر هەبووە و "مارسابا" کە خۆی یەکێك بووە لە دانیشتوانی (بیت گلابی) -هەڵەبجەی ئێستا- پێش سەرکەوتنی، مەزدەکی و ناوی "گوشتەرداد" بووە .

سێیەم وەزارەتی ڕەشید عالی گەیلانی ١٩٤٠/٤/١
یاسین هاشمی، ساڵح جەبر، ڕەشید عالی گەیلانی، عومەر نەزمی، نووری سەعید، محەمەد ئەمین زەکی بەگ

دەرکەوتن و پەیدابوونی دیاردەی بردنەوەی کورد بۆ سەر بنەماڵەیەکی بەرزی بەناوبانگ، وەك مەلا جەمیل ڕۆژبەیانی دەڵێ: ((نەخۆشییەکە، لەنێو نەتەوەی کورددا باوە، هەندێ خۆیان بردۆتەوە سەر کەیانییان و هەندێ هەخامنشییان و هەندێ ساسانی و هەندێ پێغەمبەری بێ وەچە و هەندێ سدیقی و هەندێ عومەری و هەندێ عوسمانی و هەندێ عەلەوی و هەندێ ئەمەوی و هەندێ قەحطان و هەندێ عەدنان و هەندێ ڕەبیعە و هەندێ حەیدەری و هەندێ ئەیووبی و هەندێ عەبباسی و ... هتد)).
جگە لەوانەی کە مەلا جەمیل ئاماژەی پێکردوون، منیش هەندێ حوسەینی و هەندێك بەرمەکی دەخەمە پاڵ ئەوانی دیکە.
مەلا جەمیل لەسەر قسەکانی دەڕوا و دەڵێت: ((هیچی ڕاست نییە و هەمووی دەست هەڵبەستە، ئەم نەخۆشییە چەند هۆیەکی هەیە، حەز لە ئازایەتی، حەز لە ناوبانگ، حەز لە دەست بڵاوی، حەز لە دەسەڵات و حەز لە شتی تر)) .

دەربارەی کردنی ناوداران بە کورد، محەمەدئەمین زەکی دەڵێت: ((دەمتوانی زۆر لە ناوداران، بە ڕەچاوکردنی زێدی لە دایکبوونیان، بە کورد دابنێم، توانیومە زۆر کەس لە ناوداران بکەمە کورد، هەر لەبەر ئەوەی لە ناوچە کوردییەکان لەدایك بوون، بەڵام ئەوەم نەکرد، بەڵکوو ئەو ناودارانەم پشت گوێ خست کە نەژادیان -با بە کەمیش بێ- جێی گومانە. هێندێکم لەو میر و زانایانەیش خستە پاڵیان کە کورد نەبوون، بەڵام لە کوردستان گەورە بوون. "الطبری" لە بەرگی یەکەمی کتێبەکەیدا (تأریخ الامم والملوك، ج١) دەڵێ: ئەردەشیری بابکان کورد بووە. بەڵام تائێستا لە ڕاستیی ئەم بۆچوونە دڵنیا نیم. هەروەها "أبوالحنیفه الدینوری" لە کتێبی (الاخبار الطوال)دا دەڵێ: بەهرام چوبین و "کورد"ی برای و "کوردییە"ی خوشکی کە لە پێش ئیسلامدا ژیاون، کورد بوون و من ناوم نەهێناون لە کتێبەکەمدا (مشاهیر الکرد وکردستان)، چونکە بەڵگەیەکی ڕاستم لەسەریان دەست نەکەوتووە. هەروەها شاعیری عەرەبی "أبو دلامە"، "أبو مسلم الخراسانی"ی بە کورد داناوە، لەگەڵ ئەوەیشدا وای لێ نەکردم باوەڕ بە قسەکەی بکەم. هەر بەو شێوەیە، خاوەنی کتێبی (آثار الشیعە الإمامیە)ی "عبدالعزیز جوهرالکلام" بە ڕاشکاوی بەرمەکیەکان دەباتەوە سەر تیرەی کوردی (دونبوڵی). "الصدفی"ی خاوەنی (تأریخ دول الاسلام) و "حمزە الاصفهانی"ی خاوەنی (تاریخ اصفهان) و "أسکندر منشی" لە (تاریخ عالم آرای عباسی، مجلد ٣، ل٧٦٢)دا، دەڵێن: دەیلەمییەکان تیرەیەکن لە کورد. لەگەڵ ئەوەشدا من شا و میرە بوەیهییەکان کە سەر بە وان دانراون، لەناو ناودارانی کورددا ناوم نەهێناون. لێرەشەوە تکا لە خوێندەواران دەکەم ئەم بۆچوونانەم بە زیادەڕەوی دانەنێن. ئەمە پەیوەندیی بە بۆچوونی خۆمەوە هەیە و شتی تر نییە .
دەشڵێت: لەبەر ئەوە بە پێویستم نەزانی ناوی هەندێ کەس بهێنم کە دەوریان نادیارە و پێناسینەکەیان ناتەواوە و بۆچوونێکی ڕاستیان لەبارەوە نییە .
درێژەی پێ داوە و دەڵێت: هەر لەم بوارەدا هەندێ کەسی کوردی بیلمەت هەبوون وەك ئەحمەد شەوقی، ڕەصافی، زەهاوی، کە بە ڕەگەز و ڕەچەڵەك کوردن، بەڵام خزمەتی میللەتەکەی خۆیان نەکردووە، دەبێ عەرەب شانازییان پێوە بکات .
دکتور کەمال فوئادیش ڕەخنە لە محەمەدئەمین زەکی دەگرێ و دەڵێت: دانەر لە بەرگی یەکەمدا (ل٢٩-٢١٦) باسی چواردە بەرەبابی کوردی کردووە، کە لە سەردەمی جیاوازدا حوکمی چەند ناوچەیەکی جیهانی ئیسلامییان کردووە، ناوی ناوە (حکوومەتە کوردییەکان لە سەردەمی ئیسلامدا)، بێ گوێدانە شوێنی ئەو ناوچانەش کە لە دەرەوەی کوردستان بوون، هەر هەموویانی بە حکوومەتی کوردی داناون، تەنیا لەبەر ئەوەی سەرۆکەکانیان بە ڕەچەڵەك کورد بوون، وەك حکوومەتەکانی ڕەوادی و سالاری لە ئازەربایجان (ناوەڕاستی سەدەی نۆهەم تا سەرەتای سەدەی سیازدەهەم)، حکوومەتی ئەیووبی لە میسر و شام (سەدەی دوازدەهەم و سیازدەهەم)، حکوومەتی زەند لە ئێران (نیوەی دووەمی سەدەی دەهەم تا کۆتایی سەدەی یازدەهەم)،... .
هەروەها دکتۆر کەمال فوئاد دەڵێ: ئەگەر محەمەدئەمین زەکی ئەوەی بکردایە، ((لە نرخی زانستیی کتێبەکەی زیاتر دەکرد، چونکە ناکرێ مۆرکی نەتەوەیەکی دیاریکراو بە حکوومەتێکەوە بنرێ، هەر لەبەر ئەوەی دەسەڵاتدارانی لە ڕەگەزی ئەو نەتەوەیەن. بنەچەی نەتەوەیی دەسەڵاتداران فاکتەرێکی لاوەکییە لەچاو فاکتەری خاك و دانیشتوان و زمان و کولتوور و فاکتەری تر، کە مەرجە لە هەر حکوومەتێکدا هەبن کاتێ سیفەتی نەتەوەیەکی دیاریکراوی ئەخرێتە پاڵ)) .
لەبەر ئەوە پێمان وایە حکوومەتی ئەیووبی لە شام و میسر و حکوومەتی زەند لە ئێران و میرنشینی ئەفراسیابی لە بەسرە ... هتد، بە حکوومەتێکی کوردی دانانرێن. لەگەڵ ئەوەیشدا، محەمەدئەمین زەکی بایەخێکی زۆری داوە بە مێژووی سوڵتان صەلاحەددینی ئەیووبی و شایەکانی تری ئەیووبییەکان. هەروەها دەبینین چەند لاپەڕەیەکی تەرخان کردووە بۆ هەریەك لە ئەحمەد شەوقی، جەمیل صدقی، زەهاوی، مەعرووف ڕەصافی، کە خۆیشی دەڵێت ئەوانە تەنها بە ڕەگەز کوردن و خزمەتی کوردیان نەکردووە، وەك لە پێشەوە ئاماژەمان پێکرد.
لەلایەکی ترەوە، هەندێ لە ناوداران کە کورد نەبوون، ئەمین زەکی بە کوردی داناون، وەك ئاق سونقوری

ئەحمەدیلی، کە بە هەڵە بە کوڕی "ئەتابەك ئەحمەدیلێ" دانەری ئەتابەکیی ئەحمەدیلی لە ئازەربایجان داناوە . ئاق سونقور کورد نەبووە و لە ڕاستیدا کۆیلەیەکی تورکمان بووە، بۆیە وادیارە محەمەدئەمین زەکی ئەم زانیارییەی لە ئینسکلۆپیدیای ئیسلامی وەرگرتووە . هەروەهایش "ئەحمەدی کەسرەوی" بەهەمان هەڵەدا چووە ، چونکە لە دەقێکی "نیشاپووری"دا هاتووە، دەڵێ: ((ئاق سونقور "آق سنقور" ئەتابەکی مەراغە و ئازەربایجان بووە، خولامی "احمدیل بن ابراهیم بن وهسوذان" حاکمی ئازەربایجان بووە و کە ئەحمەدیل کوژرا، ئەو بوو بە خاوەنی دەسەڵات لە مەراغە و تەبریز)) .

هەروەها ئاق سونقور کە ناسناوی ئەتابەکی وەرگرتووە، بەڵگەیە لەسەر ئەوەی بنەماڵەکەی تورکە، چونکە سوڵتانە سەڵجووقییەکان ئەم ناسناوەیان بە کەس نەدەدا، جگە لە خولامە تورکەکان؛ لەبەر ئەوە ئەحمەدیل ناسناوی ئەمیر، بەڵام ئاق سونقور ناسناوی ئەتابەکی وەرگرتبوو.
بینیمان محەمەدئەمین زەکی باوەڕ بەوە ناکات کە ئەبو دلامە گوتوویەتی گوایە "ابو مسلم الخراسانی" کورد بووە، کەچی لە کتێبی (مشاهیر الکرد وکردستان)ـەکەیدا لاپەڕەیەکی تەرخان کردووە بۆ ژیاننامەکەی و دوو بەیتەکەی ئەبو دلامەی هێناوەتەوە کە ئاماژەی تێدا کردووە بەوەی کە باووباپیرانی ئەبوموسلیم کورد بوون و دەڵێ:

أبـا مـجرم ما غــير الله نــــعمه
على عبده حتى يغيرها العـــبد
أفي دوله المنصور حاولت غدره ؟
ألا ان أهـــل الغدر آباوك الـكرد

هەروەها لە پەراوێزی (خلاصه تأريخ الكرد وكردستان) دا کە محەمەد علی عەونی وەری گێڕاوەتە سەر زمانی عەرەبی ، هاتووە کە چەند بۆچوونێکی جیاجیا هەن دەربارەی ڕەچەڵەکی ئەبوموسلیم، بەڵام لە هەموویان پەسندتر ئەوەیە کە کوردێکی ڕەسەنە.
ئەو زانیارییانە دەڵێن: "ابومسلم" دەستێکی باڵای لە بنیادنانی دەوڵەتی عەبباسیدا هەبووە، بەڵام بە هەرحاڵ هیچ سەرچاوەیەکی کۆنمان بەرچاو نەکەوتووە باسی کوردبوونی "ئەبوموسلیم" بکات، تەنیا دەڵێن لە شاری (نەهاوەند) لەدایك بووە، کە عەرەبەکان پێیان گوتووە (ماه البصره) و دانیشتوانی ئەو شارە لەو سەردەمەدا بریتی بوون لە کورد و فارس، تاکە بەڵگە شیعرەکەی "ابو دلامە" نەبێ کە بەناوبانگ بووە بە درۆزنی و زەمکردنی خەڵك و یەکێك بووە لە پیاوانی خەلیفەی عەبباسی "أبوجعفر المنصور".

خۆیشمان ئەوە دەزانین ئەو خەلیفەیە غەدری لە "أبو مسلم" کردووە و کوشتوویەتی، بەبێ ئەوەی گوێ بداتە ئەو خزمەتەی کە لە دامەزراندنی خەلافەتی عەبباسیدا کردوویەتی. ئەبودولامە بۆ ئەوەی ئەبوو موسلیم بە ناڕاست دابنێ، باووباپیرانی گەڕاندووەتەوە بۆ کورد کە پیشەیان غەدرکردن بووە.
دەبێ ئەوەش لەیاد نەکەین کە دانانی شیعر بە بەڵگە لە ڕووی زانستیی ئەکادیمییەوە پەسند ناکرێ، چونکە شاعیرەکان زۆر جار بۆ خۆنزیك کردنەوە لە فەرمانڕەوایان و وەرگرتنی پاداشت پەنا دەبەنە بەر هەموو جۆرە پیاهەڵدان و داشۆرینێك.
جگە لەمە، بەڵگەیەکی تر هەیە کە دەبێتە هۆی گومان پەیداکردن لە کوردبوونی "ئەبوموسلیم"، بریتییە لەوەی کە دوای کوشتنی، چەند گرووپ و ڕێبازێکی ئایینی پەیدا بوون، لایان وابوو ئەبوو موسلیم پاش کوژرانەکەی بوو بە کۆترێکی سپی و فڕی بۆ ئاسمان، ڕۆژێك دێت دێتە خوار و لە دەستی عەباسییەکان ڕزگارمان دەکات. لایەنگرانی ئەم گرووپە ئایینیانە فارس بوون و هیچ سەرچاوەیەك نییە باس لەوە بکات کە کورد داوای تۆڵەسەندنەوەی کردبێ لەسەر کوشتنی ئەبووموسلیم. بەو هۆیەوە ئێمە باوەڕمان وایە کە "ئەبوو موسلیم" فارس بووە و کورد نەبووە. هەر لەوبارەوە "کارل برووکلمان" لە کتێبەکەیدا بە ناوی (تأريخ الشعوب الاسلامیه)وە هەمان بۆچوونی هەیە و بە فارسی دادەنێ.

بەوشێوەیە محەمەدئەمین زەکی حکوومەتی (سالاری) ی لە ئازەربایجان بە حکوومەتێکی کوردی داناوە و دوازدە لاپەڕەی کتێبەکەی تەرخان کردووە بۆ باسی ئەو حکوومەتە . کەچی سەرچاوە کۆنە ڕەسەنەکان هیچ باسێکی کوردبوونی ئەو حکوومەتەیان تێدا نییە و تەنیا بەم جۆرە ناوی هاتووە "السالار مرزبان بن مسافر" . هەروەها "الصدفی" لە کتێبەکەیدا بەناوی (تأريخ دول الاسلام) و "محەمەدئەمین زەکی"ش بە ناسناوی (الديلمی)یەوە ئاماژەی بۆ دەکەن. لای ئێمەش ڕوونە کە دەیلەمییەکان دانیشتووی دیلەمستان (بلاد الديلم)، کە دەکەوێتە باشووری دەریای خەزەر (قەزوین)، فارسن. بوەیهییەکان کە بنەماڵەیەکی دەیلەمین، توانییان دەسەڵاتی خۆیان بەسەر عەباسییەکاندا بسەپێنن و زیاتر لە دووسەد ساڵ (٣٣٤-٤٤٧ك) فەرمانڕەواییان کرد لەسەر ڕێبازی شیعەگەرایی. محەمەدئەمین زەکی دڵنیا نەبووە لە کوردبوونی دەیلەمەکان، بۆیە باسی ئەوەی نەکردووە کە کوردن .

محەمەدئەمین زەکی ئاماژەیشی نەکردووە بۆ ئەو سەرچاوەیەی کە زانیاریی لێوەرگرتووە دەربارەی "المرزبان سالار" کە بە کوردی داناوە و باوکی ناوی

ماملان= محەممەد و لە تیرەی ڕەوادییە و فەرمانڕەوای قەڵای (طارم = الطرم) بووە .

وادیارە لێتێکچوونێك لە ئارادایە لای محەممەدئەمین زەکی لە نێوان "محمد الروادی الکردی" و "محمد ابن مسافر الدیلمی"دا، کە ئەمەی دووەمیان خاوەنی (الطرم وشمیران وآذربیجان) بووە ، نەك "محمد الروادی الکردی".

جگە لەوەش، محەممەدئەمین زەکی لە بری ئەوەی باسی "سالار مرزبان" بکات کە فارسە و کورد نەبووە، باسی حکوومەتی (دەیسەمی)ی نەکردووە کە لە سەرچاوە باوەڕپێکراوەکاندا بە کورد دانراوە و ناوی دامەزرێنی حکوومەتەکەی بەم جۆرە دەهێنن: "أبوسالم دیسم بن ابراهیم الکردی"، واتا ناسناوی "الکردی" دەخەنە پاڵ ناوەکەی، بەڵام سەبارەت بە "سالار مرزبان بن مسافر" ئەم ناسناوە نەخراوەتە پاڵ ناوەکەی.

لەلایەکی تریشەوە، محەممەدئەمین زەکی "ئەحمەدیل"ی میری ئەتابەکی ئەحمەدیلیی لە ئازەربایجان، بە ((کوڕی ئیبراهیم کوڕی سالار کوڕی مەرزبان کوڕی مسافر)) داناوە . ئەمەش هەڵەیەکی زەق و گەورەیە، چونکە ئیبراهیم سالار لە ساڵی (٣٧٣ك)دا مردووە و یەکەم جار کە ناوی (ئەحمەدیل کوڕی ئیبراهیم کوڕی وهسوذان) هاتووە، لە ساڵی (٥٠١)ی کۆچیدا بووە، ئەوکاتە لەژێر فەرمانی سوڵتانی سەلجووقی "محمد بن ملك شاه"دا بووە. ئەگەر ئەحمەدیل بە کوڕی ئیبراهیم کوڕی سالار دابنرێ، وەك محەممەدئەمین زەکی دەڵێ و ئیبراهیم کوڕی سالاری باوکی لە ساڵی (٣٧٣ك)دا مردبێ، نەك ٣٨٠ك وەك محەممەدئەمین زەکی دەڵێ ، دەبێ بەم پێیە ساڵی (٥٠١ك) زیاتر لە سەدوبیست ساڵ بەسەر مردنی ئیبراهیمی باوکیدا تێپەڕ بووبێ. ئەگەر تەمەنی ئەحمەدیل کە بە کوڕی (ئیبراهیم کوڕی سالار کوڕی مەرزبان) بە سی یا چل ساڵ دابنرێ —ئەگەر زیاتریش نەبووبێ-و (٥١٠ك)ی ساڵی کوژرانی (ئەحمەدیل کوڕی ئیبراهیم کوڕی وهسوذان)، بەپێی بۆچوونی مێژوونووسانی سەردەمەکە یا نزیکی ئەو سەردەمە ، ئەوا تەمەنی دەگاتە سەد و پەنجا یا سەد و شەست ساڵ و ئەوەیش بە عەقڵدا ناچێ.
لەبەر ئەوە بۆمان دەردەکەوێ کە مەبەست لەو "ئەحمەدیل" ناوە، "أحمدیل بن ابراهیم بن وهسوذان الروادی الکردی" بێ، وەك لە (الکامل)ی "ابن الإثیر" دا هاتووە، نەك کوڕی ئیبراهیم کوڕی سالار کوڕی مسافر.
محەممەدئەمین زەکی، ئەگەر دڵنیا نەبووبێ لەوەی یەکێك کوردە و زانیاریی تەواوی سەبارەت بە کوردبوونەکەی نەبووبێ، ناوی لە کتێبەکەیدا (مشاهیر الکرد وکردستان) (وەك خۆی دەڵێت) نەهێناوە، کەچی بە پێچەوانەی ئەم بۆچوونەی خۆیەوە، لەم بابەتەدا "أحمدیل"ی بە کوڕی ئیبراهیم سالار داناوە کە بە ڕەچەڵەك فارسە و دەیلەمییە و کورد نییە.
محەممەدئەمین زەکی وەك لە پێشەوە ئاماژەمان پێ‌کرد، دڵنیا نەبووە لەوەی کە دەیلەمییەکان کورد بن، لەبەر ئەوە باسی بوەیهییەکانی نەکردووە کە سەر بەوانن.
کەچی لە شوێنێکی تردا دەیلەمییەکان بە کورد دادەنێ و هاوبۆچوونی "هیوار"ە لە ئینسکلۆپیدیای ئیسلامیدا کە هیچ گومانی نییە لە کوردبوونی حکوومەتی سالاری لە ئازەربایجان. ئێمەیش، وەك لە پێشەوە دەرمان خست، پێمان وایە دەیلەمییەکان فارسن، نەك کورد.
هەروەها محەممەدئەمین زەکی بە هەڵەدا چووە لەوەدا کە ساڵانی سێسەد تا چوارسەد و بیستی بە ماوەی فەرمانڕەوایی سالاری داناوە، چونکە ڕاستیەکەی لە ساڵی (٣٧٤ی کۆچی= ٩٨٤ی زاینی) بەدواوە، فەرمانڕەوایی هیچ ناوچەیەکی ئازەربایجانیان بەدەستەوە نەما و ساڵی ٣٧٠ك یا ٣٧١ك دواین فەرمانڕەوای ئازەربایجان "ئیبراهیم کوڕی سالار کوڕی مەرزبان" بووە کە گیراوە لەلایەن میری (ڕەوادی) "ابوالهیجاء الحسین بن محمد الروادی"یەوە و بەدوای ئەوەدا ساڵی (٣٧٣ك) مردووە، نەك (٣٨٠ك) . هەندێ ناوچەی ئازەربایجان لە ژێر دەستی "مەرزبان کوڕی ئیسماعیل کوڕی وهسوذان"دا لە بەنی موسافر مایەوە، ئەویش ساڵی (٣٧٤ك/ ٩٨٤ز) بەدیل گیراو هەرچی سامانی هەبوو کەوتە دەستی "ابو الهیجاء"، بەم جۆرە فەرمانڕەوایەتیی هەموو ناوچەی ئازەربایجانی کرد .
هەروەها محەممەدئەمین زەکی بە هەڵەدا چووە، لەوەدا کە دەڵێ: بنەماڵەی میر ئەحمەدیل ((لە نەوەی خانەدانی ڕەوادیی ئازەربایجان و کوڕی ئیبراهیم سالاری کوڕی مەرزبان و (مەراغە) بووە)) .
مێژوونووسی بەناوبانگ "ابن الاثیر" لە ڕووداوەکانی ساڵی (٥١٠)ی کۆچیدا بە ئاشکرا ناوی ئەحمەدیل و نەوەکەی بەم جۆرە هێناوە: "احمدیل بن ابراهیم بن وهسوذان الروادی الکردی" .
لەمەوە بۆمان دەردەکەوێ کە ئەحمەدیل کوڕی ئیبراهیم سالار نییە، بەڵکوو سالار دەیلەمییە، واتا فارسە و لە تیرەی ڕوادی نییە کە کوردن.

لەبەر ئەوەی سەرچاوە ڕەسەنەکان هیچ زانیارییەکمان ناخەنە بەردەست لەسەر ژیانی ئیبراهیم باوکی ئەحمەدیل و وەهسووذانی باپیری، بەلامانەوە ڕاست نییە ئەتابەکەی ئەحمەدیلی بە درێژبوونەوەی میرنشینی ڕەوادی دابنێین [ لەگەڵ ئەوەیشدا ئەحمەدیل بە ڕەگەز دەچێتەوە سەر تیرەی ڕەوادیی کوردی]، ئەوە بە هەڵە دەزانین کە هەندێ لە مێژوونووسان وەك محەممەدئەمین زەکی و حسێن حوزنی موکریانی بۆی چوون .

هەروەها محەمەدئەمین زەکی لە ڕووداوەکانی ساڵی (٥١٠)ی کۆچیدا (ساڵی کوژرانی میر ئەحمەدیل)، ناوی ئەو ئەتابەکە دەهێنێ کە میوانی سوڵتان موحەمەدی سەلجووقی بووە و بە هەڵە دەڵێت ناوی ئەتابەك "تەفتکین" بووە، بەڵام ڕاستییەکەی "اتابك طفتكين" و خاوەنی دیمەشق بووە، وەك لە سەرجەمی سەرچاوە بڕواپێکراوەکاندا ناوی هاتووە .

محەمەدئەمین زەکی لە دیاریکردنی ساڵی مردنی "وهسوذان بن محەمەد الروادی" و ماوەی فەرمانڕەوایەتیی "ئیبراهیم"ی کوڕیدا پشت دەبەستی بەو زانیارییانەی کە حسێن حوزنی موکریانی نووسیونی و دەڵێت: ((وەهسوذانی دووەم لە ساڵی (٤٥٨)ی کۆچیدا مردووە و ئیبراهیمی کوڕیشی تا ساڵی (٤٩٠) حوکمدار بووە .

ئەم بۆچوونەش دوورە لە ڕاستییەوە، چونکە خاوەنی (تأريخ الباب والابواب) مێژووی مردنی داناوە بە ڕۆژی پێنجشەممەی مانگی (صفر)ی ساڵی (٤٥١)، کە دەکاتە (١٩)ی ئازار تا شازدەی نیسانی ساڵی ١٠٥٩ی زایینی .

دانانی ناوی ئیبراهیم وەك کوڕی وەهسووذان و دیاریکردنی ماوەی فەرمانڕەوایی ئەو تا ساڵی (٤٩٠)ی کۆچی، لە هیچ سەرچاوەیەکی بەردەستماندا نەهاتووە. ئەو سەرچاوانە تەنها باسی ئەوە دەکەن کە وەهسووذان لە دوای خۆی سێ کوڕی بەم ناوانەی خوارەوە بەجێهێشتووە: ١- أبونصر محمد- مەملان،
٢- أبو الهيجاو منوچر،
٣- أبو القاسم عبدالله.
"قطران التبريزي"ی شاعیر لە شیعرەکانیدا ناوی هەرسێ کوڕەکەیی هێناوە . هەروا لە سەرچاوەکاندا هاتووە کە (ابونصر محمد- مەملان-)، پاش ئەوەی سوڵتانی سەلجووقی "طغرل بگ" ساڵی ٤٥٤ك تەبریزی داگیر کرد، خۆی دا بەدەستەوە و ئیتر باسی ئەوە نەکراوە کوڕێکی بەناوی "ئیبراهیم" هەبووبێ .

سەرچاوەکان ئاماژە بەوە دەکەن کە "مەملان" لەسەر فەرمانڕەوایی ئازەربایجان مایەوە تا ساڵی (٤٦٣ی کۆچی- ١٠٧١ زایینی) ، کە بە مێژووی کۆتایی میرنشینی ڕەوادی دادەنرێت، نەك ساڵی ٦١٨ی کۆچی وەك محەمەدئەمین زەکی دەڵێت ، چونکە ساڵی ٤٦٣ی کۆچی سەربەخۆیی وڵاتەکەیی لەکیس چوو و کەوتە چنگی سەلجووقییە تورکەکان؛ ئەو ساڵە "ألپ أرسلان- ئولوپ ئەرسەلان"ی سوڵتانی سەلجووقی دوای ئەوەی بەسەر ڕۆمەکاندا سەرکەوت و لە شەڕ گەڕایەوە، مەملان و کوڕەکانیی گرت و بەندی کردن و بەم جۆرە کۆتایی هات بە فەرمانڕەوایی ڕەوادییەکان لەسەر ئازەربایجان .

محەمەدئەمین زەکی، لە باسی ناودارانی کورددا، ناوی سێ کەسی گەورەی کوردی سەردەمی ئیسلامی هێناوە بە ناونیشانی "ابو الهيجاء" ەوە؛ لە ڕاستیدا ئەوانە چوار کەس بوون و ئەو ئاماژەی بە کەسی چوارەم نەکردووە کە بریتییە لە "ابوالهيجاء حسين بن محمد بن الحسين الروادي" کە فەرمانڕەوای میرنشینی ڕەوادیی کوردی بووە لە هەرێمی ئازەربایجان (ئێستا بەشێکە لە وڵاتی ئێران).
ئەم میرە دوای باوکی بووە بە فەرمانڕەوا و ساڵی (٣٤٥ی کۆچی -٩٥٦ی زایینی) تەبریزی داگیر کردو بارودۆخی ناوچەکەی ڕێکخست و شوورایەکی دروست کرد بۆ شارەکە و کردی بە سەنتەری فەرمانڕەوایەتی لە ساڵی ٣٥٠ی کۆچی-٩٦١ی زاین)دا و کاروباری بە ڕێکوپێکی بەڕێوە دەبرد و لە دەسەڵاتدا مایەوە تا دەوروبەری ساڵی (٣٧٣ك-٩٨٣ز) .
هەر پەیوەست بە بابەتی "ئەحمەدیل"، محەمەدئەمین زەکی بە دوو شێوەی جیاواز ناوی باووباپیرانی ئەحمەدیل دەبات؛ لەلایەك دەڵێت: ((ئەحمەدیل کوڕی ئیبراهیم کوڕی وەهسووذانی ڕەوادیی کوردی)) ، لە جێگایەکی تردا بە هەڵە ناوی دەبات و دەڵێ: "ئەحمەدیل کوڕی ئیبراهیم کوڕی موسافیری دەیلەمی" یە.
هەروەها محەمەدئەمین زەکی کەوتووەتە هەڵەوە، لەوەدا کە دەڵێت: ((میر ئەحمەدیل دوای مردنی ئیبراهیم سالاری باوکی هاتە سەر حوکم. ئەم ئیبراهیمە دوایین میرێکی ڕەوادی بوو)) . وا دیارە لەم بۆچوونەیدا پشتی بەستووە بە نووسینی حسێن حوزنی موکریانی لە کتێبی (دێریکی پێشکەوتن)دا. بۆ ڕاستکردنەوەی ئەم هەڵەیە، مێژوونووسان کۆکن لەسەر ئەوەی کە دوایین میری ڕەوادییەکان "مەملان کوڕی وەهسووذان کوڕی مەملان" بوو، نەك ئیبراهیم کوڕی وەهسووذان.

محەمەدئەمین زەکی بە هەڵەدا چووە کە ساڵی (٣٤٥)ی کۆچیی داناوە بە ساڵی مردنی "سالار مرزبان" ، چونکە لە ڕاستیدا ساڵی (٣٤٦ی کۆچی= ٩٥٧-٩٥٨ی زایینی) ساڵی مردنیەتی و لەم ساڵەدا ئیبراهیمی کوڕی بوو بە فەرمانڕەوا . مێژووناس و جوگرافیاناسەکان باسی دوو بنەماڵەی جیاوازی ڕەوادی دەکەن کە هەردووکیان فەرمانڕەوایی ئازەربایجانیان کردووە، یەکەمیان (ڕووادی- روادی) [بە دوو پیتی واو] عەرەب و سەر بە تیرەی (الازد)ن، پێش ساڵی (٢٣٥)ی کۆچی حوکمیان کردووە؛ دووهەمیان هەر بە هەمان ناوەوە [بەڵام بە یەك پیتی واو] ڕەوادی- روادی، ئەمەی دووەمیان کورد و سەر بە تیرەی هەزبانی (هذباني) یە کە تیرەیەکی گەورەیە، دەوروبەری ساڵی (٣٤٣)ی کۆچی تا ساڵی (٤٦٩ك) حوکمی ئازەربایجانی کردووە. ئەوەی سەرنجمان ڕادەکێشی ئەوەیە سەرچاوەکان بە هیچ شێوەیەك لەدوای ساڵی (٢٣٥ك)یەوە ناوی (بنو الرواد)

ناهێنن تا دەوروبەری ناوەڕاستی سەدەی چوارەمی کۆچی، واتا زیاتر لە سەد ساڵ، تا "ابن حوقل" لەژێر ناوی "أبو الهیجاء ابن الرواد" و لە ڕووداوەکانی ساڵی (٣٤٤ی کۆچی و ٩٥٥ی زاینی) دا ناوی دەهێنێ، ئیتر لەدوای ئەم ساڵەوە ناسناوی (الکردی)یان لەپاڵ وشەی ڕەوادیدا داناوە ، بەڵام بۆ ئەو کەسانەی کە سەر بە (بنو الرواد) بوون، پێش ساڵی (٢٣٥ك)، ناسناوی (الازدی) کە تیرەیەکی عەرەبە، لەگەڵ ناوەکانیاندا دانراوە .
وا دیارە محەممەدئەمین زەکی کە دەڵێ "ابن خرداذبە" بە چاوی خۆی حکوومەتی "محمد الروادی"ی لە ساڵی (٢٣٢)ی کۆچیدا بینیوە، لە نێوان "محمد الروادی"ی سەر بە (بنو الروادی الازدی)ی عەرەب و ڕەوادییە کوردەکاندا کە دوای ساڵی (٣٤٤) دەرکەوتن، لێی تێك چووە. وەك لەسەرەوە باسمان کرد، سەرچاوەکان ناسناوی "الکردی" لەپاڵ ناوەکانیاندا دادەنێن. لەبەر ئەوە بە هەڵەدا چووە کە ساڵی (٢٣٠) تا ساڵی (٦١٨) یا ٦٢٤ی بە ماوەیەکی فەرمانڕەوایی کوردی داناوە . میرنشینی ڕەوادیی کوردی بە ڕاستی لە نێوان دەوروبەری ساڵی (٣٤٣ تا ٤٦٩) ی کۆچیدا فەرمانڕەوایی کردووە.
محەممەدئەمین زەکی، لە شوێنێك ساڵی (٦١٨)ی کۆچی و لە شوێنێکی تر (٦٢٤)ی دادەنێت بە مێژووی کۆتایی هاتنی فەرمانڕەوایی حکوومەتی ڕەوادی داناوە.
(الاتابکیە الاحمدیلیە)یشی بە درێژەپێدەری میرنشینەکە لە قەڵەم داوە. ئەمەش وای لێکردووە سێ حکوومەت کە لە ئازەربایجان فەرمانڕەوایەتییان کردووە، بە یەك حکوومەت دابنێ:

- حکوومەتی (الروادیە) کە فەرمانڕەواکانی عەرەبن لە تیرەی (بنو الازد) و تا ساڵی (٢٣٥)ی کۆچی فەرمانڕەوایی کرد.
- حکوومەتی ڕەوادیی کوردی کە بەشێکە لە تیرەی هەزبانی (هذبانی)ی کوردی.
- حکوومەتی ئەتابەکیەی ئەحمەدیلی کە ساڵی (٥٠١)ی کۆچی دامەزراوە و ساڵی ٦٢٤ کۆتایی پێهاتووە.

ئەم ئەتابەکییە تەنها دامەزرێنەکەی "ئەحمەدیل" کورد بووە، ئەوانەی دوای ئەو فەرمانڕەوایەتییان کردووە، لە مەملوکە تورکەکان بوون. محەممەدئەمین زەکی ئەم سێ حکوومەتەی بە یەك حکوومەت داناوە بە ناوی حکوومەتی ڕەوادیی کوردییەوە و دەڵێ: ((بەم طرحە دوای حکومتیکی چوارصەد سالی، خانەدانی روادی کورد لەناو چوە لە ساڵی ٢٣٠ه تاکو سالی ٦٢٤ه)) .

محەممەدئەمین زەکی سەبارەت بە یەکەم پەیوەندیی کورد بە سوپای ئیسلامەوە، وتوویە: ((قومی کورد وەکو مۆرخینی معتبری عرب ئەلین: لە سالی شانزەی هجرت و لەدوای فەتحی حلوان و تکریتدا، لەگەڵ ئوردوی اسلامدا تماسیان کرد)) .
ڕاستە یەکەم پەیوەندیی کورد بە سوپای ئیسلامەوە ساڵی ١٦ك/٦٣٧ز بووە، بەڵام پاش شەڕی (جەلەولاء) بووە، نەك پاش فەتحی حولوان و تکریت، چونکە ئەگەر بڕوانینە ڕێگەی ڕۆیشتنی سوپای ئیسلام، دەبینین پاش فەتحی جەلەولاء، ڕووی کردووەتە (خانەقین)، ئەویش ساڵی ١٧ك بە فەرماندەیی "القعقاع بن عمرو التمیمی" فەتح کراوە. سوپاکە -ئەوەبەدوا- هەمان ساڵ (١٧ك) گەیشتووەتە (قەسری شیرین). " القعقاع" وەك لە سەرچاوەکاندا هاتووە، ساڵی (١٨ك) بە سوپاکەیەوە توانیی فەتحی (حولوان) بکات.
سەرچاوەکان لە بارەی ساڵی فەتحکردنی (تکریت)ـەوە، نووسیویانە: "عتبە بن فرقد السلمی": پاش فەتحی تکریت، بەرەو (شارەزوور) چووە ، بەڵام مێژوونووسان ساڵی فەتحکردنی شارەزووریان دیاری نەکردووە؛ بۆیشمان ڕوون بووەتەوە کە دەوروبەری ساڵی (٢٠ك) بووە، نەك -وەك محەممەدئەمین زەکی بۆی چووە- ساڵی (٢٢ك) ، واتە فەتحی تکریت پێش ئەم ساڵە بووە و لەوانەیشە لە دەوری ساڵی (١٩ك)دا بووبێ.
لەوەوە بۆمان دەردەکەوێ کە یەکەم پەیوەندیی نێوان کورد و سوپای ئیسلام، دوای فەتحکردنی حولوان و تکریت نەبووە، بەڵکوو پاش شەڕی (جەلەولا- جلولاء) بووە.
ناوی ئەو فەرماندەیەی سوپای ئیسلام کە بۆ فەتحکردن لە حولوانەوە بەرەو شارەزوور هاتووە، لە نووسینەکانی محەممەدئەمین زەکیدا بە "عەزرە کوڕی قەیس- عزرە بن قیس" نووسراوە. وا دیارە ئەمەی لە کتێبی "البلاژری" وەرگرتووە کە بەو شێوەیە جێی تێدا کراوەتەوە. بێگومان ئەمە هەڵەی ئەو کەسەیە کە کتێبەکەی "البلاذری"ی نووسیوەتەوە و "عوروە- عروە"ی کردووە بە "عەزرە- عزرە"، چونکە نەبیستراوە عەرەب ناوی نەوەکانیان بە "عەزرە" نابێ. جگە لەوە، سەرچاوەکانی تر کە باسی فوتووحاتی ئیسلامییان کردووە، بەڕوونی ناوی ئەم سەرکردەیەیان بە "عوروە- عروە " نەك "عەزرە- عزرە" هێناوەتەوە . کەچی چەند مێژوونووسێکی نوێ هەمان هەڵەیان کردووە و ناوەکەیان بە شێوەی "عەزرە" نووسیوە.
محەممەدئەمین زەکی ناوی دوو شاری کۆنی شارەزووری بردووە و نووسیویە: ((قدمای مۆرخین احوالی تاریخیەی شارزوریان دائما لەگەڵ احوالی ولاتی دامغان و دارآباددا باس کردوە)) ، بەڵام لە (خولاصەی تاریخی کورد و کوردستان)دا ناوی (بازبدا و صامغان)ی لە شارەزوور هێناوە . دانانی (بازبدا) لەگەڵ (صامغان)دا جێی خۆی نییە، چونکە (بازبدا) لە شارەزوور نییە و ئێستایش بە هەمان ناوەوە ماوەو سەر بە (دهۆك) و لە ناوچەی (بادینان)ـە.

مێژوونووسان باسی فەتحکردنی شارەزووریان لەگەڵا هی (صامغان و دارئاباد)دا کردووە، واتە وایان داناوە ئەم دوو شوێنەی دوایی وان لە شارەزوور یا دەوروبەری. مەلا جەمیل ڕۆژبەیانی لە پەراوێزدا نووسیویە: دامغان هەڵەیە و ڕاستیەکەی (صامغان)ـە. ئەمە ڕاستە، بەڵام لەوەدا هەڵەکەی کردووە کە پێی وابووە صامغان لە بناری چیای (تەبەرستان- طبرستان)ـە ، چونکە ئەم چیایە لە خوارووی دەریای (قەزوین)ـە و زۆر دوورە لە شارەزوور. پێدەچێ ڕۆژبەیانی ئەم دیاریکردنەی شوێنی (صامغان) ی لە کتێبەکەی "یاقوت الحموی" وەرگرتبێ . کتێبەکانی جوگرافیی کۆن، ناوی (صامغان و دارئاباد)یان نەهێناوە. "الاصطخری" نەبێ کە وتوویە: هەردووکیان جێنشینی کوردانن . "مینۆرسکی" شوێنی (صامغان)ی وا دیاری کردووە و نووسیویە: ڕەنگە (زمگان) بێ، کە ناوی ناوچە و ڕووبارێکی خوارووی شارەزوورە، دەڕژێتە ڕووباری (سیروان)ـەوە .

محەمەدئەمین زەکی باسی هێندێ شار و گوندی شارەزووری کردووە، کە "مسعر بن مهلهل" و "یاقوت الحموی" ناویان هێناون، وەك (دوزدان-دزدان، تیران شاە، کینا، دەیلەمستان- دیلمستان) . میسعەر گەشتەکەی بۆ شارەزوور لە ساڵی (٣٤١ك)دا بووە ، نەك (٣٣٠ك)، وەك محەمەدئەمین زەکی نووسیویە .

میسعەر "مسعر"، جگە لەو شار و گوندانە، ناوی شاری (بیر)ی هێناوە، بەڵام محەمەدئەمین زەکی ئاماژەی پێ نەداوە. ئەمە- بە بۆچوونی ئێمە- لەوانەیە (پیردیوەر) بێ کە ئێستا گوندێکی ناوچەی هەورامان و شوێنێکی پیرۆزی تیرەی (عەلی ئەڵڵاهی)یە؛ یا دەشێ لەگەڵ گوندی (پیران) دا بەراورد بکرێ. جێی سەرنجە، ناوی گوندی (پیر) لە کتێبە پیرۆزەکانی (ئەهلی هەق)دا کە هی سەدەی هەشتەمی کۆچین، براوە .
محەمەدئەمین زەکی کە ناوی گوندێکی بە شێوەی (کینا) نووسیوە، هەڵەیە، چونکە "ابن الاثیر" بە (قسنان) و "یاقوت الحموی"یش بە (قیننا- قنا) ناوی بردووە. یاقوت وتوویە: ((ناحیەیەکە لە شارەزوور، ڕەنگە (قسنان) "ابن الاثیر بێ و دەستکاری کرابێ و بوویێتە (قیننا- قنا))). شایانی وتنە، دەشتێکی بچووك لە ڕاستی ئاوی (سیروان)، باشووری ڕۆژهەڵاتی شاری هەڵەبجەی ئێستا، هەیە و گردێك و گوندێکی بە ناوی (گونا)وە لێیە.
محەمەدئەمین زەکی لە جێیەك ناوی قەڵای (تیرانشاە)، کە قەڵایەکی مەحکەمی نزیکی شاری (شارەزوور) [جێی خورماڵی ئێستا] بووە، بەو شێوە ڕاستەی لای "ابن الاثیر" و "یاقوت الحموی" داناوە . کەچی لە جێیەکی تردا بە هەمان شێوەی هەڵەی لای "ابن خلدون" (بیزار شاە) هێناویەتەوە .

دیارە دەبێ بە هەڵە لێی وەرگرتبێ، چونکە لای "ابن خلدون" بەو شێوەیە بە هەڵە هاتووە . لەوانەیە قەڵای تیرانشاە کەوتبێتە دۆڵی ئاوی زەڵم، کە -جگە لە قایمیی پێگە سروشتییەکەی- چەند شوورەیەکی پارێزراوی هەیە.

محەمەدئەمین زەکی پێی وابووە شاری (هاڵمان) وڵاتی (هەورامان)ی ئێستایە و وتوویە: ((ئەم تەعبیری "هاڵمان"ـە لە شکڵی "ئارمان"یشدا بینراوە. بە گوێرەی تەطابوقی جوگرافی، ڕەنگە وڵاتی "هەورامان"ی ئیمرۆ بێ و ناوی ئیمرۆی لە "ئارمان"ـەوە تەحریف کرابێ)) . "جەمیل ڕۆژبەیانی"ش وا لێکی داوەتەوە کە ((هەندێ کەس باوەڕیان وایە "هاڵمان" خۆی شاری "حەلوان"ـە)) .
ئێمەیش دەڵێین: ناوی شارەکە لە سەردەمی ئیسلامیدا بە شێوەی (حولوان- حلوان) هاتووە، نەك (حەلوان). "یاقووت ئەلحەمەوی" سەبارەت بەو ناوە نووسیویە: ((حلوان: تعنی (الهبه)، فیقال: حلوت فلانا إذا وهبت له شیئا علی شیء و یفعله غیر الآجر)) . بەڵام ئەم بۆچوونەی "یاقووت" لە ڕاستییەوە دوورە، چونکە شارەکە زۆر کۆنە و سەردەمی ئاشووری (خەلمەنو- خلمنو)ی پێ وتراوە، دوایی بووە بە (خالمان) و ئەمەیش گۆڕاوە بۆ (حولوان- حلوان) .
محەمەدئەمین زەکی لەبارەی هەرێمی چیاو کرماشان و شارەزوورەوە، نووسیویە: ((اقلیمی جبال، کە ولاتی کرماشانی ئیستا و شهرزور هەموی لەژێر حکمی خویدا بو)) ، مەبەستی ژێر حوکمداریی میرنشینی حەسنەوەیهیی بەرزیکانییە.

ئێستا شاری (شاپوور خواست) نەماوە، بەڵام پاشماوەکەی لە دووریی دوو کیلۆمەتری نزیکی (خوڕەم ئاباد)ی ئێستاوە ماوە. منارەیەکی کۆن لە جێگەیدا هەیە، هی سەردەمی بنەماڵەی (حەسنەوەی)یە . هەرێمی چیا (إقلیم الجبال) هەرێمێکی زۆر گەورە و فراوان بووە، هەر وڵاتی کرماشان و شارەزووری ئێستای نەگرتووەتەوە، وەك محەمەدئەمین زەکی وتوویە، بەڵکوو پانوبەرین بووە و زۆربەی خاکەکەی بریتی بووە لە چیا، بۆیە وای پێ وتراوە. نووسەرانی یۆنانی پێیان وتووە، وڵاتی میدیا. جوگرافییەکان وا سنووریان بۆ ئەم هەرێمە داناوە؛ ناوچەی نێوان بیابانی فارس و خوراسان و ئەصبەهان لە ڕۆژهەڵاتەوە، ئازەربایجان و وڵاتی دەیلەم و قەزوین و ڕەی لە باکوورەوە، دەشتەکانی عیراق و جەزیرەی فوراتی (الجزیره الفراتیه) لە ڕۆژاواوە و عیراق و خووزستان (عەرەبستان) لە باشوورەوە. بە (إقلیم الجبال)یش وتراوە عیراقی عەجەمی (العراق العجمی)، بۆ ئەوەی سنوورەکانی هەرێمی چیا بەم شێوەیە دیاری بکەین: ئەو زەویانە دەگرێتەوە کە لە باکووری ڕۆژئاوای ئێراندان تا ورمێ، لە ڕۆژاوادا لە دەشتەکانی عیراقەوە درێژ دەبنەوە تا بیابانی گەورەی ئێران

لە ڕۆژهەڵاتەوە؛ جگە لەوە، ناوچەی چیاکانی باشووری ڕۆژهەڵاتی ئازەربایجانیش دەگرێتەوە .
محەمەدئەمین زەکی لە باسی "ابوالفتح بن أبی الشوك"ی میری بەنوو عەننازیی شاذنجانیدا، بە هەڵە بە "بکورا" ناویی بردووە . لەکاتێکدا ئەم قەڵایە، لای "ابن الاثیر" و هەروەها لە (مرآه العبر) دا، بە (بلوار) هاتووە. لەوانەیە (بیلەوەر)یش بێ کە ناوی شارێکی نزیکی (مایدەشت) ـە لە لوڕستانی ئێران . وا دیارە محەمەدئەمین زەکی کە (بکورا)ی هێناوەتەوە، لە "ابن خلدون"ی وەرگرتووە، کە بە ((بکورا من قلاع الکرد)) نووسیویە . لێرەدا پێویستی دەبینین ئاماژەی پێبدەین کە کتێبی لە چاپدراوی (العبر)ی ئیبن خەلدوون پڕە لە هەڵەی ناوەکانی کەس و شوێن.
جلدی دووەمی (خولاصەی تاریخی کورد و کوردستان) بەناونیشانی (تاریخ الدول والامارات الکردیه فی العهد الاسلامی)یەوە کراوەتە عەرەبی؛ بەشی یەکەمی کە ناونیشانی (فی الحکومات الکردیه فی العهد الاسلامی) ی هەیە، ناوی ١٤ چواردە حکوومەتی تێدا براوە، هەندێکیان لە سەردەمی ئیسلامیدا نەبوون، وەك حکوومەتی ئەردەڵانی و حکوومەتی زەند لە ئێران و حکوومەتی براخوئی لە بلووجستان. ئەمانە بە حکوومەتی سەردەمی نوێ دادەنرێن، نەك هی سەردەمی ئیسلامی. بەشی دووەمی کە ناونیشانی (الامارات الکردیه فی العهد الاسلامی) ی هەیە ، باسی (٣٥) سی و پێنج میرنشینی کوردیی تێدا کراوە، سەرجەمیان لە سەردەمی ئیسلامیدا نەبوون، بەڵام بە مێژووی سەردەمی نوێ لە قەڵەم دەدرێن.
محەمەدئەمین زەکی بە هەڵە ناسناوی "الدیلمی"ی ناوە بە ناوی تەواوی "سهلان بن مسافر"ی فەرمانڕەوای شاری نەهاوەندەوە . ڕاستیەکەی، ناسناوی "الکردی"ی هەبووە و لە کتێبی (تلخیص مجمع الآداب)دا وا هاتووە: ((عصمه الدوله، أبو نصر أبو دلَف سهلان بن مسافر بن سهلان الکردی، أمیر الجبل)) . بە هەمان شێوەیش لە یەکێك لە نامەکانی "الصابی"دا هاتووە .
"محەمەد عەلی عەونی"ی وەرگێڕی کتێبی (تاریخ الدول والامارات الکردیه) خۆیشی لە پەراوێزدا هەڵەی لە دیاریکردنی ناوی ڕاستەقینەیدا کردووە؛ جارێك بە "محمد الروادی الکردی" و جارێکی تر بە "محمد بن مسافر الکردی" ناویی بردووە، لە کاتێکدا دەبوو هەردوو ناوەکە لێك جیا بکاتەوە، چونکە "سهلان بن مسافر الکردی" خاوەنی نەهاوەند و هەمەدان، "محمد بن مسافر"یش خاوەنی (الطرم وشمیران وآذربیجان) بووە .
محەمەدئەمین زەکی چەند مێژوویەکی جیاوازی بۆ ساڵی دامەزراندنی میرنشینی حەسنەوەیهیی بەرزیکانی داناوە؛ لەلایەك ساڵی (٣٣٠ك)ی بۆ دامەزراندن و (٤٠٥ك) ی بۆ کۆتایی میرنشینەکە داناوە . مێژووی ئەم ماوەیەی حوکمداریی میرنشینەکەی لە حسێن حوزنی موکریانی وەرگرتووە ، کە حسێن حوزنی هیچ ئاماژەیەکی بەو سەرچاوەیە نەکردووە کە مێژووی (٣٣٠ك)ی بۆ ساڵی دامەزراندنی میرنشین داناوە؛ لەلایەکی ترەوە، هەر محەمەدئەمین زەکی وتوویە: وڵاتی شارەزوور لە ساڵانی (٤٠٠-٤٣٤ك) دا کەوتە دەستی حکوومەتی حەسنەوەیە، ئەمەیش ڕاست نییە. لەلایەکی تریشەوە وتوویە: ((لە ٣٤٨ هجریدا دوم حکومتی کورد [حسنویهـ برزیکانی] لە (جبال)دا تشکلی کردو تا ٤٠٦ دوامی کرد)) .
ئەم مێژووەی دوایی لەوانی تر ڕاستترە، چونکە بەپێی سەرچاوەکان دەرکەوتووە کە میر "حسنویه بن الحسین البرزیکانی" ساڵی (٣٤٨ك/ ٩٥٩ز) -دوای مردنی باوکی- دەسەڵاتی گرتە دەست؛ دوای مردنی "ونداد"ی خاڵیشی لە (٣٤٩ك)دا، توانیی قەڵ و موڵکەکانی بخاتە ژێر دەستی خۆی؛ لە (٣٥٠ك)یشدا قەڵ و موڵکی "أبو سالم دیسم بن غانم"ی خاڵەکەی تریی کەوتنە دەست . بەم جۆرە، "حەسنەوەیە کوڕی حسێن بەرزیکانی" بە دامەزرێنی ڕاستەقینەی میرنشینەکە لە دەوروبەری ساڵی (٣٤٨ك)دا دادەنرێ. لێرەدا دەبێ ئاماژەی پێ بدەم کە "الصدفی"ی مێژوونووس ساڵی (٣٥٠ك)ی بە مێژووی دامەزرانی میرنشینەکە داناوە .

محەمەدئەمین زەکی سەبارەت بە دوایین میری حەسنەوەیە، نووسیویە: ((دوایی امیری خاندانی حسنوی "ابو سالم دیسم کوری ابوالغنائم برای حسنوی، کە لەدوای وفاتی طاهر بە مودتیکی کەم لە آخر ملجأ کە قەلای کاسان [لە منطقی زهاو و نزیك بابایادگار بو] بو، محروم کرا)) . لە کتێبێکی تریدا بە هەمان مەبەستەوە وتوویە: ((میر "دیسم" کنیەکەی "أبو سلیم"ـەو کوری "ابوالغنائم"ی برای "حسنوی- حسنوی"، دوای مردنی میر "طاهر کوری هلال" بە ماوەیەکی کەم قەڵای (کاسان)یان لی سەند، کە دوایین پەناگەی ئەو میرەی حسنوی بو، ساڵی ٤٠٧هـ مردوە)) .
پێدەچێ خوالێخۆشبوو محەمەدئەمین زەکی بەگ ئەم باسەی لە (دائره المعارف الاسلامیه) وەرگرتبێ، بەبێ ئەوەی لە ڕاستیی ئەم زانیاریانەی دڵنیا بووبێ و بگەڕێتەوە سەر سەرچاوە ڕەسەن و بنچینەییەکانی مێژووی ئیسلامی سەبارەت بەم باسە. تەنانەت دەقەکەیش بە کەموکوڕییەوە وەرگێڕدراوە، لەبەر ئەوەی لە (دائره المعارف)دا ئەمەیە: (("ونداد"ی خاڵی "حەسنەوەیە"ی سەرۆکی لقی "العیشیه" [بەم شێوەیە هاتووە، ڕاستیەکەی "العیشانیه"یە] ساڵی (٣٤٩ك/ ٩٦٠ز) مردووە، "أبو الغنائم"ی برای [بەم شێوەیە هاتووە] ساڵی (٣٥٠ك/٩٦١ز) ئەو سەرۆکایەتیەی وەرگرت. پاش ماوەیەکی کورت، "أبو سالم دیسم"ی کوڕی —کە ئەویش لە وەچەی بنەماڵەکە بوو- قەڵای (قاسان) یا (قسنان) [قالان ؟]ی نزیکی (بابایادگار)ی (زەهاب)ی لێ سەندرا)) .

ڕاستیەکەی ئەوەیە: "أبو سالم -نەك أبو سەلیم-، دەیسەم "دیسم" کوڕی غانم -نەك کوڕی الغنائم-، کوڕی "ئەحمەد"، دواین وەچەی "العیشانیە" بووە، نەك دوا وەچەی بەنوو حەسنەوەیە، چونکە دوا وەچەی بەنوو حەسنەوەیە "بدر کوڕی طاهر کوڕی هلال" بووە. هەروەها برای "حەسنەوەیە" نەبووە، لەبەر ئەوەی "حەسنەوەیە" کوڕی "الحسین" و لە هۆزێکی ترە کە هۆزی بەرزیکانییە. بەڵام مردنی "أبو سالم دیسم" -وەك پێشتر ڕوون کرایەوە-، لە ساڵی (٤٠٧ك)دا نەبووە؛ وەك سەرچاوەکان وتوویانە: پاش مردنی "غانم"ی باوکی لە ساڵی (٣٥٠ك)دا، بە ماوەیەکی کورت لەسەر حوکم لابرا و "ابن العمید" قەڵای (قسنان-قنا)ی ناوچەی شارەزووری لێ سەند (وەك پێشتر لەم قەڵایە دواین). بەوپێیە، قەڵای (کاسان یا قاسان) نییە، لەبەر ئەوەی ئەم قەڵایە لە سنووری وڵاتی تورکستاندایە . لەگەڵ ئەوەیشدا، لە ناوچەی (زەهاب)یش نییە، وەك محەمەدئەمین زەکی بەگ پێی وابووە؛ (دائرە المعارف الاسلامیە)یش —بە گومانەوە- وای بۆ چووە کە ((ڕەنگە قسنان (قالان) بێ کە لە ناوچەی (زوهاب)ـە، بە بەڵگەی ئەوەی کە نیشانەیەکی پرسیار (؟)ی لەدوای (قالان)ـەوە داناوە.

محەمەدئەمین زەکی لە پەراوێزدا نووسیویە: ((ذیل ابن مسکویە، ئەلی لە تیکدانی بینی بدر و کورەکەیدا، وزیری مملکتی (ری)یش زور ئوینی کردوە)) . لێرەدا بە هەڵەدا چووە، چونکە وەزیر "الخطیر أبو علی" بوو، ئاگری دووبەرەکیی نێوان باوك "بەدر کوڕی حەسنەوەیە" و کوڕی "هیلال"ی خۆش کرد و "الوزیر الخطیر"یش خۆی ساڵی (٣٩٢ك/١٠٠٢ز) پەیوەندیی بە میری دەوروبەر و بە هیلال کوڕی "بەدر کوڕی حەسنەوەیە"ـەوە کرد و هانی دان بەرهەڵستیی "بەدر" بکەن. ئەم هاندانە هۆیەکی شەڕکەوتنەوەی نێوان باوك و کوڕ بوو. کەواتە "الوزیر الخطیر أبوعلی" خۆی هەوڵی ئەم دووبەرەکی نانەوەیەی داوە، نەك "أبو سعد بن أبی الفضل"، ئەمەیش لە ڕووداوەکانی ساڵی (٣٩٢ك)ی (تاریخ هلال الصابی) دا هاتووە . (ذیل مسکویە)ی "الروذراوری" کە لە ڕووداوەکانی ساڵی (٣٨٩ك)دا کۆتایی پێ هاتووە، ئەمەی تێدا نییە.

ئێمە سەبارەت بە دیاریکردنی ماوەی حوکمداریی میرنشینی (بنو عناز الشاذنجان)، دەڵێین: لە ساڵی (٣٨١ك/ ٩٩١ز)ەوە دەستی پێکرد و ساڵی ٥١١ك/١١١٧ز کۆتایی پێهات؛ وەك لە سەرچاوەکاندا هاتووە، سەد و سی ساڵی قەمەریی ڕەبەقی پێ چوو . بەڵام "منجم باشی" وتوویە تا ساڵی (٥١٠ك) بەردەوام بووە. سەرنج دەدرێ محەمەدئەمین زەکی لەلایەك وتوویە: حوکمداریی میرنشینەکە ساڵی (٣٨٠ك) دەستی پێ کردووە تا ساڵی (٥١٠ك) . لەلایەکی ترەوە، وتوویە: حوکمەکەیان هەر حەفتا ساڵ بەردەوام بووە، واتە تا ساڵی (٤٥٠ك)، ئەمەیش هەڵەیە. لەگەڵ ئەوەیشدا پێبەپێ ماوەی حوکمی بە ڕاستی دیاری کردووە و وتوویە: ساڵی (٣٨١ك) دامەزراوە و تا ساڵی (٥١١ك) ماوەتەوە . محەمەدئەمین زەکی ساڵی مردنی میر "أبو الفتح محمد بن عناز"ی بە (٤٠٠ك) داناوە ، بەڵام سەرجەمی سەرچاوەکان لەسەر ئەوە کۆکن کە ساڵی (٤٠١ك) بووە.

شارەکانی میرنشینی بەنوو عەنناز دووچاری هێرش و پەلاماری "علاء الدولە بن کاکویە" بوون، کە ساڵی (٤١٤ك/ ١٠٢٣ز) دەستی بەسەر (هەمەدان و دینەوەر و شاپوور خواست)دا گرت و چەند ناوچەیەکی تری داگیر کرد و کوشتارێکی زۆری لە دانیشتوانیان کرد؛ دواتریش چوو بۆ شەڕی میر "حسام" الدولە أبو الشوك فارس"ی میری بەنوو عەنناز، بەڵام کاتێك ئەم زانیی ناتوانێ بەرەنگاری ببێتەوە، داوای لە "مشرف الدولە"ی میری بوەیهییەکانی حوکمداری بەغدا کرد ناوبژییان بکات و لە شەڕی "ابن کاکویە" بیپارێزێ، ئەویش داواکەی بەجێهێنا و "ابن کاکویە" بەبێ شەڕ گەڕایەوە .

محەمەدئەمین زەکی وتوویە: "أبو الشوك" توانیی بەرەنگاریی هێرشەکانی "علاء الدولە" بکات، تا لە کۆتاییدا ناچار بوو دینەوەر بەجێ بیهێڵێ. لە جێیەکی تردا وتوویە: "علاء الدولە" کاتێك بە زەبروزەنگی "مشرف الدولە"ی زانی بەسەر بەغداوە، (دینەوەر)ی چۆڵ کرد. ئەم زانیارییە لای "ابن الاثیر" و "ابن خلدون" و "الدیاربکری" نییە و هیچیان ئاماژەیان بەوە نەداوە کە "أبو الشوك" توانیویە بەرگریی هێرشەکانی "علاء الدولە" بکات. وا دەردەکەوێ محەمەدئەمین زەکی پشتی بە قسەی "حوزنی موکریانی" بەستبێ ، کە وتوویە: "أبو الشوك" ماوەی هەشت ڕۆژی تەواو بەردەوام مایەوە و بەرگریی لە دینەوەر کرد. ئێمە ناتوانین پشت بە قسەکانی حسێن حوزنی ببەستین. دەریش کەوتووە "علاء الدولە" بە داوای "مشرف الدولە"، نەك لە ترسی هێز و زەبری "مشرف الدولە"، لە شەڕی "أبو الشوك" گەڕاوەتەوە.

پەلاماری غوزە تورکەکان بۆ سەر هەمەدان و ئەسەدئاباد و دینەوەر لە ساڵی (٤٣٠ك/ ١٠٣٨ز)دا بووە، وەك "ابن الاثیر" وتوویە ، نەك ساڵی (٤٢٠ك) کە محەمەدئەمین زەکی بە هەڵە بۆ ساڵی هێرشەکەی دیاری کردووە، ئەویش پشت بەستوو بە کتێبەکەی "الدیاربکری" ، کە بە هەڵەدا چووە و (٣٢٠ك)ی داناوە بۆ ساڵی ڕووداوەکە. "جەمیل ڕۆژبەیانی"ش لە باسی "شەرەفنامە"دا ، ئەو زانیارییەی لە محەمەدئەمین زەکی وەرگرتووە و کەوتووەتە هەمان هەڵەوە.

میر سورخاب (نەك سەرخاب)ی برای "حسام الدولە أبو الشوك فارس بن محمد" و باوکی "أبو العسکر"، هەڵوێستی بەرامبەر بە ژێردەستەکانی لە کوردانی لوڕ خراپ بوو. لەبەر ئەوە ئەوان و کۆمەڵێك لە سوپاکەی "سورخاب"یان

دەستگیر کرد و دایانە دەستی "ابراهیم ینال"ی برای "توغرول بەگ- طغرلبط"ی سەلجووقی، کە ساڵی (٤٣٩ك/ ١٠٤٧-١٠٤٨ز) چاوێکی هەڵکۆڵی. أبو العسکر، "سوعدا- سعدی"، نەك "سەعدی- سعدی"ی بەو مەرجە ئازاد کرد لە هەوڵی ئازادکردنی "سورخاب"ی باوکی بدات .

محەمەدئەمین زەکی لەم بارەیەوە ئەمەی لە "الدیاربکری" وەرگرتووە و وتوویە: ((بە معاونتی کوردی ئەو ناوە، باوکی اسیر کردو ناردی بۆ ابراهیم ینال و ئەم امیری سلجوقیە چاوی "سرخاب"ی هەلکولی و "سعدا"ی بەرەڵا کرد، سعدا (حلوان)ی زەوت کرد)) .

ئەم زانیارییە هەڵەیە و هیچ دەقێکی (دەستخەت یا لەچاپدراو)ی مێژوویی نییە پشتیوانیی بکات، چونکە ئەگەر باوکی دیل بکردایە و بیناردایە بۆ یننال، بۆچی "أبو العسکر"، سوعدە کوڕی ئەبول شۆك فارسی لە گرتووخانە بەرەڵڵا کرد، بۆ ئەوەی سوعدا لای "ئیبراهیم یننال" هەوڵی ئازادکردنی سورخابی باوکی بدات، لە کاتێکدا ساڵی (٣٣٩ك) لە زینداندا مابووەوە و ساڵی (٤٢٢ك) بەرەڵڵا کرا؟

باسەکەی محەمەدئەمین زەکی لەبارەی حکوومەتی (بەنوو عەنناز- بنوعناز)ەوە، چەند هەڵەیەکی لە ناوی کەس و شوێندا تێدا هاتووە: قەڵای (ڕاوندین) بە هەڵە بە شێوەی (ڕادندین) هاتووە. چیای (شعران- شەعران) (کە بە چیاکانی هەورامان وتراوە)، بە شێوەی (نیشپی) نووسراوە. "أبو الشوق"، ڕاستیەکەی "أبو الشوك"ـە. "حسام الدولە" ناسناوی "أبو الشوك فارس"ـە، نەك "حسام الدین". (سوعدا- سعدی) نەك شێوەی (سعدی- سەعدی)، (بەندەنیجین: مەندەلیی ئێستا) نەك (بەندەنچین، یا بەندەنیجان) وەك لە هەموو سەرچاوەیەکی ڕەسەندا هاتووە.

سەبارەت بە ناوی ڕاستەقینەی میرنشینی کوردیی (بەنوو عەننازی شاذنجانی)، دەبینین محەمەدئەمین زەکی زۆرجار لە (خولاصەی تاریخی کورد و کوردستان) دا بە شێوە ڕاستەکەی (بەنوو عەنناز) هێناویەتیەوە، بەڵام لەو باسەدا کە بۆ میرنشینەکەیی تەرخان کردووە بە (بەنوو عەننان) ناوی بردووە ، ئەویش هەر پشت بەستوو بە کتێبەکەی "الدیاربکری". میرنشینەکە لای مێژوونووسان بە چەند شێوەیەك ناوی هێنراوە، ناوی دامەزرێنەکەشی وا هاتووە: "أبوالفتح بن عیار" لە (تأریخ الحکماء) و (تاریخ گزیدە) و (شەرەفنامە) دا، "عنان" لە (المنتضم) و (مرآە العبر) و (العبر) دا، لەم سەرچاوە ڕەسەنانەیشدا بە شێوەی (عەنناز- عناز) هاتووە: مێژووی "هلال الصابی" (کە ساڵی ٤٤٨ك مردووە)، (تاریخ دولە آل سلجوق)ی "عمادالدین الاصفهانی" (م ٥٩٧ك)، (اختصار)ی البنداری، (الکامل) ی "ابن الاثیر" (م ٦٣٠ك)، (تلخیص مجمع الآداب) کە بەناوی "ابن الفوطی"یەوە (م ٧٢٣ك) بڵاو کراوەتەوە.

بەڵام "محەمەد عەلی عەونی" لە (شەرەفنامە) دا پێی وایە (عەییار- عیار) ڕاستترە و لە هەڵەوە دوورە، لەبەر ئەوەی -بە قسەی ئەو- بەڵگە و بۆچوونەکانی تر لە لێکۆڵینەوەکەدا ڕاستیی ئەو شێوەیە دەردەخەن، بەبێ ئەوەی ئەو بەڵگانەی روون کردبێتەوە. "جەمیل بەندی ڕۆژبەیانی"ش پشتگیریی ئەم بۆچوونەی کردووە . بەڵام ئێمە پێمان وایە بنچینەی ناوەکە (عەنناز- عناز)ە، کە وا دیارە لە (العنز) -واتە

**دوو خولی ئەنجوومەنی نوێنەرانی عێراق (سەردەمی پاشایەتی)**
**ڕیزی یەکەم: ٤- جەمال بابان ١٤- سەبری حاجی عەلی ئاغا**
**ڕیزی دوو: ٤-داود حەیدەری ٥- حازم شەمدین ئاغا ٧- ئیسماعیل بەگی ڕەواندزی**
**١١- محەمەدئەمین زەکی ١٥- محەمەد بەگی جاف ١٨- مەعروف جیاوك**

بزن- وەرگیراوە، لەسەر کێشی (غەننام- غنام). ئەم بۆچوونەیشمان لەبەر ئەوەیە کە کۆنترین سەرچاوەی بڕواپێکراو و هاوچەرخی ڕووداوەکانی ئەم میرنشینە، وەك پێشتر ئاماژەمان بۆ کردن: مێژووی "الصابی"، (الکامل)ی "ابن الاثیر" و (تاریخ دولە آل سلجوق)ی "الاصفهانی" و (تلخیص مجمع الآداب)ی "ابن الفوطی"، زۆر پشت پێبەستراون. ئەوی ئەم بۆچوونەیشمان زیاتر دەچەسپێنێ کە (عەنناز- عناز) ناوی ڕاستەقینەیە، ئەوەیە کە "ابن نباتە السعدی"ی شاعیر (م ٤٠٥ك) کە هاوزەمانی حوکمی ئەم میرنشینە بووە، شیعرێکی داشۆریی بۆ "ابوالفتح بن عناز"ی میری بەنوو عەنناز نووسیوە و بە ترسنۆك و لە شەڕدا بەزیوی داناوە و وتوویە:

تحمل کرد الشــــــــاذجان أمورها
غلاما کغصـن البان الناعم الرطب
مشـــــــتق عناز من العنز فی الوغی
وجدك ماشتق الحراب من الحرب١٤٧
ج

ئەمە زیاتر بۆچوونەکەی ئێمە پەسند دەکات. ناوی (الآنازیین، العنازیین) لە وتاری بڵاوکراوەی (حلقە مفقودە من تاریخ شهرزور)ی "مەحموود ئەحمەد محەمەد"دا هاتووە . لەبەر ئەوە پێمان وایە (عیار) یا (عنان) هەڵەی ڕوونووسکەرەوەن و لە (عەنناز- عناز) وەرگیراون.

"بابا طاهیری هەمەدانی"ی ناسناوی (عوریان)ی شاعیری کورد، مێژووی لەدایکبوون و مردنی بە تەواوی نەزانراوە، بەڵام بەپێی ئەو چاوپێکەوتنەی نێوان "طوغرول بەگ" و "بابا طاهیر"، کە لە هەمەدان بووە و "الرواندی" گێڕاویەتیەوە، بۆمان دەردەکەوێ مردنەکەی پاش ساڵی (٤٤٧/ ١٠٥٥ز) بووە، لەبەر ئەوەی "طوغرول بەگ" لەو ساڵەدا بە (هەمەدان)دا تێپەڕیوە بەرەو عێراق . ئەمە هەڵەی "ڕەضا قولی خان"ی لە دیاریکردنی مێژووی مردنی "بابا طاهیر"دا خستووەتە ڕوو، کە لە کتێبەکەیدا (ریاظ العارفین) باسی کردووە و وتوویە ساڵی (٤١٠ك/ ١٠١٩ز) کۆچی دوایی کردووە. هەروەها مێژووە مەزەندەکراوەکەی "میرزا مەهدی خان"یش بۆ لەدایکبوونی، کە وتوویە ساڵی (٣٢٦ك/ ٩٣٥ز) لەدایك بووە ، بە هەڵە دادەنێ. بەڵام ئەوی "ژۆکۆفسکی" نووسیویە گوایا باباطاهیر لەگەڵ "ئیبن سینا"دا (م ٤٢٨ك/ ١٠٣٥) قسەی کردووە، پێچەوانەی ئەو باسە نییە کە "الرواندی" سەبارەت بە گفتوگۆی باباطاهیر و طوغرول بەگ هێناویەتیەوە، لەبەر ئەوە دەگونجێ ڕاست بێ . "محەمەدئەمین زەکی" (کە بە هەڵە ساڵی ٤٠١ك/١٠١١ز-ی بۆ مێژووی کۆچی دوایی باباتاهیر داناوە) و "عەلائەددین سەجادی" ش پشتیان بەو مێژووە هەڵانە بەستووە کە "ڕەضا قولیخان" و "میرزا مەهدی خان" بۆ لەدایکبوون و مردنی "باباطاهیر"یان داناوە. دکتۆر کەمال فوئادیش پێیوایە باباطاهیر لەنێوان ساڵانی (٣٩١-٤٢٧ك/ ١٠٠٠- ١٠٥٦ز)دا ژیاوە . بەڵام -وەك پێشتر بینیمان- ڕاستتر وایە بڵێین: دوای ساڵی (٤٤٧ك/ ١٠٥٦ز) کۆچی دوایی کردووە، چونکە ئەو ساڵە لە ژیاندا بووە.
محەمەدئەمین زەکی، کە ناوی شاری (حدیاب)ی هێناوە، بە هەڵە بە (مووسڵ)ی داناوە. "محەمەدعەلی عەونی"ی وەرگێڕی (الخلاصە)یش (لە پەراوێزدا) پێی وایە لە (الحدباء)ەوە وەرگیراوە: ((لإحدیاب دجلە عند الموصل)). واتا: ڕووباری دیجلە لەو شارە لای داوە . ئێمە دەڵێین: ناوچە (نەك شار)ی حەدیاب لە ناوی (أدیاب یا أدیابین) وەرگیراوە و وتراوە سەر بە ناوچەی بادینانە، تا نزیکی هەولێر درێژ دەبێتەوە. وشەی (الهذبانیە) بەم شێوەیە لە سەرچاوەی ئیسلامیدا هاتووە و بە تیرەیەکی گەورە وتراوە کە نیشتەجێی ناوچەی (أدیابین) بووە. لەوانەیە وشەی (الهذبانیە) لە (أدیابین) وەرگیراوە.

محەمەدئەمین زەکی بە هەڵە بۆی چووە و وای زانیوە "فضلون" (میری بنەماڵەی شەددادیی کوردی کە فەرمانڕەوای هەرێمی -أران- جۆرجیای ئێستا بووە) برای "محمد بن شداد الکردی" بووە نەك کوڕی. سەرچاوەکان باسی ئەوە دەکەن کە "محمد بن شداد الکردی" ساڵی (٣٤٤ك/٩٥٥ز) کۆچی دوایی کردووە و "فضلون"ی کوڕی جێی گرتووەتەوە و بووە بە فەرمانڕەوای وڵاتی (ئەرران- أران)، دوایی جڵەوی حوکمی داوەتە دەستی "لشکری"ی برای کە کوڕە گەورەی "محمد بن شداد الکردی"یە .

لە کۆتاییدا، بە پێویستم زانی هەڵە مێژووییەکانی ناو نووسینی محەمەدئەمین زەکی بەگ سەبارەت بە مێژووی کورد لە سەردەمی ئیسلامیدا، تەنیا لە بواری پسپۆڕیی خۆمدا، وردتر بڵێم لە بواری مێژووی (حەسەنوەیهیی بەرزیکانی و بەنوو عەننازیی شاذنجانی و میرنشینی ڕەوادی و ئەتابەکییەی ئەحمەدیلی)، کە هەردوو نامەی ماجستێر و دکتۆراکەم لەو بارەیەوەن، دیاری بکەم. ئەم هەڵە مێژووییانەم دەست نیشان کردوون، چونکە نووسینەکانی محەمەدئەمین زەکی بەگ بوونەتە سەرچاوەیەکی بنەڕەتی بۆ هەر کەسێك بیەوێ زانیاری لەسەر مێژووی کورد و کوردستان وەربگرێ، تا ئاستی زانستیی نووسینەکانی ئەو زانا خوالێخۆشبووە گەورەیەی کوردیش بەرز بکەمەوە.

# مۆدێلی ناسیۆنالیسمی
# ”محەمەدئەمین زەکی بەگ“ و
# پڕۆژەی کۆمەڵایەتی لە کوردستان

خالید تەوەکولی

محەممەد ئەمین زەکی بەگ

**پێشەکی:**

مەبەستی سەرەکیی ئەم وتارە، تاووتوێکردنی ئەم دوو پرسیارەی خوارەوەیە:

* پرسی سەرەکیی محەمەد ئەمین زەکی بەگ لە ژیانی سیاسی و کۆمەڵایەتیدا چی بووە؟

* دەربڕین، بۆچوون و هەڵسوکەوتی سەبارەت بەم پرسە چۆن بووە؟

محەمەد ئەمین زەکی بەگ (١٨٨٠-١٩٤٨)، وەکوو چالاکێکی سیاسی و تەنانەت کەسایەتییەکی پایەبەرزی کارگێڕی، بە شێوەی ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆ کاریگەرییەکی زۆری بووە لەسەر بزووتنەوەی سیاسی و کۆمەڵایەتی و فەرهەنگیی کورد. ڕەنگە ئێستا کە کورد کیان و سامانێکی سیاسیی تایبەت بە خۆی هەیە، زیاتر لە هەمیشە نیازمان بە بیر و

بەرنامەکانی بێ. بەڵام خوێندنەوەی بیر و بۆچوونی کەسایەتییەکی ناوداری وەکوو ئەمین زەکی بەگ زۆر دژوارە، ئەگەر ئاگاداریمان سەبارەت بە سەردەم و کەشوهەوای کۆمەڵایەتیی ئەو نەبێ. کە وابوو بەر لە هەموو شتێك بە پێویستی دەزانم ئاوڕێکی خێرا بدەمەوە لە سەردەمی ژیانی ئەمین زەکی بەگ و لەو چوارچێوەدا ئەندێشە و بیر و بۆچوونەکانی بخوێنمەوە.

**(١) کۆڵۆنیالیسم**2: لە سەرەتاکانی سەدەی بیستەمدا، تەنیا نزیکەی (٥٠) وڵاتی سەربەخۆ لە سەرانسەری دونیادا بەدی دەکران. بەشێکی زۆر لە وڵاتانی ئەفریقا، ئاسیا، ئۆستڕالیا و ئەمریکای لاتین لە ژێر دەسەڵاتی وڵاتانی ئیمپریالیستیی ئەورووپاییدا بوون و سەربەخۆیی سیاسییان نەبوو. ئەو ساڵانە دیاردەی کۆڵۆنیالیسم پەرەی سەندبوو و شێوازی سەرەکیی سیستەمی جیهانی و پێوەندیی نێونەتەوەیی بوو. ئیستیعمار دوو ئاکامی دژ بەیەکی لێ دەکەوێتەوە: لەلایەکەوە غارەت و ماڵوێرانی و لەناوچوونی ژێرخانی ئابووریی کۆڵۆنییەکان، لە هەمان کاتدا یەکگرتوویی و هۆشی نەتەوەیی لەناو چین و توێژە جۆراوجۆرەکانی کۆمەڵگەدا گەشە دەستێنن. لە کۆتایی هەمان سەدەدا، زۆربەی ئەو وڵاتانە یا بە هۆی شەڕی چەکداری، یان پیلانی وڵاتانی سەرکەوتووی جەنگی یەکەم و دووەمی جیهانییەوە، یا لە ئاکامی تێکۆشانی ڕێبەرانی نەتەوەیی، یان بە شێوەی دانوستان و تەوافوق، سەربەخۆیی نەتەوەییان بە دەست هێناو بوون بە دەوڵەت- نەتەوە[3]. لە ئەنجامدا پێکهاتەی سنوورەکانی جیهان، گۆڕانێکی جیددی و بەربڵاوی بەسەردا هات، بە جۆرێك کە لە ماوەی نزیك بە بیست ساڵدا، زیاتر لە سەد وڵاتی تازە پێك هاتن و بوون بە ئەندامی نەتەوە یەکگرتووەکان. (بولییت، ١٣٨٣:٢٨١)

کوردستان لەم ساڵانەدا لەژێر دەسەڵاتی دوو ئیمپراتۆری عوسمانی و ئێراندا بوو، هەردووکیان تووشی قەیرانی سەخت و دژوار ببوون. لە لایەکەوە ئیپراتۆریەتی عوسمانی ڕووبەڕووی پەرەسەندنی خەباتی نەتەوەکانی باڵکان ببووەوە و دووچاری شکست هاتبوو. دوابەدوای جەنگی یەکەمی جیهانی، بەشێکی تر لەو وڵاتانەی ژێر دەسەڵاتی عوسمانی، کە زۆربەیان عەرەب یا فرەنەتەوە و فەرە فەرهەنگ بوون، یەك لەوان عیراق، سەربەخۆییان بەدەست هێنا. لە هەمان کاتداو بۆ پاساودانەوەی ئەم شکستە، بەشێکی زۆر لە لاوان و ڕۆشنبیرانی عوسمانی پەنایان بردە بەر توندڕەویی ناسیۆنالیسم و هەوڵ و تەقەلا بۆ زیندووکردنەوەی شانوشکۆی لەدەستچووی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی و پێشکەوتنی وڵات. بۆ ئەم مەبەستە، گۆڕانی داب و نەریت و ڕەواجدان بە فەرهەنگ و ناوەندو دامەزراوەی ڕۆژئاواییان بە شێوەیەکی بەربڵاو دەس پێکرد.

لەلایەکی تریشەوە، ئێران لەگەڵ کێشەگەلی جۆراوجۆری ناوخۆیی و دەرەکی دەستەویەخە بوو. بەشێکی زۆری خاك و سامانی نەتەوەیی لەلایەن وڵاتانی ئەورووپاییەوە بەسەردا سەپابوو. هەمان کات، ڕۆح و هۆشی نەتەوەیی و ئایینیی لەلایەکەوە و بیری ڕۆژئاوایی و پێشکەوتن و نوێخوازی[4] لەلایەکی ترەوە لەناو بەشێکی زۆر لە خوێندەواران و ڕۆشنبیران، لە هەڵکشان و گەشەکردندا بوون. ئەمەیش حاکمانی قاجاری ئێرانیی نیگەران و دەرباری شاکانی تووشی قەیران کردبوو.

جیا لەمانەی کە ئاماژەیان پێکرا، نابێ ئەم نوکتە زۆر گرینگەیش فەرامۆش بکەین: ئەم سەردەمە، چەندین جووڵانەوەی بەرچاوی گەورەی سیاسی، ڕۆشنبیری و سەربازی لەلایەن ڕێبەرانی سیاسی، ئاینی و عەشیرەتییەوە دەبیندرێ، کە کاریگەریی زۆریان لەسەر مێژووی سیاسیی گەلی کورد هەبووە. بۆ نموونە، دەتوانین ئاماژە بکەین بە شۆڕشی شێخ عوبەیدوڵڵا، شێخ مەحموود، سمکۆ و... کە ڕۆح و هۆشی نەتەوەیی قووڵیان تێدا بەدی دەکرا. مەبەستی سەرەکیی گشتیان، دامەزراندنی دەوڵەتی سەربەخۆی کوردی و ڕەهایی لە دەسەڵاتی تورك و عەجەم بوو. ئاکامی ئەم بزووتنەوانە، بە هێز و بەرجەستەبوونی شوناسی[5] کوردی، بە واتایەکی تر کوردایەتی بوو بە نیسبەتی شوناسی ئاینی، عەشیرەتی و خێڵەکی. لە هەمان کاتدا کورد، چەمکی "ئێمە" و "ئەوان"ی بەرهەم هێنا و لەسەر بنچینەی ئەم جیاوازییە لەگەڵ گەلانی تردا پەیوەندیی دامەزراند و هەڵسوکەوتی کرد.

١ *خوێندکاری دکتۆرای بواری کۆمەڵناسی لە زانکۆی ئەسفەهان.

2- Colonialism.
3- Nation-state.
4- Modernization.
5- Others.

دیارە ئەو وڵاتانەی کە تازە سەربەخۆیی بەدەس دەهێنن، بە گشتی ڕووبەڕووی دوو گرفتی کۆمەڵایەتی دەبنەوە: ستەمکاری (ئیستبداد) و گەندەڵی، کە زۆربەی ئەو وڵاتانە ئێستاش گیرۆدەی ئەو گرفتانەن و نەیان توانیوە چارەسەری گونجاویان بۆ بدۆزنەوە. ئەمانە باعیس بوون کە بەشێکی زۆریان هەروا دواکەوتوو بمێننەوە و نەتوانن هەنگاوی جیددی بەرەو گەشەسەندن و دیموکراسی هەڵگرن و کێشە سیاسییەکانیان لە ڕێگەی دیالۆگ و ئاشتییەوە چارەسەر کەن، یا بە شێوەیەکی بەرابەر، داهات و سەرمایەی ئابووری بەسەر خەڵك و ناوچەکاندا دابەش کەن. ئاکامی پەیڕەوکردنی ئەم ڕەوشتانە، زیادبوونی کێشەی سیاسی و سەربازی و ڕادەی توندوتیژی و گۆڕانی یەك لە دوای یەکی حکوومەتەکان لە ڕێی کودەتا و شۆڕشی جەماوەرییەوە بووە.

**(٢) شۆڕشی مەشرووتە لە ئێران:** سەردەمی شاکانی قاجار، ئێران چەندین گۆڕانکاریی بنەڕەتی بە خۆیەوە بینیبوو. حکوومەتی پاشایەتی و بە گشتی ئیستبداد، تووشی قەیران هاتبوو؛ هوشیاریی نەتەوەیی لەناو خەڵك و ڕۆشنبیراندا، لە گەشەسەندندا بوو؛ چەمك و زاراوەی نوێ و تازە هاتنە ئاراوە (گباگبایی، ١٣٨٦:١٣). لەدوای هەرەسهێنان و شکستە یەك لەدوای یەکانی ئەرتەشی ئێران لە شەڕ لەگەڵ ڕووسدا، فەرماندە ئێرانییەکان، دیبان و زانییان جیهان گۆڕانی بەسەردا هاتووە و ئێران لە گوێی کەروێشکدا خەوی لێ کەوتووە. "عەبباس میرزا" پەیی بە دواکەوتوویی ئێران و پێشکەوتوویی ڕۆژئاوا برد، بۆیە فەرمانی دا چەند کتێبێکی وەکوو: مێژووی پێتری مەزن، شکۆداریەتی و تێـــك ڕووخانی ئیمپراتۆریەتی ڕۆم، وەرگێڕنە سەر زمانی فارسی. لە تەوریزەوە چاکسازی[6] و گۆڕانکاری دەستی پێکرد و ڕێگەی خۆش کرد بۆ پەرەسەندنی شارستانێتی و دامەزراوەی ڕۆژئاوایی و فەرهەنگی. بۆ ئەم مەبەستەی، بەر لە هەموو شتێك چاکسازیی لە هێزی سەربازییەوە دەستپێکرد. دوای ئەمە ڕووی کردە پیشەسازی لە تەوریزو چەند شاری تر، کارخانەی دروست کرد. جیا لەمانە، هەوڵی زۆری دا تا خوێندکار ڕەوانەی وڵاتانی ئەوروپایی بکات (بهنام، ١٣٧٥:٢٣).

ڕۆشنبیرانیش بەش بەحاڵی خۆیان کەڵك لەم کەشوهەوا وەردەگرن و هەوڵ دەدەن بۆ ئاراستەکردنی بیرۆکەی جیاواز و نوێ لە کۆمەڵگەدا. سەفەرنامە نووسین پەرەی سەند و زۆربەی ئەو کەسانەی وا سەردانی ئەوروپایان کردبوو، بیرەوەری و ڕوانینی خۆیانیان کرد بە کتێب و لەچاپیان دا. برێکی تر لە ڕۆشنبیران، ڕەهەندە جۆراوجۆرەکانی بیرۆکەی کۆمەڵایەتی، سیاسی و فەلسەفی وڵاتانی ڕۆژئاوایان لا گرنگ بوو و بە فارسی بڵاویان کردنەوە و لەم سۆنگەیەوە هەوڵی گۆڕانی کۆمەڵگەکەیان دا. کتێب گەلی زۆر دەربارەی ئازادی، پێشکەوتن، عەدالەت و... نووسرا. بە ئاشکرا ڕەخنە لە شا و لە دەسەڵات دەگیرا و داوایان لێ کرد سەروەریی یاسا قبووڵ بکات و ملکەچیی یاسا بسەلمێنێ. تەنانەت شا بۆ خۆیشی ئەم ڕەخنەیەی قبووڵ کرد و داوای لە ڕیفۆرمیستەکان کرد دەست بەکار بن بۆ بونیادنانی حکومەتێکی بەرپرس. لەم سەردەمەدا، لافاوی نووسین و وەرگێڕان و لە چاپدانی کتێب، تەواوی ئێرانی گرتەوە. وای لێ هات مامۆستایانی ئاینی و ڕێبەرانی دینیش بیروڕای خۆیان سەبارەت بەو بیرۆکە نوێیانە و هەروەها کێشەکانی کۆمەڵ دەربڕن و بڵاوی بکەنەوە (گباگبایی:٢٩٤-٢٩٥٩).

بەشێکی زۆر لەم ڕۆشنبیرانە دەرسیان لە زانکۆکان وتەوە و بۆ یەکەم جار بە شێوەی زانستی وتار، کتێب و نامیلکە بۆ خوێندن ئامادە کرا. ئەم کتێب و نووسراوانە لە پەرلەمانی یەکەمدا بوون بە سەرچاوەی سیستمی نوێی یاسا. بەم شێوەیە زەمینەی شۆڕشی مەشرووتە ئامادە کرا و بە پشتیوانیی تەواوی توێژ و چینەکانی کۆمەڵ، سەرکەوتوویی بەدەست هێنا و ساڵی ١٩٠٦ی زاینی، مۆزەفەرەددین شا فەرمانی مەشرووتەی دەر کرد. لەمەولا هەوڵ بۆ دامەزراندنی حکوومەتی یاسا و سنووردارکردنی دەسەڵات درا. دوایی نزیك بە ٢ مانگ پەرلەمانیش کەوتە کار.

**(٣) بیرۆکەی ناسیۆنالیسم:** ناسیۆنالیسم یەکێك لەو بیرۆکە مۆدێرنانەیە کە کاریگەریی زۆری لەسەر مێژووی جیهان هەبووە. ئەم بیرۆکەیە لە ئەوروپا و سەرەتاکانی سەدەی نۆزدەدا سەری هەڵدا و بووە گوتاری زاڵی ئەو سەردەمە. دەربارەی "میللەت"[7] یا "نەتەوە"، پێناسەی زۆرمان لەبەر دەستدایە. لای زۆربەی خەڵك، میللەت بریتییە لە گرووپێك کە فەرهەنگ، خاك و بەرژەوەندی هاوبەش بە یەکەوەی گرێ داون (بولییت:٣٢٢). ئەگەرچی تاکە پێناسەیەك بۆ ناسیۆنالیسم بەدی ناکرێ، بەڵام زۆرجار وەکوو خۆشەویستی و هۆگریی میللەت و شوناسی میللی یان هۆشی نەتەوەیی پێناسە کراوە. "گیدێنز"[8] لەسەر ئەم باوەڕەیە کە نەك تەنیا بەشێکی زۆر لە بزاڤە کۆمەڵایەتییەکانی هاوچەرخ بزووتنەوەی ناسیۆنالیستی بوون، بەڵکو ناسیۆنالیسم لە سەرەتای قەرنی بیست و یەکەمدا، هەر زیندووە و تەنانەت لە گەشەسەندنیشدایە (گیدنز، ١٣٨٦:٦٣٩).

ناسیۆنالیسم، لە باری مێژووییەوە، چوار ڕەهەندی جیاوازی هەیە:

* ناسیۆنالیسمی دژ بە ئیستیعمار؛ ئەم ناسیۆنالیسمە بۆ خەبات دژ بە ئیستیعمار و بۆ ئازادیی وڵات بەکار هاتووە.

* ناسیۆنالیسم بۆ پێشکەوتنی نەتەوەیی و پێناسەکردنی شوناسی نەتەوەیی؛ ئەم ناسیۆنالیسمە لە وڵاتانێکی دواکەوتوو بەکار هاتووە کە لەوانەیە کۆلۆنی نەبووبن، یا وڵاتانێك کە تازە سەربەخۆییان بەدەست هێناوە، بەڵام خاوەنی ڕابردوویەکی پڕشکۆ بوون. کەڵك لەم

6- Reform.
7- Nation.
8- Giddens, Anthony.

ناسیۆنالیسمە وەرگیراوە بۆ پێشکەوتنی نەتەوەیی، هاوکاریی گشتی، کۆششی میللی، پێناسەکردنی شوناسی نەتەوەیی و بەهێزکردنی ژێرخانی ئابووری.

* ناسیۆنالیسمی دژ بە سەرمایەداریی نەتەوەیی و نێونەتەوەیی؛ ئەم ناسیۆنالیسمە لە دەورانی جەنگی سارد و ڕەواجی کۆمۆنیسمدا، لەناو ڕۆشنبیرانی جیهانی سێیەمدا، بۆ خەبات دژ بە سەرمایەداریی نەتەوەیی و نێونەتەوەیی بەکار هاتووە.

* ناسیۆنالیسمی دژ بە جیهانیبوون[9]؛ لەم ساڵانەدا کە چەمکی جیهانیبوون ڕەواجی سەندووە، ئەم ناسیۆنالیسمە لە باری فەرهەنگی و ئابوورییەوە، دژ بە پەرەسەندنی جیهانیبوون ڕادەوەستێ (ادوین رونیس، ١٣٨٣:٦-١٠).

بیرمەندان باس لە چەند جۆر ناسیۆنالیسم دەکەن. بۆ نموونە، تەقسیمی ناسیۆنالیسم بە دوو جۆری مەدەنی[10] و قەومی[11] یەکێك لەو تەقسیم بەندیانەیە. ناسیۆنالیسمی قەومی جەخت لەسەر دابونەریتی فەرهەنگی، زمان، ئاین، شێوە ژیانی هاوبەش دەکات. بەڵام ناسیۆنالیسمی مەدەنی جەخت لەسەر تایبەتمەندیی یاسایی- عەقڵانیی وڵات و بەرابەریی تاکەکان لە کۆمەڵدا دەکات (اسمیت و وست، ١٣٨٣:٦٩٢).

لە بارێکی تریشەوە، ناسیۆنالیسم پۆلێن دەکرێ و بە دوو جۆری ناسیۆنالیسمی چاکسازیییانە[12] و جودابیخواز[13] وێنا کراوە. لە ناسیۆنالیسمی چاکسازییانەدا، کێشە لەسەر سنووری نەتەوەیی نییە و تەنانەت ڕێزیشی لێ دەگرن، بەڵکو تەنیا خەبات لە پێناوی گۆڕان و چاککردنی حکومەت و شێوازی بەڕێوەبردنی کۆمەڵدا بە شێوەیەکی هەنگاو بە هەنگاو دەکرێ. بەڵام ناسیۆنالیسمی جوداییخواز، چوارچێوە و سنووری نەتەوەیی بە ڕەسمییەت ناناسێ، کەوابوو بۆ شکاندن و گۆڕینی سنوورەکان و دژ بە شوناسی نەتەوەیی خەبات دەکات. لە هەمان کاتدا هەوڵ دەدات بۆ بونیادنان و دامەزراندنی وڵات و شوناس و سنووری سەربەخۆ (برویلی، ١٣٨٣: ٤٩٨-٥٠٠). پێویستە بوترێ کەڵك لە ناسیۆنالیسم تەنیا بۆ بەدەستهێنانی سەربەخۆیی وەرنەگیراوە، بەڵکوو بەشێکی زۆر لە ڕێبەرانی وڵاتانی جیهان بۆ گەشەسەندن و پێشکەوتنی نەتەوەیی کەڵکیان لێ وەرگرتووە.

**(٤) گەشەکردنی زانست:** یەکێك لە بنەما سەرەکییەکانی گەشە و پێشکەوتنی ڕۆژئاوا، گەشەکردنی زانستە. زانستە کۆمەڵایەتییەکان لە ئاخری سەدەی نۆزدەدا سەریان هەڵدا و بوون بە پارمەتیدەری ڕۆژئاوا بۆ دەسەڵاتی زیاتر بەسەر کۆمەڵدا و ڕاڤە و چارەسەرکردنی کێشە کۆمەڵایەتییەکان. یەکێك لەو زانستانە کۆمەڵناسی[14] بوو.

ئۆگوست کۆنت (١٨٥٧-١٧٩٨)، کارڵ مارکس (١٨٨٣-١٨١٨)، ئیمیل دورکهایم (١٩١٧-١٨٥٨)، ماکس ویبەر (١٨٦٤-١٩٢٠)، کەسانێکن بەردی بناغەی زانستی کۆمەڵناسییان داناوە. بیری پێشکەوتن و چارەسەرکردنی ئەو گرفتانەی بە هۆی گۆڕانکارییەکانی شۆڕشی پیشەسازییەوە دروست ببوون، کەڵکەڵەی سەرەکیی هەموویان بووە. لەگەڵ ئەمەیشدا بە شێوەیەکی جیددی هەوڵیان بۆ دانانی مێتۆدۆلۆژیی تایبەت بە کۆمەڵناسی داوە. کۆنت، وەکوو باوکی کۆمەڵناسی و پۆزیتیویستێك لەسەر ئەم باوەڕە بوو کە جیاوازییەکی ئەوتۆ لە نێوان میتۆدی زانستە کۆمەڵایەتییەکان و زانستە سروشتییەکاندا بەدی ناکرێ، کەوابوو دەتوانین و دەبێ بۆ بەزانستکردنی کۆمەڵناسی کەڵك لە میتۆدی ئەوان بۆ لێکۆڵینەوەی کۆمەڵایەتی وەرگیرێ. بە ڕای کۆنت، توێژەر نابێ بە هیچ جۆرێك بایەخە کۆمەڵایەتییەکانی[15] دەخاڵەت بدات لە توێژینەوەکانیدا و دەبێ بێلایەنی ڕەچاو بکات. بەڵام بە پێچەوانەوە ماکس ویبەر، پێی وایە ئەو دوو زانستە جیاوازیی زۆریان بەیەکەوە هەیە، کەواتە دەبێ میتۆدەکانیشیان جیاواز بن. دیاردە کۆمەڵایەتییەکان تایبەتمەندیی خۆیان هەیە، کە ئەمان لە دیاردە سروشتییەکان جیا دەکاتەوە. هەروەها بە پێچەوانەی کۆنتەوە، دەیوت ناکرێ و ناتوانین بایەخەکان و بەها کۆمەڵایەتییەکان وەلا نێین، بایەخەکان بە تایبەت لە کاتی هەڵبژاردنی بابەتی توێژینەوەدا، دەخاڵەتی تەواو و ڕۆڵی گرنگیان هەیە، بەڵام کاتی ئەزموونکردنی بابەتەکە، دەبێ کۆکردنەوەی زانیاری و سەنگاندنی گریمانەکان[16] بایەخەکان وەلا نێین (سروش، ١٣٧٤: ٢١٩).

**ئەمین زەکی بەگ و**

**ئەندازیاری ناسیۆنالیسمی کوردی:**

هەروەك پێشتر باسم کرد، دوای جەنگی یەکەمی جیهانی، لە سەراسەری دنیا و بە تایبەت ڕۆژهەڵاتی ناویندا، لەلایەکەوە بیر و ڕۆحی نەتەوەخوازی پەرەی سەند و لەلایەکی دیکەوە سەدان قەوارەی سیاسیی وەك دەوڵەت- نەتەوە و وڵاتی تازە هاتنە ئاراوە، کە هەر کامەیان خۆی بە خاوەنی مێژوو، فەرهەنگی جیاواز، زمانی تایبەت و جوگرافیای سەربەخۆ دەزانی. لەم کەشوهەوایەدا و لە دەوروبەری

9- Goobalization.
10- Civic Nationalism.
11- Ethnic Nationalism.
12- Reform Nationalism.
13- Separatist Nationalism.
14- Sociology.
15- Social Value
16- Hypothesis.

کوردستان، ئەم ڕەوتە زیاتر لە جێگەی تر بەدی دەکرا، تەنانەت چەند هەوڵ و تەقەلای جیددی، بەڵام ناکام، لەلایەن کوردیشەوە بە ئامانجی سەربەخۆیی بەڕێوە چوو. ئەمین زەکی بەگ، ئاگاداری مێژووی کورد بووە و لە نزیکەوە گۆڕانکارییەکانی جیهان و ناوچەی دیوە. هەروەها لە نزیکەوە شاهێد بووە کە ئەم وڵاتە تازە پێگەیشتووانە، هیچ کامیان هەڵگری مێژوو، فەرهەنگ و کەسایەتیی کورد نین و جیاوازیی زۆریان لەگەڵ کورددا هەیە. لێرەوە پرسی سەرەکیی ئەمین زەکی بەگ سەر هەڵدەدات و چەمکی "ئێمە" و "ئەوان" دروست دەبێ.

((ئێمە کێین؟))، ئەمە گرنگترین پرسیارێکە کە زەین و ئەندێشەی ئەمین زەکی بەگی بە خۆیەوە خەریك کردووە، بە جۆرێك تەواوی ژیانی زانستی و سیاسیی خۆی تەرخان کردووە بۆ وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارە.

لە یەکەم لاپەڕە و یەکەم پەرەگرافی کتێبی "خولاصەیەکی تەئریخی کورد و کوردستان"دا، ئاوا ئاماژە بە چۆنیەتیی سەرهەڵدانی ئەم پرسیارە هەرە گرنگە لای خۆی دەکات: ((لە دوای ئەمە کە لە جێگەی تەعبیری عموومیی "عوثمانی" لەفظی "تورك" و "تۆرانی"، لە تورکییەدا باوی سەند، بە طەبیعەت، وەکوو ئەفرادی میللەتەکانی تر، منیش لەناو ئەو کۆمەڵەدا، غیرەتی خۆم چاکتر حس کرد و غورووری قەومی مەجبووری کردم لە هەموو فورصەتێکدا، ئەم حیسسەی خۆم ئیظهار بکەم، ﴿بەڵام﴾ دەرحەق بە ئەصل و تەئریخی قەومەکەم هیچم نەئەزانی، چونکە تا ئەو وەقتە نە لە مەکاتیبدا فکرێکی وامان درابوویە و نە لە دواییشدا ضەروورەتی تەدقیقی تەئریخی کوردمان دیبوو وە کەلیمەی "جامیعەی عوثمانلی" ئەعصابی قەومییەی هەموومانی تا دەرجەیەك خاو کردبووەوە بارها ئەم سوئالەم لە خۆم ئەکرد: "قەومی کورد" لە چ نەتەوەیەکە، چیی بەسەر هاتووە؟)) (ئەمین زەکی بەگ، ١٣٥٠:١).

چەند چەمکی نوێ لە وتەکانی ئەمین زەکی بەگ دا بەرچاو دەکەوێ و ئاماژە بەو گۆڕانکارییانە دەکا کە دوای کۆتایی پێهاتن بە دیاردەی کۆلۆنیالیسم و جەنگی یەکەمی جیهانی دونیای گرتبووەوە. چەند نوکتەی سەرنجراکێش لەم پەرەگرافەدا هەیە:

* یەکەم: دەڵێ تەعبیری گشتیی عوسمانی لەناو دەچێ و تورك و تۆرانی ڕەواج پەیدا دەکا. بەم جۆرە باس لەو ئاڵوگۆڕە دەکا کە بەسەر ئیمپراتۆریەتی عوسمانی و ئەو شوناسەدا کە بەرهەمی هێنابوو، هاتووە.

* دووەم: غیرەت و غورووری قەومی دەجوولێتەوە، چونکە پەی بە جیاوازیی خۆی لەگەڵ تورکدا دەبا. لێرەوە چەمکی "ئێمە" و "ئەوان" لای ئەمین زەکی بەگ بەرجەستە دەبێتەوە و دروست دەبێ.

* بەر لەم گۆڕانکارییانە و بەر لە دروستبوونی ئەم چەمکانە، سەبارەت بە مێژووی کورد کارێکی ئەوتۆ نەکراوە و کەمتر کەسێکیش

١- محەمەدئەمین زەکی ٢-؟ ٣- جاهید ٤- سانیحە ٥- ماجد ٦- فاتمە

بە پێویستی زانیوە لەم بارەوە دەست بەکار بێ.

* هۆکاری دەربەست نەبوونی شوناسی کوردی بە نیسبەتی مێژووی خۆیان، دەگەڕێتەوە بۆ شوناسی گشتیی عوسمانی کە سەرتر و بەهێزتر بوو لە شوناسی قەومی. بەڵام دوای تێکشکان و ڕووخانی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی و بە دوای ئەودا لەناوچوونی شوناسەکەی، لێرەوە باس لە بەدیهاتن و سەرهەڵدانی ناسیۆنالیسمی کوردی و چۆنیەتیی ئەندازەکردنی ئەو ناسیۆنالیسمە دەکرێ و ئەم پرسیارە دێتە ئاراوە کە: ((قەومی کورد لە چ نەتەوەیەکە و چیی بەسەر هاتووە؟)).

ئەمین زەکی بەگ، بۆ وەڵامدانەوەی بەم پرسیارە هاوکات لە دوو لاوە دەست بەکار دەبێ:

ئـ) پێناسەکردنی شوناسی کورد: لەلایەکەوە هەوڵ دەدات بنەمایەك دابڕێژێ بۆ پێناسەکردنی شوناسی کوردی. نابێ ئەم نوکتەیە فەرامۆش کەین کە پێناسەکردن و گشتێتی بەخشین بە شوناس، پێداویستییەکی سەرەکیی پرۆژەی "نەتەوەسازی"یە. ئەمین زەکی بەگ، بەو زەروورەتە دەزانێ و بە شێوەیەکی زانستیانە زەمینە بۆ پێناسەکردنی شوناسی کوردی لەبار دەکات. هەڵبەت دەبێ ئەوە لەبەرچاو بگیرێ ڕۆڵی شوناسی نەتەوەیەکانی تر وەکوو هاندەرێك، ئەوی هان داوە تا هەوڵ و کۆششی خۆی تەرخان بکات بۆ پێناسەکردن و بەرهەمهێنانی بنەمایەك بۆ شوناسی کوردی کە خەسڵەت و توخمی تایبەت بە خۆی هەن.

پرسیاری قەومی کورد لە چ نەتەوەیەکە، هەمان پرسیارە کە لە کاتی پێناسەکردنی "شوناس"دا دێتە ئاراوە. شوناس، بریتییە لە وەڵام گەلێك بۆ پرسیاری ((من کێم؟)) دێنە ئاراوە. ئەم تایبەتمەندییانەی لە وەڵامی ئەم پرسیارەدا ئاماژەیان پێ دەکەین، لە لایەکەوە تەعبیر لە جیاوازییەکانمان لەگەڵ ((ئەوی دی))دا دەکات و لەلایەکی ترەوە " لە یەکچوون"مان نیشان دەدات.

ئەمین زەکی بەگ، بۆ دارشتنی بناغەیەکی پایەدار بۆ شوناسی کوردی، جەختی زۆری لەسەر "مێژوو" کردووە و بە نووسینی کتێبی مێژووی "خولاصەیەکی تەئریخی کورد و کوردستان"، "کوردی بەناوبانگ"، ڕاڤەکردنی زمانی کوردی لە چەند وتارداو هەروەها نووسین بە زمانی کوردی، ئاماژە بەو توخمە سەرەکییانە و ئەو ڕابردووە هاوبەشە دەکات کە ئێمە وەکوو کورد بە یەکەوە دەلکێنن، لە هەمان کاتدا جیاوازییەکانیشمان لەگەڵ ((ئەوی دی))دا دەست نیشان دەکات. بەم جۆرە دەزانین لە کوێوە هاتووین، چیمان بەسەر هاتووە، هەروەها بە هۆی ئاگاداری لە مێژوو، ناودارانی کورد و زمانی کوردی، خۆمان بە کەمتر نازانین لە گەلانی تر، جا کە وابوو دەتوانین غورووری قەومیی خۆمان ڕاشکاوانە نیشان بدەین.

پێم وایە ئەمین زەکی بەگ، زۆر هۆشیارانە بۆ تێگەیشتن لە ئامانجی خۆی کە پێناسەکردنی شوناسی کوردی بووە، زمانی کوردی بۆ نووسینی مێژوو و بەشێکی تر لە کتێب و وتارەکانی بەکار دێنێ. تەنانەت ڕەخنە لە شەرەفخان دەگرێ کە بۆچی کتێبەکەی بە کوردی نەنووسیوە: ((مەلا ئیدریس بتلیسی، کتێبی "هشت بهشت"ی بە فارسی بۆ سوڵـــطان بایەزید نووسی، زەرەری نەبوو، چونکە تەئریخێکی عوسمانی بوو. بەڵام بە عەقیدەی من شەرەفخانی بتلیسی، نەئەبوو "شەرەفنامە" کە تەئریخێکی کوردە بە فارسی بنووسێ)) (هەمان:٤٠).

بۆ قوتابخانەکانیش جەختی کردووە لەسەر خوێندن بە زمانی کوردی و لەم بارەوە دەڵێ: ((لازمە کە هەموو دەرسەکانی تر بە کوردی بخوێنرێ و ئەهەمییەتێکی زۆر بە زمانەکەمان بدەین و سەعی بۆ ڕێکخستنی ئوصووڵ و قەواعیدێکی سووك و دائیمیی بۆ بکەین تا ببێتە زبانێکی ڕێکوپێك و زبانێکی تەدریس و تەدوین، لەگەڵ ئەمەشدا ئەم مەقصەدە ئەساسییەش بۆ ئێمە نابێتە مانیعی فێربوونی بەعضـــێ زبانی تر کە دائیمەن بە کەڵکمان دێ و فائیدەی لێ ئەبینین)) (سەرجەمی بەرهەمی ئەمین زەکی بەگ، بەرگی یەك:٢٠٠٥، ١٧).

ئەمین زەکی بەگ، ئاگاداری بایەخی ڕۆڵی زمان لە بەرهەمهێنانی شوناس هەیە، بەڵام بۆچوونی ئەو بۆ زمان تەنیا لەم سۆنگە و لەم ڕوانگەیەوە نییە. ئەو، وەکوو ئامرازی گەیاندنیش سەیری زمان دەکات و ئەم باوەڕەی لە نووسینی مێژووی کورد و کوردستانیشدا پەیڕەو کردووە و ئوسووڵ و قەواعیدێکی سووك و ئاسانی بەکار هێناوە و بە جۆرێك نووسیویەتی کە خەڵك لێی حاڵی بن. هەروەها ئەمین زەکی بەگ، کەڵکەڵەی نۆژەنکردنی زمانیشی هەیە، بۆیە پێشنیار دەکات تەدریس و تەدوینی زانستی سەردەم، لە هەمان کاتیشدا "سەعی بۆ ڕێکخستنی" زمان، نابێ ببنە ڕەواجی بیری بێ نیازی بە زمانەکانی تر کە دەتوانن بە کەڵکمان بێن.

ئەمین زەکی بەگ، زانیویەتی ئەگەر تەنیا لە ڕوانگەی ناسیۆنالیسمەوە سەیری زمان بکرێ، ئەوە تەواوی هەوڵەکان تەرخان نەکرێ بۆ پاراستنی زمان و دۆزینەی وشەی کۆن و ڕەسەنی کوردی و تەنیا نەبێ بە ئامرازێك بۆ جیاوازی لە زمانەکانی تر و لە ئاکامدا پێش نەگرن بە وشەی نارەسەن و تەنانەت داهێنانی وشەی نوێ. بەڵام زمان فۆنکسیۆنی[17] تریشی هەیە کە یەکێك لەوان ((پەیوەندی)) گرتنە. ئەگەر بەپێی ئەم فۆنکسیۆنە، بەرنامە بۆ زمان دابڕێژن، بەر لە هەموو شتێك، توانایی زمان بۆ پەیوەندی گرتن، جێگەی گرنگی پێدانە پەرە دەستێنێ و پەیوەندیی گەلانی جیهان و نێودەوڵەتی زۆرتر دەبێ. کەوابوو دەبێ ئەم تایبەتمەندییەی زمان زیاتر لەبەرچاو بگیرێ.

دەتوانین بڵێین ئەمین زەکی بەگ بە پێی ناسیۆنالیسمی مەدەنی و چاکخوازانەیشی داوای یارمەتی لە ڕۆشنبیران و خوێندەواران وەکوو دوو توێژی مۆدێرن دەکات کە دەتوانن توانایی و فۆنکسیۆنی زمان بۆ پەیوەندی گرتن، بەرهەمهێنان و گواستنەوەی زانست و ئەزموونی گەلانی تر، دەوڵەمەند و بەرجەستە بکەنەوە.

---

17- Function.

نوکتەیەك کە لێرەدا سەرنجراکێشە میتۆدی مێژوونووسیی "ئەمین زەکی بەگ"ە کە روانگەی ئەوەمان سەبارەت بە زانست و بنەماکانی شوناس بۆ دەردەخات. ئەگەرچی بە گشتی مێتۆدی مێژوونووسییەکەی تۆزێك کاڵ وکرچە، بەڵام لە هەمان کاتدا رادەی راستی و هوشیاریی ئەمین زەکی بەگمان نیشان دەدات. راشکاوانە و بێ پێچ و پەنا، ((غورووری قەومی و غیرەتی)) کوردانە بە هاندەری خۆی دەزانێ بۆ نووسینی مێژووی کورد و کوردستان و سەرهەڵدانی پرسی ئەندازیاریی ناسیۆنالیسمی کوردی. کەچی لە کاتی نووسیندا ((غورووری و غیرەت)) فەرامۆش دەکات و دەخاڵەتی نادات لە کۆکردنەوەی فاکت و دۆکیومێنتدا بۆ نووسینی مێژووی کوردستان و پەیرەوی حس و خەیاڵ نابێ. لێرەوە ئیتر نووسینی مێژووی بە شێوەیەکی راست و دروست و زانستی لا گرنگە و بە هەر قیمەتێك کوردایەتی ناکات. لەم بارەوە دەڵێت: ((نووسینی تاریخی کورد بە شێوەیەکی راست و دروست، ئەرکی لاوانی ئیمڕۆ و سبەینێیە، لەم خصووصەوە زۆر تکایان لێ ئەکەم، کە وەکوو بەعضـــی موحەررینی کوردیی دوێنێ و ئیمڕۆ، لە تەئریخ نووسیندا، تابیعی حیس و خەیاڵ نەبن، لە خۆیانەوە هیچ هەڵنەبەستن و حادیثاتی تاریخییە نەگۆڕن بۆ ئەو بەحثانەی کە ئەینووسن. ئەگەر وەها نەکەن، رەنجیان بە زایە ئەچێ، نووسینەکەیان قیمەتێکی عیلمیی نابێ.)) (ئەمین زەکی بەگ: ٦).

ئەمین زەکی بەگ دوو قوناغ بۆ توێژینەوە لەبەر چاو دەگرێ، قۆناغی هەڵبژاردنی بابەت، کە توێژەر نەتوانێ بە پێی حیس و خەیاڵ یا بەها کۆمەڵایەتی و تاکە کەسییەکانی، بۆ توێژینەوە بابەت هەڵبژێرێ. قۆناغی دووهەمی توێژینەوە، قۆناغی کۆکردنەوەی دۆکیومێنت و راڤەکردن و لێکدانەوەی ئەو فاکتانەیە کۆی کردوونەتەوە. بەشێك لە کۆمەڵناسان و مێژوونووسانیش، بۆ نموونە ماکس ویبەر، بۆ توێژینەوە پەیرەوی وەها قۆناغ بەندییەکیان کردووە.

لەم بوارەدا ئەوەی جێی سەرنج بێ، ئەوەیە ئەمین زەکی بەگ، دیدێکی رەخنەگرانەی هەبووە بۆ دەقە مێژووییەکان و ئەو ئامار و فاکتانە کە بەر دەستی کەوتوون. لە خۆوە پشت نابەستێ بەو ئامارانەی لەلایەن دەزگاکانی کارگێڕییەوە بڵاو کراونەوە و بە دوری نازانێ لەبەر ئامانجی سیاسی برێکیان دەستکاری بکرێن. بۆ وەرگرتنی زانیاریی زیاتر، کۆکردنەوەی ئاماری قەومی بە پێویست نازانێ و لە هەمان کاتدا ئاماژە بەو گرفتانە دەکات کە ئێستاش بەشێکی زۆر لە وڵاتانی جیهانی سێیەم هەیانە. لە لایەکەوە لەبەر ئامانج و بەرژەوەندی سیاسی، ئامارەکان بە شێوەیەکی زانستی و دروست و هەمەلایەنە و بەپێی دیاردە جۆراوجۆرەکانی کۆمەڵایەتی کۆ و بڵاو ناکرێنەوە. لەلایەکی تریشەوە، بە هۆی گەندەڵی و لاوازیی دەزگا کارگێڕییەکانەوە، ئاماری دروست و بڕواپێکراو کۆ ناکرێتەوە. کەوابوو توێژەرێکی راستەقینە کە پرەنسیپە زانستییەکانی لا گرنگە، ناتوانێ پشت بەم ئامارانە ببەستێ و بە شێوەیەکی رەخنەگرانە کەڵکیان لێ وەردەگرێ.

ب) ئەندازیاری کۆمەڵایەتی: ئەمین زەکی بەگ لەلایەکی تریشەوە هەوڵ و تەقەلای بووە بۆ بەرهەمهێنان و ئەندازەکردنی ناسیۆنالیسمی کوردی. بەڵام نەك وەکو نووسەر، بیرمەند و هۆگری زانست، بەڵکوو وەك نوێنەری خەڵك لە مەیدانی خەبات و چالاکیی سیاسیدا، ئەمجار دەستبەکاری ئەندازیاری کۆمەڵایەتی دەبێ.

"پووپێر"[18] (١٩٠٢-١٩٩٤)، باس لە دوو شێوە و دوو جۆر ئەندازیاریی کۆمەڵایەتی دەکات:

١. ئەندازیاریی کۆمەڵایەتیی هەنگاو بە هەنگاو یان لەسەرخۆ.

٢. ئەندازیاریی کۆمەڵایەتیی یۆتۆپیایی.

لە ئەندازیاریی کۆمەڵایەتیی هەنگاو بە هەنگاودا، شێوازی لەسەرخۆ و شێنەیی بۆ گۆڕانکاری لەناو کۆمەڵدا رەچاو دەکرێ. ئامانجی سەرەکیی ئەم ئەندازیارییە، کەمکردنەوەی دەرد و رەنجی خەڵکە، بۆ بەدیهێنانی ئەم مەبەستەیش، هەنگاو بە هەنگاو بەرەو پێش دەچن. پلان و بەرنامەی سادە و ساکار دادەرێژن و کارێك ناکەن خەڵك تووشی زەرەر و زیانی گەورە بن. بۆ نموونە، پووپێر ئاماژە بە چاکسازی لە بواری پەروەردە و بارهێناندا دەکات. بەڵام لە ئەندازیاریی یۆتۆپیاییدا هەوڵ دەدرێ بۆ خەبات و گەیشتن بە ئارمانێکی گەورە و بەدیهێنانی خەون و خەیاڵی نادیار (پووپێر، ١٣٧٧: ٣٥٧).

هەڵبەت ئەمین زەکی بەگ بەر لە پووپێر ژیاوە، جا ئەگەر شێوەی کار و چالاکییە سیاسییەکەی لەبەر چاو بگرین، بۆمان دەردەکەوێ کە سوود لە ئەندازیاریی کۆمەڵایەتی هەنگاو بە هەنگاو وەردەگرێ، بەتایبەت لە بواری خەبات بۆ پێشکەوتنی نەتەوەیی و بۆ کەمکردنەوەی دەرد و رەنجی کۆمەڵ، بەر لە هەموو شتێك جەختێکی زۆری لەسەر چاکسازی لە بواری پەروەردە و بارهێنان، وەکو فاکتەرێکی هەرە گرنگ هەیە. ئەمین زەکی بەگ، باسی لە خەون و خولیای گەورە و نادیار نەکردووە و ئیددیعای ئەوەی نەکردووە کە دەتوانێ لە رێگەی سیاسییەوە بەهەشتمان لەسەر زەوی بۆ دروست بکات، تەنانەت چەندین جار باس لە خۆپاراستن لە ئیفرات و تەفریت دەکات.

دروستکردنی قوتابخانە یەکێك لەو هەنگاوانەیە ئەمین زەکی بەگ بە شێوەیەکی لەسەرخۆ بۆ مۆدێرنیزاسیۆنی[19] کوردستان هەڵی گرتووە. سەیری کەن چۆن باس لەم هەنگاوەی دەکات: ((خۆشتان دەزانن کە ئەو وەقتە کە ئێمە بووین بە وەکیلتان، لە هەموو سلێمانیدا

---

18- Popper, Kari Romimund.

19- Modernization.

تەنیا یەك مەكتەب هەبوو، ئەو مەكتەبەش زۆر زۆر نوقصانیی هەبوو، لە لامان بە تەواوی مەعلووم بوو كە مەسئلەی مەعاریف بۆ لیواكەمان لە پاش ئەمنییەت و ئاسایش لە هەموو شتێك زیاتر لازم و موهیمە و بەم فكرە لەلایەكەوە سەعی بۆ ئیكمالی نەواقیصی مەكتەبەكە كراو لەلایەكی ترەوە هەوڵ بۆ چەند مەكتەبێكی تازە درا)) (سەرجەمی بەرهەمی ئەمین زەكی بەگ:١٥).

ئەمە یەكەم هەنگاوە كە هەڵی گرتووە، بەڵام هەنگاوی كۆتایی نییە و قوتابخانەیش تەنها دار و بەرد و خشت و چیمەنتۆ نییە و پێداویستی تری هەیە. پێویستە كەڵك لە مامۆستای زانا و پسپۆڕیش وەرگیرێ، بۆیە دەڵێت: ((لەسەر هەموو لایە لازمە كە سەعی و هیممەت بۆ پێگەیاندن وەیا دۆزینەوەی موعەللیمی چاك بكرێ، بە هەر نەوعێ دەبێ عیللاجی تەواوكردنی صونفەكانی مەكتەبی ثانەوی بدۆزرێتەوە، چونكی پێشكەوتنمان بەو مەكتەبەوەیە و وەكو ئێستا، بۆ ئیستیقبالی مەعاریفی لیواكەمان موصیبەتێكی زۆر گەورە و ضەرەری زۆرمان پێ دەگەیێنێ)) (هەمان سەرچاوە:١٧).

ئەمین زەكی بەگ، هەنگاو بە هەنگاو بەرەو پێش دەڕوات و بەم كارەی وادەی بەهەشت بە كەس نادات، بەڵكو تەنیا دەیەوێ بەشێك لە دەرد و ئازارەكانی كۆمەڵ و نوقصانیی قوتابخانەكان كەم كاتەوە. جەخت لەسەر وشەگەلێكی وەك زەرەر، موصیبەت، نوقصانی ,... جێی سەرنجە و تا ڕادەیەكی زۆر نیشاندەری شێوەی ئەندازیاریی كۆمەڵایەتیی ئەمین زەكی بەگە. بەڵام زەرەرەكان چین؟:

١. تەلەبە و قوتابی ناتوانن بچن بۆ ئەوروپا و ئەمەریكا، كەوابو ناتوانن لەگەڵ زانستی سەردەم ئاشنا بن.

٢. مەحرووم‌بوونی قوتابی و لاوی كورد لە خوێندنی باڵا لە بەغدا.

ئەمین زەكی بەگ، خوێندنی باڵا و ئاشنایی لەگەڵ زانستی سەردەمدا، لەسەر ئاستی مۆدێرنیزاسیۆن و پێشكەوتنی نەتەوەیی بە كاریگەر و زۆر گرنگ دەزانێ، بۆیە وا بەپەرۆشەوە باس لەو خەسارە گەورە دەكات كە لەوانەیە قوتابیی كورد بە هۆی نەبوونی قوتابخانەوە دووچاری بێ. دیاردەی ناردنی خوێندكار بۆ وڵاتانی ئەوروپایی و ئەمریكا لە سەردەمی ژیانی ئەمین زەكی بەگدا زۆر باو بووە و زۆربەی ڕێبەرانی نەتەوەیی كە هۆگری چاكسازیی وڵاتەكەیان بوون، ئەم كارەیان بە ئەنجام دەگەیاند.

بەڵام بۆ دروستبوونی قوتابخانە هەنگاوی تریش پێویستە، هەر بۆیە دوای چارەسەركردنی كێشەی مامۆستای كورد، باس لە چارەسەركردنی كەموكوورییەكی تر دەكات كە نەبوونی كتێبە بە زمانی كورد. لەگەڵ مامۆستایان و ڕۆشنبیرانی كورددا قسە دەكات و هانیان دەدات بۆ نووسین یا وەرگێڕانی كتێب بۆ سەر زمانی كوردی و دەڵێت: ((ئەم وەضعییەتە گەورە و موبارەكە بە طەبیعەت بەشی مونەوەرەكانمانە و دەبێ كەمێ زۆر لەگەڵ ئەمەشدا خەریك بن و بە موحەقیقی بیزانن كە ئەم نەوعە خدمەتەیان بۆ وەطەن و میللەتەكە زۆر بە فائیدە ئەبێ و بەمە ئیحتیاجێكی زۆر گەورەی مەكتەبەكانمان ڕەفع دەكەن)) (هەمان سەرچاوەی پێشوو:٢٠).

یەكێكی تر لەو فاكتەرانەی كە ئەمین زەكی بەگ هەوڵی بۆ داوە و دەتوانێ ببێ بە بنەمایەك بۆ پێشكەوتن، مەسئەلەی ڕێگەی سلێمانی بووە و كارێكی كردووە تا پارەی پێویستی بۆ تەرخان بكرێ. ئەمین زەكی بەگ، لێرەیش پەیڕەوی لە پێداویستییەكانی مۆدێرنیزاسیۆن و ئەندازیاریی هەنگاو بە هەنگاو دەكات و دەڵێت: ((مەسئەلەی ڕێگە بۆ سلێمانی، چە لە خصووصی ئیعادە و ئیدامەی ئەمنییەت و ئاسایش و چە لە جیهەتی تەسهیلاتی هاتوچۆ و چە بۆ تیجارەت، زۆر زۆر بە ئەهەمییەت بوو... هەموو ئەیزانین كە ڕێگەیەكی شەمەندەفەر مەملەكەتەكەی ئێمە ئیحیا ئەكاتەوە)) (هەمان سەرچاوە:٢١).

جیا لەمانە، ئەمین زەكی بەگ، دابینكردنی خەتی تەلغراف، تەلەفۆن و مەركەزی پۆستەیش فەرامۆش ناكات و لە بەرنامەكانیدا بۆ مۆدێرنیزاسیۆنی سلێمانی و كوردستان ڕەچاویان دەكات. لەگەڵ ئەمانەیشدا، هەوڵی داوە بۆ دروستكردنی بیناو دامەزراوەی نوێی وەك شارەوانی، پارك و سەیرانگە، شەقامی تازە... هتد.

هەروەكو پێشتریش باسمان كرد، ئەو وڵاتانەی تازە سەربەخۆیی بە دەست دەهێنن، ڕووبەڕووی دوو كێشەی ستەمكاریی سیاسی و گەندەڵیی كارگێڕی دەبنەوە. ئەمین زەكی بەگ بە ئەزموون پەی بەم كێشانە بردبوو و لە ژیانی سیاسی و تەنانەت زانستیی خۆیدا، دوور لە ئیستبداد و گەندەڵی بووە و زۆر ژیانێكی ئەخلاقیی هەبووە. بۆ نموونە، دەتوانین ئاماژە بەو نامەیە بكەین كە لە كۆتایی وەزیفە و ئەركی نوێنەرایەتیی بەرێزەوە بۆ خەڵكی نووسیوە و لە حیساب و كیتاب و ئیشوكاری خۆی ئاگاداریان دەكاتەوە. لە هەمان كاتیشدا گوزارشت لە جۆرێك لە بارهێنانی سیاسی لەم نامەیەدا بەدی دەكرێ، كاتێك باس لە ئەركە جۆراوجۆرەكانی نوێنەر دەكات. لەم نامەیەدا بە شێوەیەكی شەفاف و

- پەروەردە و بارهێنان
- ناردنی خوێندكار بۆ وڵاتانی پێشكەوتوو
- چاكسازیی بینا و ڕێگەوبان
- هەست بە بەرپرسی كردن و خۆپاراستن لە گەندەڵی و ئیستیبداد
- چاكسازیی ئامرازی پەیوەندیگرتن (تەلگراف، تەلەفۆن، پۆست)

ئاشکرا ئاماژە بە تەواوی ئەو پوول و پارەیە دەکات کە لەم ساڵانەدا سەرفی کردووە. ئەمین زەکی بەگ بەم نامەیە نیشانی داوە خۆی بە بەرپرس دەزانێ لەبەرانبەر خەڵکدا، هەست بە بەرپرسیاریەتی، هەم دەبێتە هۆی دووری هەم لە ئیستبداد و هەم لە گەندەڵی.

ناسیۆنالیسم

پێناسەکردنی شوناسی

هەوڵ بۆ پێشکەوتن (موهەندیسی کۆمەڵایەتیی هەنگاو بە هەنگاو)

ئەمین زەکی بەگ، لە تەواوی ئەم بەرنامەیەدا، بەپێی ئەندازیاریی کۆمەڵایەتیی هەنگاو بە هەنگاو هەڵسوکەوتی لەگەڵ کێشە کۆمەڵایەتییەکاندا هەبووە و بە وردی زانیویەتی چی دەکات و نەتیجەی کار و تێکۆشانەکەی دەبێ بە چی. وەکو کوردپەروەرێکی گەورە و دڵسۆز بەشێکی زۆری لە ژیانی خۆی بۆ پێشکەوتنی کوردستان تەرخان کردووە، بەڵام هەرگیز تابیعی حیس و خەیاڵ و دووچاری توندرەوی نەبووە. نەرمو لەسەرخۆ و بە متمانەوە کار و بەرنامەکانی خۆی بەرەو پێش بردووە، هەتاکو بتوانێ بەش بەحاڵی خۆی کەمێك لە دەرد و ئازار و مەینەتییەکانی خەڵك کەم کاتەوە. مۆدێلی ئەندازیاریی ناسیۆنالیسم لای ئەمین زەکی بەگ بەم شێوەی لای خوارەوە بووە:

**سەرچاوە:**


١. روئیس، لستر ادوین ج (١٣٨٣): دائره المعارف ناسیونالیسم، زیر نظر الکساندر ماتیل، ترجمه فریبرز مجیدی، کتابخانه تخصصی وزارت امور خارجه، تهران، چاپ اول.
٢. اسمیت، فیلیپ و وست، برد (١٣٨٣): دائره المعارف ناسیونالیسم، زیر نظر الکساندر ماتیل، ترجمه محبوبه مهاجر، کتابخانه تخصصی وزارت امور خارجه، تهران، چاپ اول.
٣. برویلی، جان ج (١٣٨٣): دائره المعارف ناسیونالیسم، زیر نظر الکساندر ماتیل، ترجمه محمد حسن اهویی، کتابخانه تخصصی وزارت امور خارجه، تهران، چاپ اول.
٤. بولییت، ریچارد (١٣٨٣): تاریخ قرن بیستم، محمد رفیعی مهرآبادي، دفتر مطالعات سیاسی وبین المللی، تهران، چاپ اول.
٥. بهنام، جمشید (١٣٧٥): ایرانیان و اندیشه تجدد، نشر و پژوهش فرزان روز، تهران، چاپ اول.
٦. پوپر، کارل (١٣٧٧): جامعه باز و دشمنان ىن، عزت الله فولادوند، انتشارات خوارزمی، تهران چاپ دوم.
٧. محمد امین زکی بگ (١٣٥٠)، کورد و کوردستان، سەیدیان، مەهاباد، چاپی یەکەم.
٨. سدیق، صالح (٢٠٠٥): سەرجەمی بەرهەمی محەمەد ئەمین زەکی بەگ، چاپی یەکەم، بنکەی ژین، سلێمانی، ٢٠٠٥.
٩. سروش، عبدالکریم (١٣٧٤): درسهایی در فلسفه علم الاجتماع (روش تفسیر در علوم اجتماعی)، نشر نی، تهران، چاپ اول.
١٠. گباگبایی، جواد (١٣٨٦): نظریة حکومت قانون در ایران، انتشارات ستوده، تبریز، چاپ اول.
١١. گیدینز، آنتونی (١٣٨٦): جامعه شناسی، حسن چاوشیان، نشر نی، تهران، چاپ اول.

# چەپکێک نامە و یادگاری
# نێوان ئەمین زەکی بەگ و پیرەمێرد

مستەفا ساڵح کەریم

پتر لە ٣٠ ساڵ هاورێیەتی و دۆستایەتی و برایەتی و خۆشەویستی لە نێوان "ئەمین زەکی بەگ"ی ئەدیب و مێژوونووس و "پیرەمێرد"ی شاعیردا بەردەوام بوو. ئەمین زەکی نموونەی مرۆڤی ڕاستگۆ و هێمن و نەرمونیان و بێ وەی بوو، بەڵام پیرەمێرد لە دووتوێی دڵیدا جێگایەکی تایبەتی بۆ تەرخان کردبوو. سەرەڕای ئەو ڕێزلێنان و خۆشەویستییەش جێی هیوا و ئاواتی بوو، هەروەك جێی شانازیشی بوو، هەر دێڕێکی کە دەینووسی لای پیرەمێرد دەبووە خشتێ بۆ هەڵچنینی دیواری مێژووی کورد و گەزگەز باڵای پێدەکرد.

ئەم دوو پیاوە هەڵکەوتووانە لە شاری سلێمانی لە گەرەکێکدا پێگەیشتن، لە ئەستەنبووڵیش هاورێی هەمیشەیی بوون، کە پیرەمێرد ماڵی لە (هەگبەلی) بوو هەموو هەفتەیەك ئەمین زەکی شەو و ڕۆژێکی لای ئەو بەسەر دەبرد.

لە گەڕانەوەشیاندا بۆ عێراق ئەو پردەی نێوانیان نەپسا، ئەو هاورێیەتییە بێگەردەیان هەمیشە لە گەشەدا بوو، کە پیرەمێرد دەچووە بەغدا بە پەلە دەچووە دیدەنی هاورێ ئازیزەکەی، کە ئەویش دەهاتەوە بۆ سلێمانی یەکەم کەس پیرەمێرد بوو خۆی دەگەیاندە ماڵی میرزا فەتاح بۆ بەخێرهاتنەوەی دۆستی دێرینی.

لە ساڵی ١٩٣٦دا لە وەزارەتەکەی "حیکمەت سلێمان"دا ڕووی لێ نەنرا بۆ وەزیری. دەشێ لەو سەردەمەدا هەریەکە ئەم مەسەلەیەی بە جۆرێ لێك دابێتەوە، هەبوون بەداخەوە بوون کە بۆچی زەکی بەگ لەم وەزارەتەدا بەشدار نییە! بەڵام پیرەمێرد بە پێچەوانەی هەموو ئەو جۆرە کەسانەوە بوو ڕای تایبەتی خۆی لە نامەیێکی کراوەدا لە ڕۆژنامەی (ژیان)دا لە ١٩٣٦/١٠/١٤ بەم شێوەیە دەربڕی[١]:

((نووری دیدەی عیرفانی وڵاتەکەمان ئەمین زەکی بەگ.

زۆر کەس هەن کردوویانە بە خوو، یەکێ مەنصەبێکی گەورەی دەست کەوتبێ کوتوپڕ تەبریکی بۆ دەنووسن و کە لێش کەوت (تأثر). من ئەو دەمەی تۆ بووی بە وەزیر نووسیم هیچ ئارەزووم نەبوو، بۆ تۆ بنووسم (مەعالی)[٢]

١ ڕۆژنامەی (ژیان)، ژ ٥٠٢، ڕۆژی ١٩٣٦/١٠/١٤.

٢ مەعالی: واتە (پایەبڵند). لەسەردەمی پاشایەتیی لە عیراقدا بە سەرەك وەزیران دەوترا (فخامە) بە وەزیر (معالی) بە متصرف (سعادە).

یەعنی حەزم نەکرد ببی بە وەزیر! ئێستاش زۆرم لا خۆشە لە وەزیریدا نەمای! چونکە ئەمەندە سالی وەزیریت کرد، ئەمما چ وەزیرییەك؟ ئیدارەی دوازدە مەقام و ٢٤ شوعبەت کرد بە قەد دوو جزمە تەئریخەکەت[٣] بەکار نەهات و لەمەیشا خۆم ئەیزانم کە قەرزاری، بە سایەی خواوە وا ئەم جارە بۆ خۆمان یەعنی قەومەکەت بوویتەوە بە ماڵ. ئێستا ئەوی من ئەمەوێ تا من ماوم تۆ بنووسە و من بۆت چاپ بکەم. بەرگوزاریی کوردیی بۆ کوردی هەژار ئەوەیە یادگاری بەکار)).

پیرەمێرد بەشی خۆی شارەزای مێژوو بووە، بەدڵ حەزی لەم زانستە کردووە، بەڵام هەمیشە مەبەستی بووە کە ئەمین زەکی لەم بوارەدا ڕێ پیشاندەر بێ و کون و قوژبنی شوێنان بەدوای ڕووداوی مێژووییدا بگەڕێ، ئەوەتا جارێکی تر و دوای نزیکەی ساڵێ بەسەر نامەی پێشوودا لە ڕۆژنامەکەیدا[٤] نووسیویەتی:

((بۆ مەعالی ئەمین زەکی بەگ

من بە ئاشکرا پێی لێ ئەنێم کە سەر ئاوردشوناس نیم و تەئریخ نازانم، لەگەڵ ئەمەیشدا زۆرم ئارەزوو لێیە کە سەرگوزشتەی ئەم خاکی عێراقە کێی تیا هەڵکەوتووە، یەکەیەکە جوێ جوێ و ئەم شارە کۆنانە کێ بنیادی ناون و ئاوەدانی و وێرانییان چییە؟))

لە پاشانا دەڵێ: ((وا من لە دەوروپشتی خۆمان مەم و زینم نووسی)) دوایی دێتەسەر باسی دوازدە سوارە و شەریف هەمەوەند و مەحموود سەلیم شیوەکەڵی و تاد.

لە کۆتاییدا نووسیویە: ((هەندێ لە گـــەرز و گزارشی ڕەنگاو ڕەنگی بەغدام بۆ بکە بە کتێبێکی بچکۆلە تا لە چاپی بدەم، بەڵام توخوا جەعفەری بەرمەکیشی تیا بێ کە بزانین تەئریخ عیبارەتە لە تەکەرور)).

هەر دوای دوو مانگ پیرەمێرد باسێکی مێژوویی چڕی نووسیوە و لە (ژیان)دا بە ناونیشانی (بۆ مەعالی ئەمین زەکی بەگ) لە دوو ژمارەدا بڵاوی کردووەتەوە[٥].

دوای داخستنی (ژیان)و وەرگرتنی ئیمتیازی (ژین) کە یەکەم ژمارەی لە ١٩٣٩/١/٢٦ دەرچوو، ژمارە (٥٥٤)ی دایە. ئەمین زەکی بە شیعر پیرۆزبایی لە پیرەمێرد کرد، وە ئەمیش لە (ژین)دا بەم شێوەیە وەڵامی دەداتەوە[٦]:

((ئەمین زەکی بەگ-

بە شێوەی ڕەسمی و حەقی مەکسووبی، ئێمە ئەشیا بمان نووسیایە مەعالی سید ئەمین زەکی، بەڵام بەرگی هونەرمەندیی جیهان پەسەندیی ئەو، هیچی پێ ناوێ تەنها ئەمین زەکی بەگ بەسە.

ئەم جارە چاوڕوونی غەزەتەکەی بە دوو شیعری جوانی بە ناوونیشان کردبوو، هەندێ ئەیانوت: ئەمین زەکی بەگ شاعیر نەبووە، نەیانئەزانی سەرەتای

٣ ئاماژەیە بۆ دوو بەرگە مێژووییەکەی ئەمین زەکی (خولاصەیێکی تاریخی کورد و کوردستان) یەکەمیان ٣٩٨ لاپەڕەیە و ساڵی ١٩٣١ لە بەغدا چاپ کراوە. بەرگی دووەم لە کاتی نووسینی ئەو نامەیەی پیرەمێردا هێشتا چاپ نەکرابوو، بەڵام پیرەمێرد ڕوونووسەکەی دیبوو، ئەوەندەشی نەخایاند کە چاوی خوێنەری کوردی پێ ڕوون بوو. ئەم بەرگە ٤٣١ لاپەڕەیە و ساڵی ١٩٣٧ لە بەغداد چاپ کرا.

٤ ڕۆژنامەی (ژیان)، ژ ٥٣٩، ١٩٣٧/٩/٢٠.

٥ ژیان، ژ ٥٤٢، ٥٤٣، ١٩٣٧/١١/١٥، ١٩٣٧/١١/٢٢.

٦ ژین، ژ٥٥٥، ١٩٣٩/٢/٩.

پیرەمێرد

جونبوشی زەکای ئەو بە شیعر بوو، ئەوەڵ مەنزومەی کە لە ئەستەنبووڵ پێ نیشانی منی دا، لەوانە بوو بە چاوەوە ببێ. ئاتەشین و ڕەنگین. دوای ئەوەی کە نەژادی کوڕم لە جەزیرەی هەگبەلی هاتە دنیا[7] ئەو قەسیدەیەکی نووسی، خالد زیاو ئەکرەم بەگی ڕەجائی زادە[8] زۆریان پەسەند کرد بەڵام من زۆری لەگەڵ خەریك بووم کە لەگەڵ شیعر خەریك نەبێ قوەی تەحریری هەڵ نەقرچێ. چاك بوو شکور وازی لە پیشەدرۆزنەی ئەو سەردەمە هێنا و دەستی دایە عیلم و فەن کەوا ئێستا بەو عیلمەیەوە ئەو هەموو خزمەتەی عێراقی پێدەکرێ بە تەحریر و بە ڕای و کردەوە پایەیێکی بەرزی گرتووە و پایەیێکی قورسی ئیدارەی گرتووەتە سەر شان و لەگەڵ ئەوەیشدا پەکی نووسینی ئاساری پایەداری نەخستووە. خۆمان چاولەبەری خۆی و ژین چاوەڕێی نووسینیەتی)).

ئاشکرایە، پیرەمێرد باوکی دڵسۆزی (نەورۆز) بوو، هەموو ساڵێ ڕۆژی نەورۆزی دەکرد بە جەژن و لە کارێزی وەستا شەریف و گردەکەی یارە ئاهەنگی ساز دەکرد.

بەڵام ناحەزان هەوڵی کوژاندنەوەیان دەدا، چەند ساڵێ ئاهەنگی نەورۆزی لێ قەدەغە کرا[9]، ئا لەم کاتەدا کە پیرەمێرد کەوتبووە بەر ژاروژەنگی میریی، ئەمین زەکی بەگی مێژوونووس لە گۆڤاری گەلاوێژدا وتارێکی لە شێوەی نامەیێکدا بۆ پیرەمێرد نووسی[10]:

((بۆ پیرەمێردی خۆشەویست–

هەمووو ئەیزانین کە هەموو ساڵێك زەماوەندێکی بچووك یا گەورە بۆ ئەم جەژنە تەبیعییە ئەکەی. هێندێ کەس لەم فیکر و عەمەلە باشەی تۆ تێنەئەگەیشتن و بوختانی بێ مەعنایان پێ کردی و بۆیەیەکی سیاسییان لێ داو نەیانهێشت لەسەر ئەو فیکرە برۆی. زۆر ناحەق بوون چونکە ئەم ڕۆژە بەپێی ئەوە کە ئەوەڵ ڕۆژی بەهارە و مزگێنی ژیانەوەی تەبیعەت ئەدا، بۆ هەموو ئادەمیزاد جەژنێکی ڕاستەقینە و لایقە کە هەموو کەس تەقدیسی بکا)).

ئەمجا باسی ئاگری نەورۆز دەکاو بەلایەوە وایە کە ئەم ئاگرە پەیوەندیی بە جەژنەکەوە نییە، وای بۆ دەچێ کە ڕەنگە هەر بۆ ئیعلانی جەژنەکە لەسەر چیا و شوێنە بەرزەکاندا ئاگر کرابێتەوە.

پیرەمێرد بەم پشتگیرییەی ئەمین زەکی بەگ زۆر شاد دەبێ و ئەم نووسینەش بە هەل دەزانێ کە دەربارەی نەورۆز وتارێکی دوور و درێژی بەپێز بنووسێ و هەر لە گەلاوێژدا بڵاوی بکاتەوە، کە سەرەتا بەم شێوەیە دەست پێ دەکات: ((نووری دیدەی من وڵاتەکەم ئەمین زەکی بەگ لە گەلاوێژی جاری پێشوودا لە نەورۆزی من دوابوو. دیارە ئێمە بە پەرێزی ئەوا ئەم جارە گوڵەوەچنی ئەو پەرێزە ئەکەم و لە نەورۆز ئەدوێم))[11].

بەر لەوەی ئەمین زەکی بەگ ئەو نامەیە دەربارەی نەورۆز بڵاو بکاتەوە پیرەمێرد لە کۆتایی ساڵی ١٩٤٢ لە گەلاوێژدا وتارێکی بە ناونیشانی (تاریخ و ئەشخاص) بڵاو کردەوە[12]

ئەمین زەکی بەگ دەربارەی ئەم وتارە نووسینێکی مێژوویی تێرو تەسەلی بڵاو کردەوە[13] کە دەڵێ:

((بۆ پیرەمێردی خۆشەویست–

بە موناسەبەتی مەقالەی (تەریخ و ئەشخاص)یەوە (....) پیرەمێردی ماموٚستا ئەڵێ: کە دارا لە شەڕی ئەسکەندەردا کوژراوە ساسانی کوڕی لە ترسا ڕایکردووە لە ئیقلیمی (بابك)دا بێ ناوونیشان بووە بە شوان. بابك، خەوێکی دیوە کە ئەو شوانە شازادەیە و هێناویە کچی خۆی لێ مارەکردووە، کردوویە بە زاوای خۆی و (ئەردەشێر)ی لێ بووە.

هەموو ئەیزانین کە ئەردەشێر بناغەی دەوڵەتی ساسانی داناوە و ئەوەڵ پاشای ئەم بنەماڵەیەیە. لە حەقی باوك و باپیرانی

---

٧ نەژاد، ڕۆژی ١٩٠٤/٤/١٧ لەدایك بوو، ئەم کوڕەی پیرەمێرد خوێندەوار و ڕووناکبیر بوو، پەخشانی لە گۆڤاری (أجتهاد) لە ئەستەنبووڵ بڵاو دەکردەوە، لە وەزیفەیشدا گەیشتە پلەی موددەعی گشتی، ئەمیش دوو کوڕی هەبوو (ئاتیلا و ئارگوین).

٨ عوشاقی زادە (خالد چیاو) و ڕەجائی زادە ئەکرەم بەگ و حسێن ڕەحمی لە (ئەڤنە) دراوسێی پیرەمێرد بوون و زۆری کاتیان پێکەوە بەسەر دەبرد.

٩ بڕوانە: پاشکۆی عێراق، ژ ٢٨، مارتی ١٩٨٨، نەورۆز لە ساڵانی چلەکانا، مستەفا ساڵح کەریم.

١٠ گۆڤاری (گەلاوێژ)، ژ ١، س٤، کانوونی دووەمی ١٩٤٣.

١١ بۆ تەواوی وتارەکەی پیرەمێرد، بڕوانە: گۆڤاری (گەلاوێژ)، ژ ٣، س٤، مارتی ١٩٤٣.

١٢ گەلاوێژ، ژ ١١، ١٢، تشرینی دووەم، کانوونی یەکەم ١٩٤٢.

١٣ گەلاوێژ، ژ٢، س٤، شوباتی ١٩٤٣.

ئەردەشێر دوو ڕیوایەت هەیە:
١. ڕیوایەتی شانامە و ئەفسانەی ئێران.
٢. ڕیوایەتی مشیر ئەلدەولە- تەئریخی ئێرانی قەدیم)).
ماموستا ئەمین زەکی زۆر بە درێژی باسی ناوەڕۆکی ئەو دوو سەرچاوەیە دەکات و لە دواییدا دەفەرموێ: ((وادیارە کە راوییانی ئەفسانەی ئێران بۆ ئەمەی ئەردەشێر ببەنەوە سەر بنەماڵەی کیانیان ئەم حیکایەتی ساسانەیان ڕێك خستووە، وەکوو چۆن نەسەبی ئەشکانیش دەبەنەوە سەر ئەردەشێری دووەمی هخامنشی کیانی و ئەم غیرەتەشیان بۆ ئەسکەندەر صەرف کردووە و کردوویانە بە کوری دارا. ئەم چەند دێرەم بۆ ڕووناك کردنەوەی تەئریخ و هێنانەوە بیری ماموستامان (پیرەمێرد) نووسی و شکم نییە کە خۆشی شارەزای ئەم باسەیە)).
کە نووری سەعید، شەشەمین کابینەی وەزارەتی پێك هێنا، ڕۆژی ١٩٤١/١٠/٩ ئەمین زەکی بوو بە وەزیر، ئەمە یانزەهەمین جار بوو دەبووە وەزیر، بەڵام لە ١٩٤٢/١/٣١ وازی هێناو لە وەزارەت کشایەوە[١٥]، ئیتر نەخۆشی بەرەبەرە زۆری بۆ دەهێنا، هەرچەند ئەوەندەی دەستی قەڵەمی دەگرت لە نووسین دوور نەدەکەوتەوە، لەتەك پیرەمێردیشدا هەردەم نامە لە نێوانیاندا هەبوو، یەکێ لەو نامانە کە نرخێکی مێژوویی هەیە و بە نامەی (ماڵئاوایی) دادەنرێ، ئەو نامەیەیەتی کە لە ١٩٤٨/٦/٢٩ لە بەغدادەوە بۆ پیرەمێردی ناردووە، هیچ کامیان بیریان لەوە نەکردووەتەوە کە ئەوە دوانامە دەبێ لە ژیانیاندا.
((دوانامەی ئەمین زەکی بۆ پیرەمێرد
١٩٤٨/٦/٢٩
چرای ئەدەبی وڵاتەکەم... کارتە دڵبەرەکەتم وەرگرت، ئای چەند دڵسۆزانە بوو، چاومی ڕوون کردەوە، ژانی پەنجەکانمی شکاند. بەو هێزە دەستم دایە قەڵەم ئەم چەند دێرەم نووسی، خۆزگە بمتوانیایە بە کامی دڵ تێر بنووسم، نازانی چەند ئاواتە خوازی گفتوگۆم لەگەڵ تۆ.
یاخوا تۆ هەر بژیت، ئەگەر قسمەت بێ چاومان بە یەك ئەکەوێ.
نازانم تاکەی (تەپڵی تۆپێن) بە بێسارانی و وەلی دێوانە و ئەمانە ئەکەی؟[١٦]. سەرم وا لێ تێك چووە فەرقی وتاری ئێوە و ئەوان ناکەم! ڕەنگە ئەوانیش زیندوو بوونایە وا بوونایە.
هەر خۆش بێ ماموستا[١٧].
ئیمزا
محمد ئەمین زەکی))
هەفتەیەك دوای نووسینی ئەو نامەیە، ئەمین زەکی بەگ هات بۆ سلێمانی، لەلایێ بۆ ئەوەی لە گەرمای بەغداد دوور بکەوێتەوە، بە هیوای ئەوەی کە ڕەمەزان و جەژن لە سلێمانی بەسەر ببات، لەلایەکی تریشەوە کە لە نزیکەوە هەوڵێ بۆ ئەو ناتەواویانە بدات کە لە (لیوای) سلێمانیدا هەبوون تا بیان گەیەنێتە کاربەدەستان. پیرەمێرد لە بەخێرهاتنەوەی ئەم میوانە ئازیزەدا نووسی[١٨]:
((ئەمین زەکی بەگ (عەین) و نووری (عەینی)[١٩] قەومەکەمان هاتەوە. دڵمان بە فەیزی مانگی ڕەمەزان پڕ لە شایی جەژن فەرەحناکەو چاومان بە دیداری ئەو ڕووناکە. ئای پیریی چەند بێ بیری، وای ناتەوانی چ دەردێکی هەمیشە لەبیری. خۆزگە ئەم نەوعە پیاوانە (بەدەل)یان لێ قبووڵ ئەکرا[٢٠] بەڵام هەر ڕەش بگیرە)).
هەر ئەو ڕۆژە کە ئەم چەند دێرە لە ژیندا بلاو دەبێتەوە، پیرەمێرد ئێوارە دەچێتە ماڵی میرزا فەتاح بۆ لای، وە تا درەنگانێ پێکەوە دەبن، بۆ ڕۆژی دوایی ئیتر بەرەو ئەوە دەڕوات کە ماڵئاوایی لە جیهان بکات، هەر ئەو شەوە بۆ یەکجاری کۆتایی ژیانی هات. مەرگی ئەم پیاوە مەزنە کۆستێکی

---

١٥ د. کەمال مەزهەر، دەڵێ: ((هۆی ئەو وازهێنانەی تەنها نەخۆشی نەبوو، زیاتر لەسەر ئەوە بوو کە نووری سەعید بێ ئاگاو ڕەزامەندیی ئەو یەکێکی ناشیی کردبووە کارگێری گشتیی پێوانە لە وەزارەتەکەی ئەودا، ئەو کارەی ڕقی وا هەڵساند جارێکی تر توخنی وەزارەت نەکەوێتەوە)) مێژوو، ل١٥٦.
١٦ پیرەمێرد، زۆر جار شیعری خۆی بە ناوی ئەو شاعیرانەوە بلاو دەکردەوە یان دێرەشیعری خۆی تێهەڵکێشی شیعری ئەوان دەکرد، ئەوە جگە لەوەی کە شیعرەکانیانی دەگۆڕییە سەر شێوەی کرمانجی خوارو، هەندێ جاریش دەستکاری دەکردن. ئەم حاڵەتەش بۆتە هۆی پەیدابوونی جەنجاڵییەك بۆ توێژەرەوە و لێکۆڵەرەوانی شیعری پیرەمێرد، لێرەدا ئەمین زەکی بەگ ئاماژەی بۆ ئەو جۆرە ئاڵۆزییە کردووە.
١٧ پیرەمێرد، دوای کۆچی ئەمین زەکی بەگ بە (١٩) ڕۆژ ئەم نامەیەی لە ژمارە (٩٢٨)ی (ژین)ی ڕۆژی ١٩٤٨/٧/٢٨ بلاو کردەوە.
١٨ ژین، ژ ٩٢٥، ڕۆژی پێنج شەممە ١٩٤٨/٧/٨.
١٩ عەین: ئاماژەیە بۆ ئەوەی کە ئەمین زەکی بەگ ئەندامی ئەنجومەنی (ئەعیان) بوو، نووری عەین: واتە بینایی چاو، یان ڕووناکی چاو.
٢٠ بەپێی یاسا، لەو سەردەمەدا کە یەکێ بانگ دەکرا بۆ سەربازیی (بەدەل)ی دەدا واتە پارەی دەدا و سەربازی بۆی حساب دەکرا، خەڵکی پێیان دەوت (بەڵەد). لێرەدا پیرەمێرد ئەوەندەی ئەمین زەکی بەلاوە مەزن بووە وتوویەتی خۆزگە بۆ ئەم جۆرە پیاوانە (بەدەل) ببوایە و بخرایەتە بری مەرگی ئەم هەڵکەوتووانە.

گەورە بوو بۆ کورد، بەڵام بە رادەیە کاری کردە سەر پیرەمێرد کە لە پەلوپۆی خستبوو، فرمێسکی چاوەکزەکانی بەسەر ریشە سپییە تۆپزییەکەیدا وەك بارانی بەهار دەهاتە خوارێ. بەو دڵە هەڵقرچاوەوە دەست دەداتە قەڵەمەکەی و ئەم (ماتەم)ە دەنووسێ[21]: ((سەیری کچ ڕەوبی ئەم چەرخە کەن! لە ژمارەی بە رووی ژیندا مزگێنی هاتنی ئەمین زەکی بەگمان دابوو کەچی بە هەموو کەچ بەختی و دڵی شکستییەوە کۆچی دوایی ئەو ئەنووسین.
ئەمین زەکی بەگ بەو نەخۆشی و بێتاب و توانابییەوە کە نەیئەتوانی لە جێی خۆی ڕاستەوەبێ، دیسان بەهێزی خۆشەویستی وەتەنەکەیەوە کە خزمەتی بکاو ئاوی پاك بۆ پێنجوێن بێنێ و ئاوی بۆگەن و پیسی شیوەکان داپۆشێ بەم چلەی هاوینە و بەم ڕەمەزانە هاتبوو، وە ئەم هەموو خەڵکە کە ئەیان دی ڕەمەزانیان بە رووی ئەوەوە بە جەژن ئەزانی. چونکە پیاوێکی بەکەڵك و خێرخواە و دڵسۆز بوو. بەڵێ کوردستان بەرودوا پیاوی گەورە و ناودار و تەنانەت مەلیکی تیا هەڵکەوتووە، بەڵام ئەو پیاوێکی تر بوو، وێنەی هەڵناکەوێتەوە. خوێندەوارێ بوو ناوی کوردی بڵند کردەوە، مردووەکانی زیندوو کردەوە و فریای زۆر بێوایە و بێچارە کەوت. خۆ دیارە (ژین) تا ئێستا مەدحی خۆرایی کەسی نەکردووە، وا ئەیەوێ یادی چاکیی ئەو بکا، بەڵام نایگاتێ. هەر ئەوەندە ئەڵێین: کۆستێکی گەورە بوو. دیارە ئەو دڵو دەروونە و ئەم مانگی ڕەمەزانە گۆڵکۆی گردی سەیوانی کردووە بە سەیوانی ڕەحمەتی خۆیی، تەسەللای خۆم و کەسوکاری ئەویشم ناوێ. توخوا من خۆم بڵێم تەسەللام بوێ؟ ئەوم لەبیر بچێتەوە؟! دەك خوا نەکا. لە ژوورسەری بەگریانەوە ئیرتیجالی شیوەنێکم وتوە، ئەوە هەر بۆ خۆمە. تەسەللای گەورە ئەمە بوو کە بە چاوی خۆم دیم میللەتێکی قەدرشوناس و وەفاکار و بڵند دەمارو مەردانە شیعارم هەیە. بەم مانگی ڕەمەزانە کە کەس ئەوەندە بەدەرەوە نەبوون نازانم ئەم خەڵکە چۆن بیستبوویان؟ شاری سلێمانی وەك سوپای سلێمان بە جارێ خرۆشان، روویان کردەماڵی میرزا فەتاح، چونکو ئەو هەرچەندە بهاتایە لەوێ ئەبوو، ماڵی خۆی بوو. های میرزا فەتاح رووی خۆت و برات و عائیلە و کوڕ و کچ و کەسوکارت سپی کە ئەم میوانە عەزیزەتان چۆن بە قەدرو حورمەتەوە بەرێ کردو ئەی شاری سلێمانی ناوی مەردی و وەفاتان وەك تەئریخەکەی ئەمین زەکی بەگ هەر لەکارا بێ بۆ ئەم جۆشو خرۆشو دڵسۆزی و قەدرشوناسیەتان کە چۆن ئەو کۆتەڵ و دارەمەیتەتان گرت بەسەر سەرەوە.
ئەی قەومی کورد ئافەرین بۆ ئێوە کە لە دوورو نزیك و هەولێر و کەرکوك و ئافاقی کوردستانەوە چۆن لەپێش کورەکانیا گەیشتنە سەری. هاوار بە ماڵم و داخی بە جەرگم بۆ (سانیحە) کە ئەمەندە ساڵە لە ژوورسەری باوەشێنی کردو هەنگامی هەنگامەی کۆچی دوایی نەدی. توخوا چەند بە سۆزەوە تا زمانی لە کاردا بوو سانیحەی بانگ کرد)).
ئەمجا پیرەمێرد دێتەسەر باسی بەشداربوونی مۆسیقای سوپا و ئەفسەرانی (حامیە) لە بەرێکردنی تەرمی پیرۆزیدا، ئەمووست بۆ ئەو وتارە بەسۆزەی بەرێوەبەری پەروەردەی سلێمانی مامۆستا عبدالمجید حەسەن وەلی رادەکێشێ کە لەسەر قەبران بە زمانی عەرەبی خوێندویەتیەوە. هەروەها باسی دەیان بروسکەش دەکات کە گەیشتوونەتە ژین. لە کۆتاییدا دەڵێ:
ئاخ حەمەدەمینی حاجی ئەورەحمان
کورە لاوەکەی گەرەکی خۆمـان
((هاوەردی ئەستەنبوڵ و شارانم، ناتوانم هیچت بۆ بنووسم))
هەر لەو ژمارەیەی (ژین)دا ئەم شیعرەشی بۆ نووسیوە کە تێیدا دەڵێ:
چرای رووناکیی کورد کوژایەوە
تەختی سلێمان تەخت کرایەوە

ئەمین زەکی بەگ ڕۆژی ڕەمەزان
هەوارگەی بردە سـەر گردی سەیوان
لەوساوە کە ئەو ئەســـپەردەی گڵە
فرمێسکم تێکەڵ بە خوێنی دڵە
وەك لێرەدا بۆمان دەرکەوت دوانامەی ئەمین زەکی بەگ بۆ پیرەمێرد لە ١٩٤٨/٦/٢٩ بوو، لە ١٩٤٨/٧/٨ بەخێرهاتنەوەی نووسی، لە ٧/١٥ بە سۆزەوە شیوەنی جەرگبڕاوی و پشتشکاویی خۆی نووسی، لە ٧/٢٢ بەناونیشانی (گەرمەبرین) نووسیویەتی و دەڵێ[22]: ((ئێمەش برینی ئەمین زەکی بەگ بە گەرماوگەرمی پێمان نەزانی تا ساردبووەوە ئینجا تێئەگەین کە چیمان لەکیس چووە)).
لە ڕۆژی ١٩٤٨/٨/٢٦ لە یانەی فەرمانبەران لە سلێمانی بە هەوڵ و کۆششی خوالێخۆشبوو عبدالمجید حەسەن وەلی کە نووسەرو روناکبیرێکی عەرەب بوو، ئەو سەردەمە بەرێوەبەری مەعاریفی سلێمانی بوو کۆڕی ماتەمینی چلەی مێژوونووسی گەورە ئەمین زەکی بەگ سازکرا، گەلێ وتار و شیعری بەهاداری تێدا خوێندرایەوە، پیرەمێردی هاورێی گیانی کۆچ کردوو بە سۆزەوە ئەم شیعرەی خوێندەوە:
داخێ کە فەلەك نای بە جەرگما
کزم لە کزەی سەرەمەرگما

٢١ ژین، ژ ٩٢٦، ڕۆژی پێنج شەممە ١٩٤٨/٧/١٥.
٢٢ ژین، ژ ٩٢٧، ١٩٤٨/٧/٢٢.

بەخت و بەرگم ڕەش چاوسپی بەشـــین
فرمێسك سوور و سوێر بۆ حەمەدەمین
چونکە باوەری بە خواو ئاییـنـە
جێی خاڵی نابێ لە خۆی ئەمینە[٢٣]

ئەمین زەکی بەگ، دوای کۆچیشی لە ویژدان و هەست و هۆشی پیرەمێردا دەژیا، تا ئەو ڕۆژەی سەری نایەوە فەرامۆشی نەکرد و یادگاری ئەوی لەبیر نەچووەوە.

پێش ئەوەی ساڵی ١٩٤٨ کۆتایی بێ جارێکی تریش پیرەمێرد بە دڵێکی هەڵقرچاوەوە لە ژینی خۆیدا وتارێکی نووسیوە دەڵێ: ((یادی دڵسۆزێك بە گریانەوە))

((وا بە گردەکەی شوێن سەیوانەوە)).
((ئەمێنێ حەزین بۆ ڕۆحی ئەمین))
((روح الامینی بێ بە هاونشین))

محەمەدئەمین زەکی بە بەرگی ئەفسەریی عوسمانییەوە

((ئەمین زەکی بەگی کوری گەرەکم، هاودەمی ئەستەنبوڵ، هەموو شەو و ڕۆژی هەینییان میوانی عەزیزی جەزیرەی هەگبەلیم، شەوقی چرای ژیان و ژینم ئارایشی لاپەڕەی ژیان و ژینم))[٢٤].

پیرەمێرد بە دەم هەنسکی گریانەوە وتارەکەی نووسیوە و ئەوەمان بۆ دەردەخات کە هەرگیز زەکی بەگی لەبیر ناچێتەوە ئەمجا دەڵێ: ((ئێستاکە بە تەنیا ئەمێنمەوە و یادی حەمەدەمینم ئەکەمەوە بێ ئیختیار فرمێسکی چاوم ڕیشی ئیختیاری سپیم تەڕ ئەکا. خۆ هێجگار کە ئەروانمە (کولکسیونی ژین) و ئەو هەموو نووسینەی ئەوی تیا ئەبینم یا کیسە خامە کۆنەکەی[٢٥] کە نامەی ئەو و جەعفەر پاشای بە خەتی خۆیانی تیایە و دەری دێنم ئاخێکی دەردمەندی هەڵدەکێشم)).

پاشان دێتە سەر کردەوە بە سوودەکانی و تەقەللا زۆرەکانی و بەرهەمی بە کەڵکی ئەم پیاوە هەڵکەوتووەی کە تا ژیا، ژیانی بۆ میللەتەکەی بوو.

لە کۆتاییدا دەڵێ: ((ئەمین بن، ئەمین زەکی نامرێ، بەختیاری و پایەداری و بەرخورداری بۆ قەومێکە کە پیاوی وای تیا هەڵدەکەوێ))

ئەمە گوڵبژێرێکی نامە و یادگارەکانی نێوان ئەم دوو کەڵەپیاوە بوو کە بەڵگە و نیشانەی بەهێزن بۆ دۆستایەتی و برایەتی ڕاستەقینەی نێوان نووسەرە بلیمەتەکانمان، هیوام وایە نەوەی ئێستاو دوارۆژ کەڵکی لێوەربگرن و ئاورێ لە خەرمانی ئەم سامانە بەپیتەمان بدەنەوە کە هەر مەڵۆ و شارایەکی لای مرۆڤی قەدرزان خەرمانێکە لە پیت و فەڕ.

---

٢٣ تەواوی ئەم شیعرە و وتار و شیعرەکانی تری ئەو کۆڕە، بە کردو کۆششی مامۆستا علاءالدین سجادی لە کتێبێکدا بەناوی یادی محمد امین زەکی کۆکراوەتەوە و ساڵی ١٩٤٨ لە بەغداد لەچاپ دراوە.

٢٤ ژیان و ژینی یەکەمیان مەبەست لە ژین و ژیانی خۆیەتی، ژیان و ژینی دووەمیان ئاماژەیە بۆ هەر دوو ڕۆژنامەکەی، کە ئەمین زەکی بەگ لە نووسەرە هەمیشەییەکانی ئەم دوو ڕۆژنامەیە بوو.

٢٥ بریا بزانرایە ئەو کیسە خامە چی بەسەر هات و کەوتە لای کێ؟ بێگومان ئەو نامە و دەستنووسانە سوودێکی گەورەیان بۆ توێژەرەوە و لێکۆڵەرەوە هەیە، بە تایبەتی بۆ لیژنەی ساغکردنەوەی (دیوانی پیرەمێرد) ئەگەر لە بەرد دەستیانا بوایە زۆر شتی بۆ ڕوون دەکردنەوە.

# لەیادی ٦٥ ساڵەی وەفاتی مێژوونووسی گەورەی کورد محەمەدئەمین زەکی بەگ

## ١٨٨٠ ـ ١٩٤٨

**حەسەن مەحموود حەمە کەریم**

**پێشەکی:**

ئەمین زەکی بەگ یەکەم مێژوونووسی کوردە کە بابەتەکانی شێوازی لێکۆڵینەوەی وەرگرتووە و شیکردنەوەی بۆ هەندێ بڕگە کردووە، نەهاتووە باسەکان وەك خۆی بگێڕێتەوە، بەڵکو زۆر کەمیش بێت ڕاکانی لەیەکداوە و بە دوای ڕاستییەکاندا گەڕاوە، هەندێ نهێنی ئاشکرا کردووە، یەکەم مێژوونووسی کوردە کە سوودی لە سەرچاوە جۆراوجۆرەکان وەرگرتووە، ڕایەکانی تەبەری و ئیبن کەسیر و ئیبن ئەسیر و واقیدی و مەسعوودی لە عەرەبەکان هێناوە، سەرچاوە فەرەنسی و ئینگلیزی و ئەڵمانی و ئەورووپییەکانی وەرگرتووە و بەراوردی کردوون، کەسێکە چاوەڕوانی کەسی نەکردووە بابەتی بۆ بگوازێتەوە، بەڵکو خۆی بۆ خۆی چووەتە فەرەنسا و ئەڵمانیا و ڕووسیا و ئەستەمبوڵ و شام و سەرچاوەکانی هێناوە و تاوتوێی کردووە، ئەو دەیزانی کە مێژوو لە فراوانترین مانایدا چیرۆکی ڕابردووی مرۆڤە، هەر بۆیە دڵسۆزانە گەڕاوە بە دوای ڕەچەڵەك و مێژووی گەلەکەی و لە جوانترین شێوازدا بۆ لاوان و ڕۆشنبیرانی نووسیوە، هەتا پێیان بڵێ ئەوە چیرۆکی ژیانی ڕابردووی تۆ و باپیرانتە، ئاگادار بە، ڕابردووت بناسە، ئەو لە شێوەی چیرۆك خواندا بەسەردێکی خەرافی ئامێز نەینووسیوە، هەتا مرۆڤ لەگەڵ باسەکانیدا هەڵچێ و داچێ و یاری بە هەست و سۆزیان بکات، بەڵکو لەگەڵ عەقڵ و زەینیاندا قسە دەکات و دەیەوێ تێیان بگەیەنێت، ئەو مێژوونووسێکی بێلایەنی مەزنە، جێی خۆیەتی ساڵانە کۆنگرە و سیمینار و خەڵاتی بەناوەوە بکرێ.

کەسێك چاکتر لێی دێ مێژوو بنووسێتەوە، کە خۆی
کەسایەتییەکی ناو مێژوو بێت و ڕۆڵی هەبێ و پیاوی
ناو ڕووداوەکان بێت، شەرەفخانی بەدلیسی میرێکی
گەورەی کورد بوو، لە نێوان سنووری سەفەوی و
عوسمانیدا حکومەتێکی دروست کردبوو، لە ڕوانگەی
خۆیەوە شەرەفنامەی نووسی، ئەو کارە مەزنەی بۆ
کورد کرد، ئەمین زەکیش ئەفسەرێکی پایەبەرزی
سوپای عوسمانی و عێراق بوو، هەشت جار بووە
وەزیر لە حکومەتی عێراق و دوو جار بووە مودیر
عام و دووجاریش بووە نوێنەری خەڵکی سلێمانی
لە ئەنجومەنی نیشتمانیدا، لەو ڕوانگەیەوە مێژووی بۆ
گەلەکەی نووسییەوە. ئەمین زەکی لە کاتێکدا هاتووە
کە کورد لە بارێکی نالەباری سیاسیدا ژیاوە، دوای
ئەوەی عوسمانییەکان لاواز دەبن، هەر گەلە بەناوی
خۆیەوە خۆی دەناسێنێ، دیار نییە حسابێك بۆ کورد
کرابێت، دواتر دەکرێتە چوار پێنج بەش، کوردیش
خۆی بۆ خۆی گرویەکی سیاسی بەهێزی نەبووە، داوای
مافی کورد بکات و، بە جددی هەوڵی بۆ بدات، هەر
بۆیە ئەمین زەکی بیری کردەوە مێژوویەك بنووسێ
گەلەکەی هانبدات، بیر بکاتەوە کە ئەویش هەیە،
خاوەن ماف و زمان و خاك و مێژووی دوور و درێژ
و دەوڵەمەندە، لە کۆندا چەندین دەوڵەت و میرنشینیان
بووە، سەروەرییان تۆمار کردووە، پێیان دەڵێ دەتوانرێ
ئەوە دووبارە بکرێتەوە، جارێتر کورد بێتەوە بەخاوەنی
دەوڵەت و کەسایەتی خۆی، ئەمین زەکی کە باری
کورد دەبینێ، مێژوویەکی زیندوو دەنووسێ، کۆمەڵێك
بابەت دەوروژێنێ، لەبارەی ڕەچەڵەك و جوگرافی و شار
و، ژیانی سەدان کەسایەتی ڕابردووی کورد دەنووسێ و
بە گەلەکەی دەناسێنێ.

گەلی کورد دوو مێژوونووسی جددی دڵسۆز و بێلایەنی
بووە، یەکەم (شەرەفخان) حاکمی بەدلیس کە بە باوکی
مێژووی کورد دادەنرێ، دووەم (محەممەدئەمین زەکی)
کە بە نوێکەرەوەی مێژووی شەرەفخان و مێژووی
کورد دادەنرێت، مێژووەکەی شەرەفخانی بە وردتر
و هاوچەرخانە تر نووسیوە، شێوازی ئەم جیاوازترە
لە شێوازی شەرەفخان، شەرەفخان وەك هەقایەت و
سەردێك نووسیویەتی، بەڵام ئەمین زەکی دەیەوێ
بدات لە وەتەری ناسکی هەستی نەتەوایەتی لاوانی
کورد، بیانجوڵێنێ،، وەك مردوو بەسەر ڕووداوەکاندا
گوزەر نەکەن، ئەو هەوڵیداوە لە سەدان کتێبی بەنرخ،
کتێبێکی زیندووی بەهێز بنووسێ، زۆرترین زانیاری
کۆکردووەتەوە، دەیەوێ بە نەتەوەکەی بڵێ ئێوەش
هەن، مرۆڤن، مافتان هەیە، دەیان حکومەت و میرنشین
و هەزاران پیاوی گەورە و دەیان شۆڕشی مەزنتان لە
هەگبەدا هەیە، پێیان دەڵێ مەپسێن مەخەون، هەڵسن
بجوڵێن داوای ماف و ئازادی بکەن، ئەم نووسینانەی
ئەمین زەکی لە کاتێکدا بوو کە هەستی نەتەوایەتی
لاواز و مردبوو.

پێم سەیرە ئەم پیاوە ڕۆشنبیرە سیاسییە نەتەوەییە دڵسۆزە،
کە ئەورووپای دیوە، سەردانی ڕووسیا و وڵاتانی
ئەسکەندەناڤیای کردووە، لە زۆر لە بەرەکانی جەنگی
عوسمانیدا بەشداری کردووە، لە کێشەکانی دونیای
ئەو کاتە حاڵی بووە، خۆشی کەسایەتییەکی میانڕەو
و پاك و خۆشەویست بووە، هەمیشە مەجلیسەکانی بە
گەنجانی کورد گەرم بووە، هانیداون بۆ خوێندنەوە
و خۆ ڕۆشنبیرکردن و شارەزابوون لە مێژووی کورد،
پێی وتوون مێژوو ئاراستەی نەتەوەیی بۆ خوێنەر
دروست دەکات، ئاسۆی زەین دەکاتەوە و فراوانی
دەکات، بەڵام ئەمین زەکی خۆی بەشداری پارتێکی
کوردی یان تورکی ئەو کاتەی نەکردووە، هەرچەند
سەرکردەکانی ناسیون، لەگەڵیاندا ژیاوە، بەڵام هەوڵی
نەداوە پارتێکی سیاسی کوردی دروست بکات، کە بە
مەرجێ لە هەموو کەسە سیاسییەکانی ئەوکاتە شارەزاتر
و ناسراوتر بووە، ئەو وتانە ڕاست نییە کە هەندێ باس
لە کارە حیزبییەکانی ئەمین زەکی بەگ دەکەن، ئەو
کاری حیزبی نەکردووە، بەڵام لە کۆڕ و کۆبوونەوە
ڕۆشنبیرییەکاندا بەشدار بووە و یارمەتی داون،
هاوڕێیەکی نزیکی مستەفا کەمال ئەتاتورك و مەلیکی
عێراق بووە، هاوڕێی نزیکی پیرەمێرد و عەلادین
سوجادی و د. عیصمەت شەریف وانلی و تۆفیق
وەهبی و مەعروف چیاوك و ئەورەحمان بەگی بابان
بووە، هاوڕێی پیاوە گەورەکانی تورك و عەرەب بووە،
سەردان و نامەیان لە نێواندا
بووە، دەیان ڕۆڵی سیاسی
و سەربازی بەرزی بینیوە.

ئەمین زەکی لە
باسەکانیدا زۆر سەرسامە
بە توانای مینۆڕسکی
لە مێژووی کورددا،
لێکۆڵینەوەکانی ئەوی
بەلاوە گرنگە، مینۆڕسکی
ڕۆژهەڵاتناسیش لە
بابەتێکدا کە باس لە
مێژوونووسانی کورد
دەکات، یەکەم کەس
وەسف و سەنای
ئەمین زەکی بەگ
دەکات، محەمەدئەمین
زەکی ئەفسەرێکی
دەرکەوتوو بووە لە

محەمەدئەمین زەکی

سوپای عوسمانیدا، بەشداری جەنگی جیهانی یەکەم دەکات، لە نزیکەوە هەموو کارەسات و واوەیلاکانی دیوە، کە چۆن ولاتە جوانەکەی کوردستان دەبێتە مەیدانی جەنگێکی کاول کار، دەبێتە هۆی لەناوچوونی هەزاران کوردی بێتاوان، لە شەڕ و برسێتی و نەخۆشیدا دەفەوتێن، کورد لەو شەڕە خراپەکارەو، لە ستەمی شۆڤینی کەمالییەکان و ئینگلیز هیچی دەست ناکەوێت، جگە ماڵ کاولی و دابەشبوون، کەمترین مافی پێ ڕەوا نابینن، لەو کەشوهەوا نالەبارەدا، محەمەدئەمین زەکی ڕۆشنبیر و مەوسوعی و بەهرەمەند، لە بەرزترین پلەی سەربازیدایە، دڵسۆزە بۆ گەلەکەی، هیچی پێ ناکرێ، جگە لەوەی کۆمەڵێك کتێب بۆ مێژووی گەلەکەی بنووسێتەوە، بیسەلمێنێ بۆ جیهان و گەلەکەی، کە نەتەوەی کورد گەلێکی کۆن و بە توانان، خاوەنی مێژووی دەوڵەمەند و کولتوور و فۆلکلۆر و ئەدەبی دەوڵەمەندی خۆیانن.

### ئەمین زەکی نووسەر:

ئەمین زەکی، جگە لەوەی زانایەکی بەرز و ئەفسەرێکی کارامە و سیاسەتمەدارێکی بەهرەمەند بوو، مەرجەعێکی گەورە بوو، لە ئەستەمبوڵ پرس و ڕایان پێ دەکرد، شارەزاییەکی زۆری لە مێژوو و مێژووی عەسکەری دا هەبوو، ساڵی ١٩٢٠ دەوڵەتی عوسمانی دەیکەن بە لێپرسراوی (بەشی مێژووی جەنگیی)، جگە لە زمانی کوردی، فەڕەنسی و ئینگلیزی و تورکی و عەرەبی و فارسی زانیوە، ئەوە وای لێکردبوو خوێندنەوەی بەربلاو و نووسینی چاکی هەبێت، گەر ئەوە نەبوایە کە بەردەوام بەکاری سەربازی و گواستنەوە و بەرزبوونەوە لە پلەو پایەدا سەرقاڵی کردبوو، بەتایبەت کە جەنگی جیهانی یەکەم زۆر خەریکی کردبوو، هێز و بیرکردنەوەی خواردبوو، توانا ڕۆشنبیرییەکانی زیاتر دەتەقی، بەڵام هەر ماوەی دەدۆزیەوە، ٨کتێبی تورکی و ١٠ کتێب و نامیلکەی کوردی و، دەیان بابەتی کوردی و تورکی لە گۆڤار و ڕۆژنامەکاندا و، هەندێ دەستنووسی چاپ نەکراوی هەیە..

### نموونەی یەکێك لە کتێبە تورکییەکانی:

ئەمین زەکی لە ساڵی ١٩٠٦ هەتا ١٩٢١ هەشت کتێبی بە تورکی نووسیوە وەك کتێبی (چۆن عێراقمان لەدەست چوو)، (شەڕەکانی عێراق و هەوڵەکانمان)، (شەڕی سەلمان پاك و پاشکۆیەك)، (بەغداد و بەسەرهاتی دواین کەوتنی)، (لەشکری عوسمانی) و چەند دانەیەکی تر، جگە لەوانە کتێبێکی دوو بەرگی بەناوی (هێرش بۆ سەر کوت و ئابلۆقەدان) بە دەستنووسیی پێشکەشی مۆزەخانەی بەریتانیای کردووە و سوپاسنامەی تایبەتی لەسەر وەرگرتووە، ئەم کتێبانە بۆ ماوەیەکی زۆر بووبوونە سەرچاوەی خوێندن لە دەزگا سەربازییەکانی تورکیادا.. شتێکی چاکە ئەگەر ئەو کتێبانە وەربگێڕایەتە سەر زمانی کوردی، هەتا هەموو توانا ڕۆشنبیرییەکانی ئەمین زەکی لەبەردەستدا بوایە بۆ لێکۆڵینەوە لە ژیان و بەرهەمەکانی، لێرەدا نموونەی یەك کتێبی تورکی

محەمەدئەمین زەکی دانیشتووی ناوەڕاست بە بەرگی ئەفسەریی عوسمانییەوە

هەر بۆ ناساندن دەخەینە ڕوو، هەتا بزانن ئەمین زەکی لە بواری سەربازییدا چەند شارەزا و بەتوانا و هەقبێژ بووە، باس لە هێرشی هێزەکانی بەریتانیا دەکات بۆ بەغدا، هەموو لایەنەکان و میزانیەی هێز و هۆی شکستی عوسمانییەکان و نەخشە جەنگییەکان بە تەواوی شی دەکاتەوە، ئەم کتێبە یەکەم نووسینە لەسەر داگیرکردنی بەغدا لە جەنگی جیهانی یەکەمدا، هەموو وردەکارییەکانی باس کردووە وەك فەرمانده‌یەك خۆی لە جەنگەکەدا ژیاوە و دیویەتی، نەك وەك خوێندکارێك کە لە سەرچاوەکان دەری هێنابێت، ئەم کتێبە بۆ نووسینەوەی ئەو قۆناغەی مێژووی بەغدا زۆر گرنگە.

کتێبی (بغداد و صوك حادثە ضیاعی) واتە (بەغداد و دوا کارەساتە لەدەستچوونەکەی)، مامۆستا مستەفا نەریمان دەڵێ: ئەم کتێبە ١٤٠ لاپەڕەی کاغەزی زەردە، ساڵی ١٣٣٨- ١٣٤١ ی ڕۆمی واتە ساڵی ١٩٢٢ ی زاین لە ئەستەمبوڵ لە چاپخانەی عەسکەریە لەبەر گرنگی حکومەتی تورکی لەسەر حیسابی خۆی چاپی کردووە، لەسەر بەرگەکە نووسراوە (نووسەری: بەڕێوەبەری پێشووی شوعبەی ئیستخباراتی سوپای شەشەمی عێراق موقەدەمی ڕوکن محەمەدئەمین)، لای سەرووی بەرگەکەوە نووسیویەتی: (هەم مافی هەر میللەتێکە و هەمیش لەسەریەتی کە لە هەڵەکانی بگەڕێت و حیساب لەگەڵ ئەو کەسانەدا بکات کە هەڵەیان کردووە، هەر میللەتێك ئەمە بخاتە پشتگوێ، هیوای ژیان و چوونە پێشەوەی بەخۆی نەبێت ـ م . ئەمین) لەلاپەڕەی یەکەمی وێنەیەکی خۆی بە بەرگی ئەفسەرییەوە هەیە و لە ژێری نووسیویەتی (محرر عاجز).

کتێبەکە پێنج بەشە، هەمووی باس لە جموجۆڵی سەربازی پێش هێرشبردنی سوپای بەریتانی دەکات بۆ سەر بەغدا، پاشان باسی هێرش و بەرەنگاری عوسمانییەکان و پاشان کشانەوەی عوسمانییەکان و داگیرکردنی بەغدا دەکات لەلایەن بەریتانیاوە، کتێبەکە چوار پاشکۆی هەیە، یەکیان باسی مێژووی بەغدا و ژمارەی ئابڵوقەدان و کارەساتەکان و وێرانکردنەکان دەکات کە بەسەر بەغدادا هاتووە، پاشکۆی دووەم باسی بروسکەی سەرۆك لەشکری سوپای عوسمانی دەکات کە لە بەغدا بڵاوی کردەوە، دەربارەی چۆنیەتی کشانەوە و ئاگاداری ئەستەمبوڵ و وەزارەتی جەنگ و سوپاکەی خۆی کردووە، لەناو کتێبەکەدا دوانزە وێنەی تیایە کە دیمەنی ئەوسای بەغدا و دانیشتوان و مەزارگە و مزگەوت نیشان دەدات، دوو نەخشە هەیە، یەکیان نەخشەی بەغدا و دەوروبەری و دووەم نەخشەی پلانی ئەو شەڕەیە.

گرنگی لەوەدایە ئەمین زەکی خۆی تابلۆکێشێکی بێ وێنەیە، تابلۆی زۆری ناو بەغدا و ڕووبار و مەزارگە و شوێنە دڵڕفێنەکانی کردووە و زۆر وردەکاری و زەین ڕوون و ڕەنگ بەکارهێن بووە و زۆر لە تابلۆکانی بە گەورەیی لەسەر دیوارەکانی ناوەوەی بنکەی ژین لە سلێمانی گەورە کراوە کە زۆر هونەرییانە و دەستڕەنگین و وردەکار و ڕەنگ بەکارهێن و سەلیقەی پێوە دیارە، هەروەها دەستێکی باڵای لە نەخشەکێشاندا بووە، خۆی بەدەست و قەڵەمی خۆی نەخشەی شار و سنوورەکانی کێشاوە.

لە سەرەتادا ئەمین زەکی هۆی نووسینی ئەم کتێبەی نووسیوە و دەڵێ: (ئەمە پێنج ساڵ و دوو مانگە کە بەغدا و عێراق لە عالەمی عوسمانی جیابووەتەوە و چووەتە عالەمێکی تر و مێژوویەکی تری وەرگرت، ئەمڕۆ بۆ یادکردنەوەی ئەو ڕۆژە دڵ ئەتەوزێتەوە.... با خوێنەرە بەڕێزەکان لەوە دڵنیابن کە زۆر بەبێ لایەنی لەم کارەساتە دواوم، و بەهۆی لەدەستچوونی ئەم شار و هەریمە، پێ لە گوناە و هەڵەکانم ئەنێم، بەمەش پێویستییەکی فەرمانبەری خۆم و ویجدانی خۆمم جێبەجێ کردووە). لە کۆتاییدا ئاوا ناوی خۆی نووسیوە (سلیمانیە لی ـ محمد أمین) واتە (محەمەدئەمین خەڵکی سلێمانی)، سەرەتای مێژوونووسینی ئەمین زەکی لەم کتێبەدا خۆی دەنوێنێ، چونکە زۆر گرنگی داوە بە لایەنی مێژوویی بەغدا و کارەساتەکەی شیکردووەتەوە و ئۆباڵی لە دەستچوونی ئەم شار و وڵاتانەی خستووەتە سەر دەوڵەتی عوسمانی و چەند پەند و ئامۆژگارییەکی خستووەتە ڕوو، کە کەسیتر بەم جۆرە بۆی نەچووە، ئەم داگیرکردنەی بەریتانیا دەچوێنێ بە هێرشی تەتار بۆ بەغدا و خیانەتی عەلقەمی شیعەی بێگانەپەرست، کە دەرگای بەغدای بۆ هۆلاکۆ والا کرد، دوور نییە عەلقەمیەکیش لە سوپای عوسمانی بەغدای فرۆشتبێ بە ئینگلیز، بەڵام ئەمین زەکی ناوی هیچ ئەفسەرێك بە خائین نابات، بەڵام دیارە شتی وا ڕوویداوە، پاشان باسی مێژووی شاری بەغدا دەکات لەسەردەمی ئەبوجەعفەری مەنسوور کە (٢٤ هەزار گەڕەکی تیا بووە، هەر گەڕەکێك مزگەوت و حەمامی هەبووە و پەنجا و پێنج پرد لەسەر دیجلە هەبووە، چوار هەزار شوێنی شووشە دروستکردنی تیابووە، بەڵام لە کاتی هێرشەکەی بەریتانیادا ٣٠ هەزار ماڵ و پێنج هەزار دوکان و دوانزە کتێبخانە و سی گەرماو و سێ چاپخانە و ٢٦٠ خان و ١١٦ ئاش و هەشت قوتابخانە و چل مامۆستا و هەشت سەد قوتابی زیاتری نەبووە، پاشان دەڵێ هۆی دواکەوتنی ئەم شار و وڵاتە گۆڕینی زۆری والیەکان بووە، کە نەیانتوانیوە چاکسازی بکەن. زۆری کارەسات بەسەر ئەو شارەدا لە لافاو و ئاگربەربوون و پەتا و نەخۆشی کە کاتی نەداوە بۆ چاکسازی.

پاشان دەڵێ: لە کاتی هێرشی بەریتانیا لەشکری شەشەمی

عوسمانی له بەغدا بووه، که فیرقەی (١٤ و ١٥ و ٢٥) ی لێبووه و چەند فەوجی سواره و تۆپهاوێژی هەبووه، له ٧ی مارتی ١٩١٧دا دوژمن له سەلمان پاکەوه هێرشی کرد، پاشان له ئوم تبول و کازمیەوه هێرشی هێناوه، دوای چەند ڕۆژ بەرگری، له ترسی گەمارۆدان، فەرمانی کشانەوەیان داوه بۆ سامەڕا، هۆی ئەم شکستییه لای ئەمین زەکی چەند خاڵێکه، له ڕووی ماددی و مەعنەوییەوه لاواز بوون، دەڵێ ئێمه ١٠ هەزار بووین، بەریتانیا ٦٠ هەزار بوون، بە تۆپی بەهێز و چەکی نوێ و ئازووقەی پوخت، هەڵکردنی تەپ و تۆز، که یەکیان له نزیکەوه نەدەدی و تەنگەنەفەس بووبوون، دەیچوێنێ بە شەڕی قادسیه، که تەپوتۆز فارسەکانی کوێر کردبوو و شکاندنی، بروسکەکانی عوسمانی و بەریتانیا دەهێنێ، زۆر گرنگ باسی جەنراڵ مۆد دەکات، له کوچه و کۆڵان دەنگی شیوەن و زاری هەڵسا و لەسەر منارەکانەوه گریه و بانگەواز بەرزبووەوه و ئاڵای سوورمان دانەویی، ئەمه لێدانێکی تۆڵه ئامێز نەبێ هیچی تر نییه، ئەمین زەکی بۆ ئەم کتێبه سوودی له زۆر سەرچاوه وەرگرتبوو، سەرچاوەیەکی ورد و گرنگ بۆ بەغداد زۆر بەسووده...

وردەکاری زۆر لەم کتێبەدا هەیه، ئەوه دەردەخات که ئەمین زەکی لەم شکستییەدا هەر دوژمن بە تاوانبار نازانێ، بەڵکو تاوانی زۆریش بۆ خۆیان و دەسەڵاتی عوسمانی دەگێڕێتەوه، که ڕەنگه ئەمه یەکەم کەس بێت له ڕۆژهەڵاتدا ڕاستگۆیانه و بێلایەنانه جەنگێك هەڵدەسەنگێنێ و بڵاوی دەکاتەوه، که خۆی ئەندامێکی بەره شکست خواردووەکەیه، ئەمه ئەگەر شتێك نیشان بدات، هەر ئەوه دەڵێ که محەمەدئەمین زەکی خاوەنی زەین و عەقڵیەتێکی زۆر گەوره و دووربین و مەزن بووه، توانیویەتی له شتەکان وردبێتەوه و خوێندنەوەی تایبەتی بۆ بکات، که ببێته بەرنامه له دانشگەکاندا.

ئەمین زەکی جگه لەم بابەتانه کۆمەڵێك کتێبی لەسەر مێژووی کورد هەیه، وەك: مێژووی کورد و کوردستان. مێژووی دەوڵەت و ئەمارەته کوردییەکان. کوردی بەناوبانگ، که باسی (١٠٧٥) کەسی ناوداری کوردی تیایه، تأریخی سلێمانی وه وڵاتانی. محاسبەی نیابەت. دوو تەقەلای بێ سوود. بابەتێك لەسەر (زمانی کوردی) و بنەڕەت و پێکهاتەکانی و ئەدەبی کوردی . باسێك لەسەر (لەهجەکانی زمانی کوردی). چەند نامەیەکی بۆ عوسمانییەکان و پاشای عێراق و خەڵکی سلێمانی ناردووه، داوای مافی کورد و زمانی کوردی و مافی قوتابیان له بەغدا و موسڵ و ناوچەکان دەکات که کورد تیایدا کەمینەیه.

ئەگەر بابەتەکانی کۆبکرێتەوه له گۆڤار و ڕۆژنامه کوردییەکاندا ڕۆڵی دەبێت بۆ ڕۆشنکردنەوەی هەندێ لایەنی مێژوویی که تارمایی لەسەره، باسێکی دوور و درێژی لەسەر نەورۆز له ڕۆژنامەی (ژین)دا بڵاودەکاتەوه.

جگه لەوه پیرەمێرد کۆمەڵێك پرسیار له ڕۆژنامەی ژین دا دەکات وەك (ڕۆستەم) کێیه؟ پرسیار دەکات لەبارەی بەرزنجه و پیاوه ناودارەکانیەوه؟ جارێك دەپرسێ (بەبه) بابان چییه؟ ئەمین زەکیش ڕەگ و ڕیشه و مێژووی بابان بۆ یەکەمجار هەڵ دەداتەوه، ئەو پرسیارەی زۆر بەلاوه قورس دەبێت، بە پیرەمێرد دەڵێ دوعات لێ دەکەم که هەرگیز نەبیته مامۆستا، نەوەك پرسیاری قورسی ئاوا بۆ قوتابییەکان بهێنیتەوه، پرسیاری لێ دەکات لەبارەی دارا و ساسانی، ئایا کوردن یا فارس، ئەویش هەر لەسەر ڕووپەڕی ڕۆژنامەکه وەڵام دەداتەوه. (قانع)یش پرسیارێك دەکات به شیعر لەو ڕۆژنامەیەدا دەپرسێ: ئایا تابلۆکانی دەربەند گاور له قەرەداغ چییه؟ ئەمین زەکیش هەر بە شیعر که زۆر له شیعرەکانی قانیع وردتر و ناسکتره وەڵام دەداتەوه. پاشان وەڵامی پرسیارێکی شێخ سەلامی شاعیریش دەداتەوه. بابەتی له (گەلاوێژ و ژین و نزار)دا بڵاوکردووەتەوه، تەنانەت ئامۆژگاری کردوون و پێشنیاری بۆ کردوون که چۆن کار بکەن، نامەی تایبەتی بۆ ناردوون دەستخۆشی لێ کردوون و هانی داون بەردەوام بن و گۆڕانکاری له خۆیان و بڵاوکراوەکەیاندا بکەن و بەردەوام بن و ئاراستەیان تەواو بێت.

وا بزانم ئەمین زەکی یەکەمجار بە شیعر دەستی پێ کردووه، کاتێك که له قوتابخانەی ڕوشدییەی عەسکەری بووه له بەغدا ساڵی ١٨٩٢، کۆمەڵێك شیعری ناسکی عاتیفی لاواندنەوەی بۆ کورد و کارەساته کوردییەکان وتووه، پاشان له ئیعدادیەی بەغدادی عەسکەری ساڵی ١٨٩٨ پارچه شیعرێکی تری نووسیوه.

**ئەمین زەکی بەگ و نووسینەوەی مێژووی کورد:**

ئەو کاتەی ئەمین زەکی ئەفسەرێك بووه له سوپای عوسمانیدا، بە دڵ و بە گیان کاری بۆ دەوڵەتی عوسمانی کردووه، جیاوازی نێوان نەتەوەکانی نەدیوه، ئەو خۆی دەڵێ: (له دوای ئەوەی که له جێگەی ناوی گشتی عوسمانی، وشەی تورك و تۆرانی له تورکیا بووه بە باو، وەکو خەڵکی گەلانی تر، لەناو ئەو کۆمەڵەدا غیرەتی خۆم زیاتر جوڵاند و هانی دام که لەهەموو هەلێکدا ئەم هەستەی خۆم دەربخەم، بەڵام دەرهەق ڕەچەڵەك و مێژووی گەلەکەم هیچم نەدەزانی، چونکه تا ئەو کاته نه له قوتابخانه بیرێکی وامان درابوویه، نه له دوایيشدا هەستمان کردبوو که پێویسته و زەرووره وردەکاری له مێژووی کوردمان بکەین، وشەی گشتی عوسمانی که بۆ هەموو گەلان وەك یەك بوو، هەستی

نەتەوایەتی هەموومانی تا ئاستێك خاو کردبووەوە).
ئەمین زەکی لە جێیەکی تردا دەڵێت: (کە وشەی عوسمانی بە گشتی لاچوو، وشەی تورکی و تۆرانی جێی گرتەوە، ئیتر منیش هەستم جولا بەرەو گەلەکەم کە لە تورك جیایە، واتە جولانی هەستی نەتەوایەتی لە ڕەد فیعلەوە دروست بوو، ئەمە لە ساڵی ١٩٠٨دا بوو کە (حەرەکەی تورکیای فەتات) دروست بوو، بیرم کردەوە دەبێ یارەبی ئەم گەلی کوردە بۆ چ ڕەگەز و مێژوو و زنجیرە ڕەچەڵەکێك بگەڕێتەوە).
لە جێیەکی تردا دەڵێ: (زۆرجار ئەم پرسیارەم لە خۆم دەکرد: دەبێ گەلی کورد لە چ نەتەوەیەك بێت، چی بەسەر هاتووە؟ بەڵام نەمدەتوانی وەڵامێکی باش بدۆزمەوە، بە ناچاری لە چەند گەورەیەکی کوردم پرسی، دوانیش لەوانە مامۆستای مێژوو بوون (ئەم پرسیارەم لە دوو زانای کورد کرد کە مامۆستای مێژوو بوون) یەکیان ڕەچەڵەکی کوردی بە گێڕانەوەیەکی تێکەڵ و پێکەڵ بردەوە سەر (کوردی کوڕی عەمری قەحتانی)، ئەویی تریشیان کوردی بردەوە سەر نەتەوەی دێوێك بە ناوی (جاسان)، ئەم دوو وەڵامە بێخێرە بێ نرخانە زۆری سەغڵەت کردم و ئازاری دام، لەگەڵ ناخی خۆمدا قەول و قەرارم کرد، لەسەر خۆم فەرز کرد دەبێ خۆم لێکۆڵینەوەی لەسەر بکەم و ئەو نهێنییە بدۆزمەوە، لە ساڵی ١٩١٠دا دەستم بەو کارە کرد، خۆم ئەو ماوە لە ئەستەمبوڵ بووم، هەلێکی باش بوو، کاتە بێ ئیشیەکانم بۆ ئەم لێکۆڵینەوەیە داناو لە سەرەتای ١٣٢٦ی کۆچییەوە دەستم کرد بە سەردانی کتێبخانەکانی ئەستەمبوڵ، هەرچەند کاتم بۆ ئەمە کەم بوو، چونکە هەموو ساڵێك لەگەڵ کۆمسیۆنی سنوور لە دەرەوە خەریك دەبووم، لەم پشووە کەمە زۆر سوودم وەردەگرت، هەتا کۆتایی ١٣٢٨ چەند سەد سەرچاوەیەکم ئەم دیو دیو کرد (زانیارییەکی زۆرم کۆکردەوە) بەخت و ناوچاو ساڵی ١٣٢٩ بە کارێکی ڕەسمی گەیاندمیە ئەوروپا، لە ئەڵمانیا و فەڕەنسە لەوێ زۆر کتێبخانە و مۆزەخانە گەڕام، زۆر ئاسەواری بێ وێنەم چاو پێکەوت، زانیارییەکی زۆرم کۆکردەوە، سی چل کتێبی باشی گەڕۆك و دبلوماسان و ڕۆژهەڵاتناسانم لەسەر کورد کڕی، بەڵام لە دوای گەڕانەوەمان زۆری پێ نەچوو جەنگی جیهانی یەکەم دەستی پێ کرد، خزمەتی سەربازییم ئەم وردەکارییانەی پێ دواخستم، لە دوای شەڕی جیهانی (گەورە) کە چوومەوە ئەستەمبوڵ، سەرلەنوێ دەستم پێ کردەوە، کتێبە تازەکانم باش خوێندەوە، ڕەشنووسەکانم باش ڕێکخست و دەستم کرد بە نووسین و دوو سەد لاپەڕەیەکم حازر کرد، ئەوەندەی پێ نەچوو لە ساڵی (١٣٣٥ ك ١٩١٩ز) و لە جەژنی قوربان دا تووشی گرفتێکی گەورە بووم، لە کاتێکدا کە لە ماڵەوە نەبووم، گەڕەکەکەمان ئاگری تێ بەربووبوو، خانووەکەی منیش لەو ناوەدا سووتا و هیچمان بۆ دەرنەچوو، هەر بە ئاسانی ڕەنجی پێنج شەش ساڵم لە دەست چوو، نە سەرچاوەکان و نە ڕەشنووسەکانم مان، نە کتێب، ئەم کارەساتە گەورەیە زۆر نائومێدی کردم، هەتا چەند ساڵ نەهاتمەوە هۆش خۆم، دەستم هیچ سەرچاوەیەکی تری نەدەگرت و بەناچاری وازم لێ هێنا، دوای ئەم نائومێدییە بە دە ساڵ، واتە ساڵی ١٩٢٩ ی زاینی ڕۆژێك لە کتێبخانەی مەجلیسی نوابی عێراقدا چاوم بە (ئەنسکلۆپیدیای ئیسلام) دائیرەت معاریفی ئیسلام کەوت، بۆ ماوەیەك لێم وەرگرتن بە ئەمانەت، سەیر دەکەم بەڵگەنامەیەکی نایاب و نوێیە، کە لە ساڵی ١٩٠٥دا لەلایەن دەستەیەکی شارەزاوە دەستی پێ کراوە، لە بەرگی دووەمیدا باسێکی تایبەتی بە کوردی تیایە و لەلایەن ڕۆژهەڵاتناسێکی بەناوبانگەوە بەناوی (مینۆرسکی)یەوە نووسراوە، بە شەوقێکی زیادەوە دوو سێ جار خوێندمەوە، ئەو

**١-محەمەدئەمین زەکی ٢- سانیحە ٣- فاتمە ٤- بەدیع**

خوێندنەوەیە مەیلە کۆنەکەمی تازە کردەوە و بڕیارم دا سەرلەنوێ لەسەر ئەم بناغەیە (خولاسەی تاریخی کورد و کوردستان) بنووسم، لە پێش هەموو شتێکدا هێنام ئەو بابەتانەی کە لەگەڵ کورد و کوردستاندا پەیوەندی هەبوو هەموویم وەرگێڕا، بە گوێرەی بیبلۆگرافیاکەی ئەو سەرچاوانەی کە دەستنیشانی بۆ کردبوو، هەوڵی پەیدا کردنیم داو هەندێکم دەست کەوت، هەندێ سەرچاوەی تازەشم پەیدا کرد، هەندێ لە دۆستانیش یارمەتی پەیداکردنی سەرچاوەیان دام، زۆر سوودم لە ئامۆژگارییەکانی بەڕێوەبەری دائیرەی ئاسەواری عێراق (سیدنی سمیس) وەرگرت، کتێبە نایابەی خۆی لەگەڵ هەندێ کتێبی تری بۆ ناردم، زانیارییەکی باشیشی لەبارەی کوردستانەوە بۆ نووسیم، دوای کۆکردنەوەی ئەو سەرچاوانە، لە سەرەتای ساڵی ١٩٣٠ دەستم بە هەوڵدان کرد، ئەوکاتە وەزیفەم نەبوو، هەلێکی باش بوو، بە هەوڵی بەردەوام نزیکەی ساڵێك خەریك بووم، بەرگی یەکەم، کە (پوختەی مێژووی کورد و کوردستانە)، بەرگی دووەم کە (مێژووی حکوماتی کوردە) و (وڵاتی سلێمانی) و بەشێکی کتێبی (پیاوە گەورەکانی کورد)م پێگەیاند. واتە لەو ساڵەدا بەیەکجار هەموو کتێبەکانی نووسیوە، کە نزیك بە دوو هەزار لاپەڕە دەبێت، بە ڕاستی ئەمە توانایەکی گەورەیە بۆ ئەم نووسەرە سیاسییە عەسکەرییە، کە کاتی نەبووە و هەمیشە لە کار و دەرچوون و حەرەکاتدا بووە، ئەگەر بهاتایە ئەو کتێبەی پێشتری کە بە دڵێکی خۆشترەوە و بە سەرچاوەی تەواوەوە، وەك خۆی دەڵێ سەدان سەرچاوەی بۆ خوێندووەتەوە، بمایە، زۆر لەم بەرگانە بەهێزتر و دەوڵەمەندتر و بەنرختر دەبوو، چونکە لە مەکتەبە سووتاوەکەیدا هەموو لاپەڕە نووسراو و سەرچاوەکانیشی فەوتاوە، پاشتر لەو نائومێدی و وازهێنانی چەند ساڵەدا لەگەڵ کەمی سەرچاوەدا، ئەم کارە بەنرخە بێ وێنەیەی کردووە، کە هەتا ئەمڕۆی لەگەڵدا بێت، لە چاکترین و پاکترین و بێلایەنترین بەرهەمە دەوڵەمەندە مێژوویییەکانی مێژووی کوردە، گەر ئەم پیاوە وازی لە کارە سەربازییەکەی بهێنایە، لەو بڕوایەدام کارێکی بەنرخ لە هاوشێوەی کارل بروکلمان و ول دیورانت و تیونبی و ئیبن خەلدونی دەکرد، بەڵام مەخابن سووتانی کتێبخانە و کارە سەربازی و ئیدارییەکانی، ڕێگرێکی گەورە بوون لەبەردەم ئەوەی کە کورد تووشی ئەو خێرە گەورە نەبڕاوەیە بێ.

## نرخی مێژوو لای ئەمین زەکی بەگ:

ئەمین زەکی گلەیی لە شەرەفخان دەکات دەڵێ:
(بەبڕوای من شەرەفخانی بەدلیسی نەدەبوو شەرەفنامە بە فارسی بنووسێ، بەڵام مەلا ئیدریسی بەدلیسی (هەشت بەهەشت) ی بە تورکی نووسی قەیدی نییە، چونکە مێژووی عوسمانییە)، هەروەها باسی کتێبەکەی خۆشی دەکا و دەڵێ:
(من هەرگیز ناڵێم کتێبەکانم تەواو و بێ کەموکووڕییە، لەگەڵ ئەوەی کە سوودم لە دوو سەد و پەنجا بەرگێك لە سەرچاوە ئینگلیزی و فەڕەنسی و ئەڵمانی و عەرەبی و تورکی و فارسی وەرگرتووە، بەڵام هەر کەموکورتی هەیە، تەنها بناغەیەکە بۆ لاوان و خوێندەوارانی کورد ئەتوانن بەشێنەیی تەواوی بکەن، و بۆ مێژووی کۆنی کورد، لە هەموو زیاتر هەوڵم داو چوار جار ئەم باسەم سەرلەنوێ نووسییەوە و بەسوود لە سەرچاوەی نوێ و بەنرخ ساغم کردەوە، ئەگەر نکوڵییەکی هەبێ خەتای من نییە، هەر ئەوەندە سەرچاوە هەیە، لە بەشی ڕووداوەکانی کورد و کوردستاندا، ڕووداوێکی پەیوەست و ڕێك و پێك و تایبەت بە کورد نابینرێ، هۆی ئەمەش ئەوەیە کە لێکۆڵینەوە و باسێکی تایبەت بە گەلی کورد نییە، ئاسەواری ڕۆژهەلات و ڕۆژئاوا باسی کورد و ڕووداوەکانی و پیاوە گەورەکانی کوردیان تەنیا بە مناسەبەتی هەندێ ڕووداوەوە باس کردووە، زۆربەیان کەموکورت و پچڕپچڕە، بە کورتی سەرچاوە ڕۆژئاوایی و ڕۆژهەڵاتییەکان بەرامبەر مێژووی کورد زانیارییەکی ڕێکوپێکیان بۆ من تیانەبوو، دوور نییە ئەگەر بەردەوام بگەڕێی ئەو کەموکورتییانەش چاك دەکرێ، ئەم خزمەتەش کاری لاوانی ئەمڕۆ و سبەینێیە، زۆر تکایان لێ دەکەم، وەك هەندێ نووسەرانی کوردی دوێنێ و ئەمڕۆ، لە مێژوونووسیندا مل بۆ هەست و خەیاڵ نەدەن، لە خۆیانەوە هیچ هەڵنەبەستن و ڕووداوی مێژوویی نەگۆڕن، بۆ ئەو لێکۆڵینەوە و باسانەی کە دەیاننووسن، بەڵگەنامەیەکی بەنرخ و ڕاست و دروست نیشان بدەن، ئەگەر وا نەکەن، ڕەنجیان بەزایە دەچێ، نووسینەکەیان نرخێکی زانستی نابێ، لەلایەکی تریشەوە خۆیان و گەلەکەیان ترۆ دەکەن، من بەم کارەی خۆم تێگەیشتووم کە گەلی کورد و مێژووەکەی هیچ پێویستی بەم جۆرە شتانە نییە، سەربەرزی و شانازی مێژوویی زۆرە، ئەبێ بۆی بگەڕێین و بیدۆزینەوە، ئەمە وەزیفە و کاری پێگەیشتوانی کوردە...!!).
ئەم وتە و ئامۆژگارییانە، ئەم وردەکارییانە خوێندنەوەیەکی نوێیە بۆ مێژوو، کە ئەمین زەکی دەیەوێ فێرمان بکات، چۆن مێژوو دابڕێژینەوە و بنووسینەوە، ئەمە مانای دەرهێنان و گەڕانە بە دوای مێژوودا، ئەمەیە فەلسەفەی مێژوو، کە بۆ یەکەمجارە لە کورددا دەوترێ و وەك ئیبن خەلدونی عەرەب ( ڤۆڵتێر) ی ئەوروپی، بەڵام درەنگ کورد دەستی پێ کرد.
ئەمین زەکی بەهرەیەکی ئەدەبی و هونەری لە ناخیدا

هەبوو، جگە لەوەی کەسێکی زیرەك و پاك بوو، هەرچی بخوێندایەتەوە و ببیستایە و ببینیایە وەری دەگرت و لای تۆمار دەبوو، خاوەنی بەهرە و داهێنان بوو، ئەو دوو سیفەتە بەسە بۆ کەسی نووسەر و رۆشنبیری جددی و دڵسۆز، ئەو سەرەتا لە دوانزە ساڵیدا بە شیعر دەستی پێ کرد، شیعرەکانیشی مێژوویی بوون، هەستی نەتەوایەتییان پێوە دیاربوو، کە دیار بووە هەر لە منداڵییەوە لەناخیدا لەگەڵیدا شێلراوە، پاشتر ئەو بەهرەیەی لا گەورەتر و فراوانتر بوو، ئەو لەبارەی مێژووەوە دەڵێ: (هەر گەل و وڵاتێك ڕابردووی پشتگوێ بخات و گوێ بە داهاتووی نەدات، پاشەڕۆژی هەر ئاوابوونە، چاك وایە هەموو گەلێك بەرچاو ڕوون بێت لە مێژوو و ڕابردووی و، کاروباری ئەمڕۆشی چاك بکات، هەتا پاشەڕۆژێکی چاك ئامادە بکات و ببیاتە ئاستی گەلە پێشکەوتووەکانەوە، ئۆف بۆ ئەو گەلانەی کە هەر بە ڕابردوویان دەژین و بەس، دەبینی هەر باسی پاڵەوانەکانی دەکات، بەڵام ئەمڕۆ لەژێر باری قورسدا دەناڵێنی).

پاشان دەڵێ: (گومانی نییە کە ڕەوشت بەرزی و زانست، سەروەت و سامانی ڕاستەقینە و سەرچاوەی سەربەرزی و گەورەیی میللەتانە، ئەمەش ئەوە ناگەیەنێ کە ڕێز بۆ مێژوو دانانێم، من مێژووم لا بەرێزە، توانیویەتی پارێزگاری دەنگ‌و باسی ئەو گەورانەی کردووە، کە بوونەتە باشترین نموونە لە ڕەوشت و سەرکردایەتی، دەتوانین سوود لە بیرو کردەوەیان وەربگرین، بەجۆرێك کە لەگەڵ ئەمڕۆدا بگونجێ، لەوەوە دیارە کە ڕابردوومان چاك کردووە و خۆمان بۆ ئایندە ئامادە کردووە!! ئەو کتێبانەی وەك (وفيات الأعيان و فوات الوفيات و طبقات الشافعيه) و زۆری تر، زۆر بە داخەوە ئەو مێژوونووسە کوردانە کە ژیانی خۆیان فەوتاندووە بۆ دانانی کتێبی لەو جۆرە، هیچ مەبەستێکیان نەبووە لە سادەیی گێڕانەوەی ئەو چیرۆك و زنجیرە ناو و مێژووانە، جگە بینینی لەزەت و خۆشی و کات بەسەربردن بۆ خوێنەر.

بەڵام من لە کتێبەکاندا تێبینیم کردووە، هەموو گەلێك دەیەوێ لاوەکانی بە ژیانی گەورەکانی فێر بکات، منیش ئەوە بە پێویست دەزانم لە بەرنامەی قوتابخانەکاندا، بۆ زیندووکردنەوەی گیانی نیشتمانپەروەری لە لاوەکانماندا، کورد لە زۆر گەل کۆنترە و مەزنی گەورەی خستووەتەوە، وەك سەلاحەددین کە چاك ئاڵای ئیسلامی بەرزکردەوە، ئایا مێژوویان نییە ئێمە سەربەرز بکات و شانازی پێوە بکەین، چەند ساڵ خۆم ماندوو کرد کتێبێکم دەستکەوێ ئەوانم پێ بناسێنێ، هیچم دەستنەکەوت و پرسیارەکەم بێ وەڵام مایەوە، ئەوە زۆر ئازاری دام، کە زۆر نووسەری کورد باسیان لە گەورەکانی گەلانی تر کردووە و مەزنەکانی خۆیان لە یاد کردووە، لێرەوە هەستم کرد بە پێویستی ئەم کتێبە (مشاهير الكرد)، کە لە کتێبی (مێژووی کورد و کوردستان)ە کە بەلامەوە قورستر بوو، من لە نووسیندا شێوازێکم هەیە، حەزدەکەم ئەو بابەتەی دەینووسم زۆر قورس و گران بێت، هەتا کتێبی زۆر و سەرچاوە و کتێبخانەی زۆری بۆ بگەڕێم و سەدان بەڵگەنامەی بۆ بگەڕێم، ئەو سێ کتێبەشم (مێژووی کورد ـ مێژووی سلێمانی ـ ناودارانی کورد) شتێکە لەوانە، لەوانەیە بۆ ناودارانی کورد بە قەدەر ژمارەی کەسەکان کتێب و سەرچاوەی کۆن و نوێ گەڕابم، ئەم کتێبەم هەرچەند بە کوردییە، بەڵام من دەمەوێ مەزنەکانمان بە گەلانی تر بناسێنم، بەتایبەت بە جیهانی ئیسلامی و عەرەب، چونکە ئەو هەوڵەی کە هەندێ لەو مەزنانەی کورد بەختیان کردووە بۆ بەرزکردنەوەی ئاین و زانیارییە ئایینییەکان و ئەدەبی عەرەبی، دەبێ لەبیر نەکرێ، جێی خۆیەتی بە ئاوی ئاڵتوون بنووسرێ لە مێژووی عەرەبدا، بەداخەوەم ئەو مەزنانە هەقی خۆیان نەدراوەتێ، لەبارەیانەوە لێکۆڵینەوە نەکراوە و، لەبارەی گەلەکەشیانەوە هیچ نەکراوە، کە سەدان هەڵکەوتەی بەخشیوەتە جیهانی ئیسلامی و عەرەبی، وەك ئەمیری شاعیران ئەحمەد شەوقی لە میسر و زەهاوی و ڕەصافی لە عێراق، وام بە چاکزانی ئەم کتێبە بە عەرەبی بوایە، هەتا ئەوانە بناسێنم بە غەیری خۆیان، بەڵکو ئەو ناساندنە هەندێ ڕێز و خۆشەویستی لێ بکەوێتەوە لەوانەوە بەرامبەر بە کورد، ئەم کتێبە لەلایەن (سانیحەی کچمەوە) کراوە بە عەرەبی و هەڵسا بەم کارە قورسە).

ئەوەی لەم کارانەدا بەدەردەکەوێت ئەوەیە کە ئەمین زەکی مێژوونووسێکی دڵسۆزە، توانیویەتی زۆرترین زانیاری لەسەر کورد کۆبکاتەوە و لەیەك بەرگدا مێژووی کۆنی بنووسێتەوە، هەتا ئەمڕۆش کارێکی بێ وێنەیە، ئەوەشی دەنووسرێت هەر سوود لەوانە دەبینێ، کەسێك نییە توانیبێتی لەسەر مێژووی کۆنی کورد و میرنشینە کوردییەکان بنووسێ و ئەمین زەکی بە سەرچاوەی سەرەکی خۆی نەزانیبێ.

ئەمین زەکی بڕوای تەواوی بە یەکێتی مێژوو هەیە، ئەو بڕوای وایە مێژووی کورد یەك پارچەی تەواو و لێك ئاڵاوە، لە سەرەتای مێژووەوە تا ئەمڕۆ لێك پچڕانی نەبووە، بەردەوام لەگەڵ سەردەم و قۆناغەکاندا خۆی گونجاندووە و ڕۆشتووە و ئامادەیی و بەرهەمی بووە.

ئەمین زەکی بڕوای بە یەکێتی خاك و جوگرافیا هەیە، بڕوای وایە ئەو خاکەی کە یەکەمجار کوردی لەسەر لەدایکبووە و ژیاوە، هەر ئەو خاکەی ئەمڕۆیە کە

بەردەوامی بە ژیانی داوە و مێژوویەکی بۆ دروست کردووە.
ئەو وەکو مێژوونووسانی پێش خۆی نەکردووە، کە بگەڕێ ڕستەی دەماودەم و قسە و باس و چیرۆکی ئەم و ئەو لە کۆڕ و مەجلیس و شەوچەرەکاندا وەرگرێ و کۆیانکاتەوە و بینووسێتەوە، ئەو یەکەم کەسە لە مێژووی کورددا کە گەڕاوە بەدوای سەرچاوەی نووسراو و باوەڕ پێکراو و تەحقیق کراودا و وەریگرتووە و ڕێکیخستووە و مێژوویەکی وەك ئەوروپییەکان نووسیوە، وەك شەرەفنامە و تەبەری نەکردووە کە دەماودەم شتی وەرگرتووە.
ئەو یەکەم کەسە کە سنووری باوی ناوچەکەی بەزاندووە، سنووری دابونەریتی سەردەمی پچڕاندووە، سوودی لە سەرچاوەی گاور و ئەوروپی وەرگرتووە، کە پێشتر بڤە بووە موسڵمانێك کتێبی گاورەکان بخوێنێتەوە، نەخوازەڵا سوودی لێ ببینێ و وەك سەرچاوە بەکاری بهێنێ، ئەو چووەتە ئەوروپا و گەڕاوە، چی گەڕۆك و ڕۆژهەڵاتناس و دبلۆماتەکان لەسەر کورد نووسیویانە، خوێندوویەتییەوە و لە یەکی داون و لە خۆیان جوانتر بۆ سوودی مێژووی کورد بەکاری هێناونەتەوە، کە پێشتر هیچ کوردی تر وای نەکردووە.
ئەمین زەکی لە نووسینەوەی مێژووەکەیدا زانستانە کاری کردووە، لە هیچ جێیەك دا شتی نازانستی و پڕوپووچی نەهێناوە، سوودی لە ئەفسانە و شتێك وەرنەگرتووە، کە لەگەڵ عەقڵکاریدا پێك نەیەتەوە، بە تەواوی دژی ئەفسانە و خورافیات و هەڵبەستن بووە، زۆر مێژوونووس وەك تەبەری و مەسعودی و ئیبن ئەسیر و ئیبن وەردی و تەنانەت بەکری و شەرەفنامەش زۆر لە ئەفسانە و خورافیات و نەگونجاویان بۆ سەرەتای مێژووی کورد تەنیوە، بە نەوەی شاخ و کێوی و دێو و درنج و خێو باسیان کردووە، بەڵام ئەمین زەکی تەنها ئەو شتانەی بۆ سەرەتای دروستبوونی کورد و مێژووەکەی نووسیوە کە زانستین، جێی قبوڵکردنی عەقڵ و بڕوای مرۆڤن، تەنانەت داوا لە گەنجان و لاوانی کورد دەکات، کە هەوڵ بدەن تەنها ڕاستی بنووسن و خۆیان بە دووربگرن لە هەڵبەستن و درۆ و شتی ناجۆر، مێژووی کورد هیچ پێویستی بەو شتانە نییە.
ئەمین زەکی بڕوای بە نووسینەوەی دەوری نییە لە مێژوودا، هەروەك لێکۆڵەرە ئەوروپییەکانی کردووە، نەهاتووە بە ساڵ شت بنووسێ، واتە هەرچی لەو ساڵەدا ڕووی دابێ بە زنجیرە ئەوە بنووسێ، لە ڕووداو و مردن و لەدایك بوون و شتی تر، ئەوە زانستی نییە و زۆر خوێنەر حاڵیی ناکات.
ئەمین زەکی کارێکی جددی و تەواو و زانستی کردووە، بابەتەکانی بۆ فێرکردن و ورياکردنەوەی گیانی نەتەوەییە، ناساندنی کورد و مێژووی کوردە بە خوێنەر و بە دونیا، لە قاڵبێکی زانستیانەدا، ئەم مێژووی بۆ خۆشی و لەزەت و تاقەت و تەسلییە نەنووسیوە، ساڵ بە ساڵ دوای ڕووداوەکان نەکەوتووە، نایەوێ خوێنەر بە دوای خۆیدا کێش بکات و گەشتی پێ بکات و تەنها

کردنەوەی پردی ئاسنینی فەللوجە، ١٩٣٢/٤/٥ لەلایەن مەلیك فەیسەڵی یەکەمەوە سەردەمی دووەم کابینەی نووری سەعید
١-محەمەدئەمین زەکی ٢- جەعفەر عەسکەری ٣- مەلیك فەیسەڵی یەکەم ٤- نووری سەعید

ڕووداوی پێ نیشان بدات، بەڵکو ئەو دەیەوێ بەرامبەر تێبگەیەنێت کە کورد چییە و کێیە، ڕەچەڵەکی چییە، چۆن ژیاوە و چۆن کاریگەری دەوروبەری لەسەر بووە، چۆن وەڵامی ڕووداوەکانی دەوروبەری خۆی داوەتەوە، ئەزموونەکانی هەڵە بوون یان ڕاستەقینە بوون، کار و شەڕ و بەڕێوەبردنی واقیعیانە بووە.؟
نابینی لە جێیەکدا بەشان و باهۆی کورددا هەڵی دابێ، نایەوێ میر و ئاغا کوردەکان بەرز و مەزن بکات و زیاد لە سنووری خۆیان بەرزیان بکاتەوە، ئەو چی دیوە لە سەرچاوەکان دا، وەك خۆی گواستویەتییەوە، لەگەڵیدا هەڵچوون و داچوونی نەکردووە، مامەڵەی زانستییانەی لەگەڵدا کردووە، سەرچاوە تورکی و فارسی و عەرەبی و ڕۆژهەڵاتناسە ئەوروپی و ڕووسییەکانی بەکارهێناوە، بێلایەن بووە لە شیکردنەوە و ڕا دەربڕیندا. نووسینەکانی بە یەکەم کتێبی زانستی مێژوویی کوردی دادەنرێ، کە گشتگیرە و هەموو مێژووی کوردی لە سەرەتاوە تا ڕۆژانی نووسەر نووسیوە، هەرچەند لە چەند جێوە بۆی تەواو نەکراوە، بەوجۆرە نییە کە تەنها لەسەر سەردەمێك یان کەسێك یان قۆناغێکی مێژوویی نووسرابێت.
نووسینەکانی ئەمین زەکی نزیکە لە نووسینێکی فەلسەفی زانستییەوە، کەچی وشکی و قورسی و سارد و سڕی پێوە دیارنییە، بەڵکو نەرم و خۆش و حەز دەکەیت بیخوێنیتەوە و بەدوای بڕۆیت.
هەروەها ئەمین زەکی حەزی کردووە ژیانی مەزنان و کەسایەتییە مێژووییەکانی کورد بنووسێ، وەك خۆی باسی دەکات (زۆر خەفەت و ئازارم چەشت کاتێك دەگەڕام و دەمویست شتێك لەبارەی سەلاحەدینی ئەیوبییەوە بزانم، بەڵام لە هیچ کوێ دەستم نەکەوت)، ئیتر لەوێوە هەوڵی دا ژیاننامەی گەورەکان بناسێنێ بە کورد خۆی و گەلانی دراوسێی کورد و، بلێ کوردیش خاوەن مەزنانی خۆیانن و دەستیان هەیە لە بناغەدانانی شارستانیەتی ناوچەکەدا، ئیتر لەوێوە توانی ژیانی (١٠٧٥) کەسایەتی کوردی بنووسێ کە لە سەردەمی ئیسلامدا ژیاون، خۆی دەڵێ بۆ ئەم کارەیان زۆر زیاتر تووشی ئازار و زەحمەت و مەینەتی بووم، تا بۆ دوو بەرگە مێژووییەکەی یەکەم..؟!
بەڵام ئەوەی لە مێژووەکەی ئەمین زەکیدا جێی نکوڵییە، بەهیچ کلۆجێ باسی لایەنی دەروونی و کۆمەڵایەتی و هونەری و ئەدەبی و ئابووری کورد لە هیچ قۆناغێکدا ناکات، کە بە مەرجێ ئەو ماوەیەکی باش وەزیری ئابووری و مەعاریفی عێراق بووە، کەسایەتییەکی ڕۆشنبیر بووە، هاوڕێی نووسەر و ڕۆشنبیرانی کورد و عێراق بووە. دەیتوانی دەزگایەکی ڕۆشنبیری وەك پیرەمێردی هەبوایە و گۆڤار و ڕۆژنامەی دەرکردایە، دەبوو هەندێ لەو لایەنانەی کوردی باس بکردایە.

**ئەمین زەکی و سیاسەت:**

ئەوەی بەلامەوە سەیرە لە ژیانی ئەم کەسایەتییە سەربازییە سیاسییە ڕۆشنبیرە کوردەدا دیار نییە، ئەوەیە کە هەرچەندە کەسایەتییەکی هێمن و لەسەرخۆ و ڕووخۆش و نەرم و نیان و دڵسۆز بووە، بەڵام بەشداری لە هیچ پارتێکی تورکی یان کوردیدا نەکردووە، ئەو دەیتوانی گەر لەو کاتە هەستیارە ناسکەدا، پارتێکی کوردی دروست بکردایە، لە هاوشێوەی پارتەکەی مستەفا کەمال ئەتاتورکدا، لەو ڕێگەیەوە داوای مافی ڕەوای کوردی بکردایە، بەهۆی ناسراوییەکەیەوە لە لایەن ڕووس و ئەڵمانیا و فەڕەنسا و حکومەتی تورك و عێراقەوە، ڕەنگە بیتوانیایە پشتیوانی بە دەست بهێنێ و، بەکاری دبلۆماسی و مەدەنیانە لەوکاتەدا هەندێ شتی بکردایە و کێشەی کوردی جوانتر و گونجاوتر بدایە بە گوێی ئەو ڕژێمانەدا و، داوای مافی میللەتەکەی بکردایە، بەڵام مەخابن ئەمین زەکی ئەو تواناییەی هەر لە بواری مێژوو نووسیندا بەخت کرد، کارێکی گەورەی کرد، بەڵام دەکرا کاری مەزنتریشی بکردایە.
لەوە دەچێ ئەمین زەکی کە دوای ڕووخانی دەوڵەتی عوسمانی لە حکومەتی عێراقیدا دەسەڵاتی هەبووە، حکومەتی عێراقیش لە ژێر ئینتیدابی بەریتانیادا بووە، ڕەنگە ترسا بێت لە بەریتانییەکان، بەشداری کاری سیاسی کوردی دژی داگیرکاری بەریتانی نەکردووە، چونکە گرووهێك لە ڕۆشنبیران و سیاسەتمەدارانی کورد سەردانی دەکەن، داوا دەکەن کە یارمەتیان بدات لە پارتێکی سیاسی کوردیدا، ئەو بە هەموو دڵی ڕەدی دەکاتەوە و یارمەتیان نادات، وا دیارە چەندین جار چوون و نائومێد گەڕابنەوە، بۆیە ئیتر وازیان هێناوە لەوەی هیچ پرس و ڕایەکی پێ بکەن، (ئەحمەد خواجە کوڕی خواجە ئەفەندی) دەگێڕێتەوە ساڵی ١٩٢٨ لەگەڵ بابەعەلی کوڕی شێخ مەحموودی حەفید بە جووتە چوونەتە لای ئەمین زەکی، دوای ئەو جارە چەند جاری تر ئەحمەد خواجە چووەتە خزمەت ئەمین زەکی، دیویەتی سەرقاڵی خوێندنەوە و نووسین بووە، جارێکیان لێی پرسیوە خەریکی چییت..؟ لەوەڵامدا وتوویەتی: خەریکی ئاوەدانکردنەوەی کەلاوەکانم... دیارە مەبەستی زیندووکردنەوەی مێژووی شێواو و کاولی کورد و کوردستانە.
پاشان ئەحمەد خواجە لە وەڵامێکی نامەیەکی کەمال مەزهەردا چەند ڕاستییەکی درکاندووە و دەڵێ:
سەرەتای مانگی ئابی ١٩٢٨ بڕیاردرا کۆمەڵێکی سیاسی دابمەزرێنن، بۆ دەستپێکردنی ئەم بڕیارە، ڕەشید نەجیب و مەحمود جەودەت و خەڵەف شەوقی داودی و ئەحمەد خواجە گەشتنە خزمەت ئەمین زەکی، بە

تەواوی پێویستییەکانەوە باسی کۆمەڵەکە کرا، ئەمین زەکی ماوەیەك دۆش داما، لە دواییدا فەرمووی: (من ناڵێم تێ مەکۆشن، چونکە بەبێ تەشەبووس هیچ ناکرێ، بەڵام ئێوە ئەمینن کە بتوانن ئیدارەی ئەو کۆمەڵە بکەن..؟ ئێمەش زۆر خەریك بووین هیچمان پێ نەکراو نەتیجەش بە باش نەگەڕا، من ناتوانم تێکەڵتان ببم، بە فکری من (بەبڕوای من) ناجح نابن، مەنعیشتان ناکەم، چونکە واجبتانە، لە لزومیشدا لێتان دوور نابم، شەرتی یەکەم ئەسرارە، سڕتان دەرنەچێ، لە ئێستاشەوە تێتان ئەگەیەنم، بە سڕی پێتان ئەڵێم ئەم نەوعە تەشەبووسانە بە نەزەری ئینگلیزەکان مەرغوب نییە، مکافەحە ئەکرێن..
لە دوا قسە وتی: کاك مەحموود جەودەت ئەبێ لەسەرخۆ بیت، عەصەبیەت بێ فائیدەیە). گەڕاینەوە و کۆمەڵ بڕیارەکەی بەجێ هێنا و (حیزبی پشتیوان) دامەزرا، ئیتر بە باشی نەزانرا لەم بابەتەوە ئەمین زەکی بەگ تێکەڵ بکرێ یا پرسیاری لێ بکەین..).
ئەمین زەکی باوەڕی بەو جۆرە ڕێباز و کار و چالاکییانە نەبوو، بەلای ئەوەوە خوێندن و خوێندەواری تاکە چرای ڕێگەی سەرفرازی گەل بوو، لەم بارەیەوە ئەحمەد خواجە ئەو سەرگوزەشتەیەش دەگێڕێتەوە و دەڵێ: (جارێکیان ئەمین زەکی بەگ لەگەڵ خۆی بردمی بۆ وەزارەتی ئەوقاف، ئەوسا ئەو وەزیری ئەوقاف بوو بە وەکالەت، کە دانیشتین فەرمووی: خاڵۆ باوکت باوکمە و تۆش برامی، بۆ ئێمە ئەمڕۆ چەکبازی و خۆبەکوشتدان بەکارنایەت، لە سوژن بێکەس تر کوردە، کەوابوو دەرمانی دەردی ئێمە خوێندنە، عیلم و سەقافەت ئەبێ بە هۆی ڕزگاری، قەسەم بەسەری باوکت، ڕۆژێك ئەبێ لە عالەم دا ژێردەستی و ئەسارەت نامێنێ، هیندو هەموو ڕەشەکانی ئەفەریقیا دێنە ڕیزی بەریتانیاوە، بەڵام ئەوەش بزانە کورد لە هەموویان مستەهەقتر و لەپێشترە، لەبەر ئەوە من ئەڵێم تێکۆشن بۆ خوێندن) دیارە ئەمین زەکی بەگ باوەڕی بە خوێنڕشتن و شۆڕشی چەکداری و سیاسی نەبووە، یان بڕوای بە کەسەکان نەبووە، بە تایبەت بنەماڵەی شێخ مەحموود، ترساوە ئەمان بیکەن و ئەوان بیقۆزنەوە و بیخۆن، یان بەریتانیا ی ناسیوە کە داگیرکەر و دڕندەیە، یان دۆخەکەی بە نالەبار زانیوە، یان بڕوای بە میللەت نەبووە کە یارمەتیان بدەن، ئەوە هەموو ڕا و بۆچوونە بۆ شیکردنەوەی مەبەستەکانی ئەمین زەکی، من خۆم (نووسەر) وای لێکدەدەمەوە، شەرت نییە ئەمین زەکی وای ڕوانیبێ، دیارە ئەو کەسایەتییەکی شارەزا و زانایەکی بەتوانا و سیاسییەکی وردبین و دوور بین بووە، ئاگاداری کورد و دۆخ و سەردەم و دوژمنەکانیشی بووە، پێشبینی شتی کردووە و ڕاست دەرچووە، ئەوەتە ئەفریقیا و هیندستانیش لە بەریتانیا ڕزگاربوون و لە ئاستی ئەوەدان، بەڵام کورد هەر ماویەتی، لای ئەمین زەکی کورد زۆر دواکەوتوو، نەخوێندەوار بووە، گلحۆ و ساویلکە و خۆش باوەڕ بووە، هیچ هەستی نەتەوایەتی و شارەزایی بارودۆخی نەبووە، ئەو ویستوویەتی لە پێشەوە میللەت خوێندەوار بکرێ، ئەوە دەرمانی هەموو دەردێکە، ئەوسا هەوڵی تر بدرێ و بینا لەسەر ئەو خوێندەوارییە بکرێ.
وا دەزانم ئەمین زەکی بڕوای بە پێکهاتەی سروشت و هەست و ناخ و باری ڕەوشتی و کۆمەڵایەتی کورد نەبوو، بیر و زەین و کلوری ناواخنی کوردی ناسیوە، بڕوای نەبووە بە شێوازی سیاسی و سەربازی کار بۆ کورد بکرێ، دەیزانی جگە لەوەی سەرکەوتوو نابن، ئەوەندەی تر کورد پەرت و جیاواز دەکەن و ڕەفتاری کورد دەشێوێنن، لە کۆتاییدا کورد دەکەنە پیاوی دوژمن، سەد ساڵی تر دوای دەخەن، ئەوەتا سەرکردەکانی کورد زیاد
لە شەست
ساڵە خەریکن، منافەسەی ناشەریف دەکەن، ئەوەندەی دوژمنی یەکن، دوژمنی داگیرکەر نەبوون، ئەوەندەی لەیەکیان کوشت لە دوژمنیان نەکوشت، مێشکی کوردیان شێواند، هەستی نەتەوایەتییان مراند، میللەت سەرگەردان و گەندەڵی فراوانتر دەکەن، ئەمین زەکی، شێخ مەحموودی لەبەرچاو بوو، میری میرنشینە کوردەکانی دیبوو، چیان بەیەك و چۆنی سەمایان بۆ دوژمن دەکرد، چاکترین پواز بەیەك و خۆخۆری یەکبوون، لەوەوە مەزەنەی ناخی کوردی بۆ دەرکەوتبوو، کە دەبێ کورد خوێنەوار و ڕۆشنبیر بکرێ، ئەوسا کاری سیاسی بۆ بکرێ.
ئەو دڵسۆز بووە بۆ کورد، چەند
جار بووە بە ئەندامی نوێنەران (مجلس النواب)، جاری یەکەم لە یەکەم خولی ئەو ئەنجومەنەدا بوو کە ڕۆژی شازدەی تەمووزی ساڵی ١٩٢٥ دەستی بە کارەکانی کرد، دواجاریشیان لە خولی دەیەمینی ئەنجومەندا بووە کە ڕۆژی ٩ی تشرینی یەکەمی ساڵی **١٩٤٣** دەستی بە کارەکانی کرد، پاشان لەبەر توانایی ئەمین زەکی، بەپێی فرمانێکی تایبەتی کۆشك کرایە ئەندامی ئەنجومەنی پیران (مجلس العیان) کە ئەندامەکانی لەلایەن مەلیکەوە دادەنران، هەر کەسێك پایە و مەقامێکی تایبەتی نەبوایە بۆ ئەو شوێنە هەڵنەدەبژێررا.
ئەمین زەکی لەناو هەموو عێراق و پێشتریش لەناو لێپرسراوانی باڵای عوسمانیدا ناسراو بوو، لەعێراق چەندە لای کورد ناسراو بوو، زیاد لەوە لە بەغداد و لای عەرەب و تورك و کاربەدەستان و کۆشکی مەلەکی ناسراو و دیار بوو، وەك پەرلەمانتار لە ڕۆژگاری پاشاییدا، یان هیچ نەبێت تا چلەکان، نە لەناو کورد

و نە لەناو عەرەبدا، یەکێك نەبوو بتوانێت شان بدا لە شانی ئەمین زەکی، دوو ڕاپۆرتی زۆر نایابی پێشکەش بە ئەنجومەن کردووە، یەکەمیان دەربارەی خوێندن و پەروەردەیە لە ناوچەی کوردەوارییەکاندا، دووەمیان دەربارەی کاروباری لەشکرە، دوو ڕۆژ بەر لەتەواوبوونی خولی یەکەمی ئەنجومەن، ڕۆژی ٢٨ی کانوونی دووەم ١٩٢٨ ئەمین زەکی بەگ نامیلکەیەکی ئامادە کرد بەناونیشانی (محاسەبەی نیابەت) کە هەمان ساڵ لە بەغدا بە چاپی گەیاندووە، لە سی و یەك لاپەڕەی قەبارە مامناوەندیدایە، هەر لەسەر بەرگی نامیلکەکەوە ڕووی دەمی کردووەتە موەکیلە موحتەرەمەکانی و پێیان دەڵێ: (ئەوی حیسابی پاکە لە محاسەبە بێ باکە) ئەنجا بە وردی ئەمین زەکی نوێنەری سلێمانی، باسی ئەو کارانەی دەکات لە گشت بوارەکاندا، کە لە ماوەی دوو ساڵ و نیوی خولی یەکەمی ئەنجومەندا بۆ خزمەتی شارەکەی کردوونی، کۆتایی نامیلکەکەی بەم دوعایە دێنێت کە ئیمڕۆ هەموو کوردێك زۆر لەوسا پتر پێویستی پێیەتی: (ئیتر تەمەنام لەقاپی خوای تەبارەك و تەعالا ئەمەیە کە خاصیەتی برایەتی و ئیدراك و فەزیلەتی دووربینی
و ئیخلاصات زیاتر کا
و دڵمان لەگەڵ یەکتریدا چاك
و پاك بفەرموێ، لە مصیبەتی
حەسەد و غەرەزو لەبەلای نیفاق
و ئیختیلاف بە دوورمان بکات،
والسلام علی من اتبع الهدی،
١٩٢٨/١/٢٦ محمد ئەمین زەکی).
بەڵگەنامەیەکی ئینگلیزەکان
بەسەر سورمانێکی زۆرەوە باسی
(محاسەبەی نیابەت)ی کردووە،
بەرز نرخاندوویەتی، دەڵێت
ئەو جۆرە ڕەفتارە تەنها لەناو
پارلەمانتارەکانی وڵاتە ڕۆژئاواییە
پێشکەوتووەکاندا باوە،
بەڕاستی ئەمە شێوازێکی
نوێیە لە عەقڵە گەورەکەی
ئەمین زەکی کە
ئەوروپییەکان ئاوا وەسفی
دەکەن و بە ڕەفتارێکی
پەرلەمانتارە ڕۆژئاواییەکان
بیچوێنن، واتە ئەمین زەکی
کەسایەتییەکی سیاسی مۆدێرنە و پێشکەوتنخواز بووە بۆ ئەو کاتە، حەزی بە شۆڕشی چەکداری و خوێنڕشتن نەبووە، ڕزگارکردنی میللەت و شۆڕشی خوێندن و زانین و لەناوبردنی نەخوێندەواری و ڕاچەناندن و لەخۆڕامان و بیرکردنەوە لە پاشەڕۆژی میللەتی، بە بەهێزترین شێواز زانیوە بۆ وریاکردنەوە و ڕزگاربوونی گەلان، لەم لاشەوە بەریتانییەکان کە دیارە زۆر چاودێرییان کردووە، بەکەسێکی شارەزا و زانا و بەتوانا و زەین کراوەی ئەوروپییان چواندووە، بەریتانیا ئاوا وەسفی دەکات و، کۆشکی مەلەکی ئاوا بۆیان روانیوە، سیاسەتمەدارە بەرزەکانی عێراق و سەرەك وەزیران دەجار کردوویانەتە وەزیر و دووجار کردوویانەتە مدیر عامی وەزارەت، دوای چەند ساڵێك ئەمین زەکی بەگ نامیلکەی (دوو تەقەلای بێسوود) ی بلاوکردەوە، کە دەربارەی ئەو کۆششانەیەتی لە ئەنجومەنی نوێنەران و دەزگاکانی میریدا، بۆ چارەسەرکردنی چەند لایەنێکی کەموکورتییەکانی ناوچە کوردەوارییەکان داونی، ڕاپۆرتەکە ئەوەندە ڕاستگۆیانە و بەهێزە کە هەتا ئەوکاتە هیچ کوردێك نەیتوانیوە پرۆژەیەکی زانستی مەزنی لەو جۆرە پێشکەش بە دەوڵەت بکات، ئەمە داوایەکی دیموکراسییانە و مەدەنیانە بوو، لای خۆی دەوڵەت بە سنگ فراوانییەوە وەری بگرێت، کەچی ئەو کارە ڕقی نا پیرۆزی کاربەدەستانی دەوڵەتی بەغدای هەڵساند و کتێبەکەیان قەدەغە کرد.
جارێك ئەمین زەکی دەچێتە لای پادشای عێراق و باسی بارودۆخی ناوچە کوردییەکانی بۆ دەکات، باسی دواکەوتن و بێ خزمەتگوزاری شارە کوردییەکان دەکات، پاشا دوو سەعات گوێ بۆ ئەمین زەکی دەگرێ، کە چۆن بە ئەدەبێکی لە ڕادەبەدەر، بە دیبلوماسییەکی کەم وێنە، بە دڵسۆزییەکی پاك بۆ عێراق و کوردستان، گرفت و پێشنیارەکانی پێشکەش دەکات، کە ئەمین زەکی دەزانێ پادشای عێراق چاك گوێی بۆ گرتووە و تێکەڵی باسەکان بووە، بڕیار دەدات ئەمانە بکاتە ڕاپۆرت ـ یان پادشا خۆی داوای دەکات بە ڕاپۆرت پێشکەشی بکات ـ ئەوسا دەیداتە پاشا، وەك خۆی دەڵێ ئەم عەریزەیەم لە ساڵی ١٩٣٥دا تەقدیمی جەلالەت مەئابی مەرحوم کردبوو، صورەتێکیشم بە فەخامەتی مەندوبی سامی بەریتانی دابوو، بۆم خوێندەوە، پێی خۆش بوو، تکای لەچاپدانی لێ کردم، بەڕاستی نەمویست دڵی بشکێنم، ئەوا بە کوردی و لەگەڵ مولاحەزەم دەرهەق بە قانونی لوغاتی مەحەلیە

که لە وەختی خۆیدا لەسەر ئارەزووی فەخامەتی مەندوب تەقدیمم کردبوو لە چاپمان دا، ناومان نا "دوو تەقەلای بێ سوود"، غەرەز لە بلاوکردنەوەشی تەنیا تێگەیشتنی هاوولاتیان و خزمەتی تەئریخە، شایانی باسە ئەم عەریزەیە لە ٢٠ی کانوونی دووەمی ١٩٣٠دا پێشکەش بە جەلالەت مەئاب مەرحوم مەلیك فەیصەڵ کرا.

## نووسینەوەی مێژووی کورد
## لە نێوان شەرەفخان و ئەمین زەکی دا

شەرەفخان بە باوکی مێژووی کورد دادەنرێ، لەسەدەی شانزەهەمدا شاکارێکی بە ناوی شەرەفنامە بە فارسی نووسیوە، پێشتر کاری وا بە کوردی و بە هیچ زمانێکی تر بۆ کورد نەکراوە، بەلام ئەمین زەکی بە نوێکەرەوەی مێژووی کورد دادەنرێ، مێژووەکەی کارێکە تاکە لە جۆری خۆی، کە بە سوود وەرگرتن لە سەدان کتێب و بابەتی بیانی، زانیاری لەسەر مێژووی کورد کۆکردووەتەوە، کە پێشتر ئەو زانیارانە پەرت و بلاو بوون، ئەوە کارێکی بێوێنە و ماندووکەرە، وەك خۆی باسی دەکات، لە هەمانکاتدا هەر کوردێك بیخوێنێتەوە، هەستی بۆ خاك و گەلەکەی دەبزوێ، شەرەفخان لە پێشەکییەکەیدا باسی تایبەتمەندییەکانی پێکهاتەی دەروون و سروشت و کۆمەلایەتی کورد دەکات، هەوڵ دەدات ڕەچەڵەکی کورد بدۆزێتەوە، بەلام پێك دەگیرێ لەگەڵ زانیاری هەڵەی مێژوویی کە پێش ئەو کراوە، پەنا دەباتە بەر خورافات، بێ ئەوەی بڕوای پێی هەبێت، ئەمین زەکیش لەسەرەتاوە لە گەڵ ئەفسانەدا پێك دەگیرێ، بەلام ڕەخنەی لێ دەگرێ و گاڵتەی پێ دەکات و بڕوای پێ ناکات، شەرەفخان سنووری کوردستان دیاری دەکات، ئەو جۆرە زانیارییە بۆ ئەو کاتەی شەرەفخان دۆزینەوە و باسکردنی قورس و گران بووە، چونکە ئەو دەمە لە ئەورووپاش ئەو زانستە باو نەبووە، ئەو هەوڵیداوە هەرچەند زۆر گران بووە ئەسنۆلۆجی (ڕەچەڵەك ناسی) کورد بدۆزێتەوە، بەلام بۆ ئەمین زەکی لەگەڵ ئەوەی کە ئاسان بووە، چونکە ئەو ئەندازیاری سنووردانان بووەو چەند جار سنووری ڕووس و بولغاریا و عوسمانی دیاریکردووە و نەخشەی ئەستەمبوڵی کێشاوە، بەلام بۆ سنووری کورد لەبەرهەمەکانیدا باسی ناکات، کە لەسەردەمی ئەمدا نەخشەی ولاتان و سنوور دیاریکردن باوێکی فراوان بووە .. ئەمین زەکی باسی ١٠ هەزار ساڵ لە مێژووی کورد دەکات، بەلام شەرەفخان باسی ٧٠٠ ساڵێك لە تەمەنی تەنها میرنشینەکان لەسەردەمی ئیسلامدا دەکات، کەلای ئەمین زەکی ئەوە تەنها یەك بەشە لە مێژوویەکی دوورو درێژ،

ئەمین زەکی ویستی مێژووی کوردستان ڕوون بکاتەوە، لە کۆنترین سەردەمەکانیەوە تا سەردەمی خۆی، ئەوە کارێکی قورسە، لەوەی شەرەفخان قورسترە، واتە شەرەفخان بە پانتایی ئاسۆیی کوردا بلاوبووەتەوە، بەلام ئەمین زەکی شاقوڵی بە ناخی کوردا، بە ڕەچەڵەکی کوردا بەرەو خوار شۆڕ بووەتەوە، شەرەفخان هەموو ناوچە جوگرافییە کوردییەکان گەڕاوە، باسیان دەکات لە حەوت سەدەدا، ئەوە بۆ سەدەی شانزە قورس و گران و نوێ بووە، هیچ زانیارییەکی نووسراو نەبووە، بەلام بۆ ئەمین زەکی سەرچاوە زۆر و بەربلاو و بە هەموو زمانەکان هەبووە، شەرەفخان بیرێکی هاوچەرخی بەهێزی ئەسنۆلۆجی بووە، باسی سروشت و سیفەتە تایبەتییەکانی کورد بەگشتی لە هەموو ناوچەکان کردووە، کە ئەو کاتە هیچ زانا و میرێکی کوردی ئەو هەستە نەتەوایەتییەی بە تێگەیشتنی ئەمڕۆ بۆ نەتەوەکەی نەبووە، ئەوسا خەڵکی تەنها مەیلیان بۆ یەکیەتی گەلان لە بۆتەی یەك ئایینی جیهانگیریدا بووە، مەیلیان بۆ یەك شا و سوڵتان و خەلیفە بووە، لە غەیری ئەوانە، هەست و سۆز و مەیل بۆ خاك و نەتەوەی تایبەت نەبووە و بە گوناه زانراوە، ئەو کاتە هەتا ناوقەد و لێوان لێوی زەین و ناخ و هەستی کورد، لەناو دەرەبەگایەتی و چینایەتی و میرایەتیدا چەقیبوو، هیچ یەکیەتییەکی سیاسییان نەبووە، هەموو گەلان هەستیان لە بۆتەی یەکیەتی ئیسلامیدا تاوابووەوە، بەلام لەزەینی شەرەفخان

محەمەدئەمین زەکی، شەقلاوە

و ئەحمەدی خانێ و هەندێکی تردا شتێك هەبووە، ئەوەی شەرەفخان کردی بیرێکە تاکە، لای کەسی تر گەڵاڵە نەبووە، بەکەسی تر نەکراوە، بەڵام ئەوەی ئەمین زەکی کارێکە، سەرچاوە بە هەموو زمانەکان هەبووەو دەست کەوتووە، پێشتر بە زمانی تر کراوە و ئێستەش بەردەوامە، ئەمین زەکی خۆی زۆر سوودی لە شەرەفنامە وەرگرتووە، زۆری دوو کتێبە گەورەکەی لەسەر شەرەفنامە ڕێکخستووە، شەرەفخان نەبوایە هەوڵی ئەمین زەکی وا مەزن دەرنەدەچوو، ئەوەی شەرەفخان بێوێنەیە، بەڵام ئەوەی ئەمین زەکی بێوێنە نییە، دواتر لەوەی ئەو زۆر کراوە، دەتوانین بێ پشتبەستن بە ئەمین زەکی دەیان لێکۆڵینەوەی دەوڵەمەندتر و وردتر لەوەی ئەمین زەکی بکەین، مینۆرسکی لە ئەمین زەکی قووڵتر و پوختتر و وردتری کرد بە هەوڵی خۆی، ئەمین زەکی کۆکراوە و کورتکراوەی هەوڵی شەرەفخان و مینۆرسکی و سیدنی سمس و ئەوانی ترە، بەڵام شەرەفخان نەبوایە ئێمە حەوت سەد ساڵ لە مێژووی کوردمان لێ ون دەبوو، بەکەسی تر و بەسەدان دەزگای مێژوویی وەك ئەمڕۆ نەدەدۆزرایەوە، شەرەفخان باس لە پێنج بۆ حەوت سەدە دەکات لە مێژووی هۆز و خێڵ و میر و ئەمارەتە کوردییەکان، حەوت سەدە لەمێژووی کورد فراوان و زۆرە بۆ ئەو سەردەمە، ئەو لەوەدا تەنها سوودی لە هەوڵ و گەڕان و پرسیار و گێڕانەوەی پیران لە باوکەوە بۆ باپیرە نووسیوە، ئەو نەینووسیبایە، ئەو زانیارییانە دەبوو بەژێر تەپوتۆزی سەردەمان و ساڵان و باسانەوە، ئەمین زەکیش قووڵبووەتەوە بە مێژوودا، بەڵام نەیتوانیوە زانیاری تەواو و یەکلاکەرەوە کۆبکاتەوە، هەرچەند هەرچی هێناوە هەر ئەوەندە و ڕەنگە کەمێك زیاتر هەبووبێت، هەمان توانا و زەحمەت و هەستی کۆکردنەوەی شەرەفخانی بووە، ئەمین زەکی کەسی نەپەڕاندووە لە میر و میرنشین، بەڵام زانیارییەکانی کەمن، لەڕووی سیاسییەوە سەردەمەکانی دیاری نەکردووە، یەك لە دوای یەکی نەکردوون، تا تێبگەین پێش و پاشی ڕووداو و سەردەمەکان چییە، بۆ نموونە، سەردەم و ڕووداو و پەیوەندی گەلە کوردیەکانی ماد و مانا و کاسی و گۆتی و لۆلۆیی و سۆباری و هۆری و خالدی و ئەوانی تری نەبەستووەتەوە بە سەردەمی ئەخمینی و یۆنانی و ئیرانی و ڕۆم و مەکدۆنی و عێلامی و ئەوانی تر، بەڵکو بەگشتی هەر لەسەر گەلانی کورد وەستاوە، بە کۆ باسی وڵاتان و گەلان و پاڵەوان و ڕوداوەکان و گرفتەکان و ناخۆشییەکانی کردووە، شەرەفخانیش ئەو هەڵەی هەیە، خۆی لە چینی سەرەوە بووە، گرنگی بەگەل و چینی خوارەوە نەداوە، داواکاری و کێشە و گرفتی چینەکانی ژێرەوەی باس نەکردووە، کە ئەو لە گەورەترین میرە کوردەکان بووە، ئەو بە گەلەوە شت بووە، گەل نەبێ میر و پاشا کێیە و بۆچی باشە.؟ شاخ و داخ و چەم و دۆڵ میریان بۆ چییە.؟ دەبوو گرنگی بە باس و ژیان و گرفتەکانی ڕەعیەتەکەی، بەجوتیار و پیشەوەر و کارزان و کاروان و قەتارچی و باری ژیان و گوزەرانیان بدایە، ئەو هەر تەنها گرنگی بە ژیان و ڕابواردنی میر و هێز و شەڕ و پەنا بردنە بەر سەفەوی و عوسمانی و شەڕی کوردان داوە، هەستی میرایەتی و دەرەبەگی بووە، بەڵام بڕوای بە گۆڕانکاری لە دەسەڵات و گۆڕانی کۆمەڵایەتی نەبووە، بڕوای نەبووە ئەو بارە چەق بەستووە میرایەتییە سیاسییە کۆمەڵایەتییە چینایەتییە بگۆڕێ یان دەگۆڕێ، بڕوای وابووە دەبێ هەمیشە چینێکی بەرزی دەسەڵاتدار هەبێ و، زۆرترین خەڵکی خزمەتکار و سەرباز و سەپان و پاڵە و جوتیار، بە خوێن و ڕەنجی خۆیان بەرگری لە دەسەڵات و کورسی و ژیان و ئارەزووی ئەوان بکەن، بۆ خۆشی و شادی و ئارەزووەکانی سەرەوە بژین، دەبێ ئەمان برژێن و داوەشێن و هەڵوەرێن و ڕەنج بدەن، ئەوان بژین، ئەو و هیچ میرێکی تری کورد بڕوای بە یەکیەتی خاك و خەڵك و وڵات نەبووە، ئەوان بڕوایان وابووە بۆ پارێزگاری لە میرایەتی خۆیان، تاوێك بدەنە لای شای سەفەوی، ئەگەر نەگونجا بدەنە لای سوڵتانی عوسمانی، ئەگەر بڕێك لە هێز و دەسەڵاتی خۆیان بینی و خۆیان ناسی، تاوێك لە پایتەختەکەیاندا، خۆیان بە شت بزانن و گوێ بۆ کەس نەگرن، ئەگەر ئەوەشی بۆ نەچووە سەر، تاوێکیش خاك و خەڵك و پایتەختەکەیان جێبهێڵن و، لە هەموو شت هەڵبێن و بە دەربەدەری بژین، هێندەی ئەحمەدی خانی بیرکراوە و هەست پاك و بیر قووڵ و مەزن نەبوون، کە بۆ خاك و دۆخی خەڵکی هۆنیوەتەوە و گریاوە، لەو سەردەمە دوورەوە بۆ یەکخستنی گەلی کورد کۆشاوە، هەنسکی داوە و هەناسەی ساردی پیا هاتووە، هەوڵیداوە لە ژێر دەستی ستەمی ڕۆژگاردا دەربازیان بکات، ئەو مەلایەکی ئایینی بووە، بڕوای تەواوی بە خوا و ئیسلام بووە، بەڵام ڕازی نەبووە کەس یاری بە چارەنووسی گەلەکەیەوە بکات، بە ستەمی فارس و تورك بەرامبەر گەلەکەی ڕازی نەبووە، تەنانەت گومانی کردووە، کە بۆچی گەلەکەی هەردەبێ لە ژێر ستەمدا بێت، ئەو هەر عوسمانی و سەفەوی تاوانبار نەکردووە، بەڵکو وتویەتی تاوانباری یەکەم گەلەکەی خۆمە، کە بەو دۆخە نالەبارە خراپە چەقبەستووە ڕازییە، بیرناکاتەوە و خۆی ناگۆڕێت، ئەو بڕوای وابووە قەدەری کورد ئەوە نییە، بەڵکو بەدەستی خۆی خۆڵ دەکات بەسەری خۆیدا، تاوانباری یەکەم میر و گەلی کورد خۆیەتی، خەڵکە کە نەخۆشن، لاوازن، خۆیان یەك ناگرن، دژی یەکتر لەسەر هیچ دەجەنگن، خۆخۆرن، پشت بە دوژمن دەبەستن دژی

برای خۆیان، بۆ یەك پوازن، لە شیعرەكانیدا زۆری لەوە تیایە.

ئەمین زەكی لە مێژووەكەیدا باسی سەرەتای ئیسلام ناكات، وەك باوی مێژوونووسانی مەسیحی و سریانی و موسوڵمان، تەبەری و ئیبن كەسیر و مەسعودی و ئیبن جەوزی وایانكردووە، ئەوان كاریگەری نامە ئاسمانی و ئاینییەكانیان لەسەر بووە، سەرەتا لە دروستبوونی بونەوەر و زەوی و شاخ و ئاو و هەوا و گیاندارانەوە دەست پێ دەكەن، پاشان دابەزینی ئادەم و تۆفانی نوح و، بلاوبوونەوەی گەلەكان دوای تۆفان، پاشان باسی فارس و ئەفسانەكانیان، پاشان لە سەردەمی ئیسلامەوە چریان دەكردەوە، قورەیش و هاتنی پێغەمبەر و ڕاشدین و فتوحات و ئەمەوی و تا سەردەمی نووسەر خۆی دەچوون، بەڵام نە شەرەفخان نە ئەمین زەكی ڕێچكە كۆنەكانیان پەیڕەو نەكردووە، گوێیان بە ئەفسانەی گەلە كۆنەكان نەداوە، هەرچەند ئەفسانە و ئایینە كۆنەكان سوودیان بۆ لێكۆڵینەوەی مێژوویی زۆر و زەبەندەیە، نووسینی مێژووی كۆن مەوسوعی و فەرهەنگی بووە، باسیان لە هەمووشت كردووە كە پەیوەندی بە مرۆڤەوە بووە، باس لە مێژوو و جوگرافیا و پزیشكی و ئەستێرە ناسی و فەلسەفە و زانست و ئایین كردووە، لە سەرەتاوە لە ئەوروپاش ئەوە باوبوو، بەڵام شەرەفخان و ئەمین زەكی لەوە دوورن، مێژوونووسانی ئەوروپی و ئیسلامی لە كۆندا مێژوویان بە حەولی نووسیوە، واتە بە گوێرەی سەردەم و ساڵ و ڕۆژ دەیاننووسی، هەر لە مێژووی زایینی و كۆچییەوە، ساڵ بەساڵ و پاشا بە پاشا و خەلیفە بە خەلیفە، لە عیسا و محەمەد پێغەمبەرەوە، بۆ ڕاشدین و ئەمەوی و عەباسی و عوسمانی دەیانهێنا، هەر ساڵەی چی ڕووی بدایە كۆیان دەكردەوە، لە مردن و ڕووداو و شەڕ و ڕووداوی سروشتی و گرانی و تاعون و لافاو و بوومەلەرزە و سوتان و گرانی، بێ ئەوەی لە نێوان ئەو باسانەدا تەواوكەری و پەیوەندییەك بوونبێت، ئەوە ڕێگەیەكی سەرەتایی بوو بۆ نووسینەوەی مێژوو، كە ئەمین زەكی و شەرەفخان نەیانگرتووەتە بەر، هەرچەند ئەوانیش جیاوازن لە نەخشەی كارەكانیان، بەڵام ئەو شێوازەیان نییە، مێژوونووسانی ئیسلامیش زۆری نەبرد وازیان لەو شێوازە هێنا، مێژووەكەیان كردە بەش بەش و ئەبواب و فەصل، بە گوێرەی بابەت و بەپێی سەردەم، نەك بەپێی ساڵ، هەندێكی تریش وەك زەهەبی و ئەلئەسفەهانی و ئیبن ئەسیر و ئیبن حجر العسقلانی و ئیبن خەلەكانی بە ڕەچەڵەك كورد، بە زنجیرەی مێژوویی باسەكانیان نووسیوە، باس لە مێژووی ژیاننامەی پیاوە ناسراو و گەورەكان دەكەن، سیرە و كردەوەكانیان باسكردووە بەپێی پیتی ئەبجەدی، كە ئەمڕۆ بووە بە بەشێك لە مێژوو، بە مێژووی ڕجال یان سییەر ناسراوە، پێشتر لای مێژوونووسانی ڕۆمان و یۆنان باوبووە، مەلا عەبدولكەریمی مودەریس و مەردۆخی و مەلا تایەری بەحركە و دەستنووسەكەی مەلا محەمەدی شارەزووری بۆ ناودارانی كورد هەروەك پێشینەكانیان كردووە، ئەمڕۆ ئەو شێوازە باوی نییە، مەرج نییە هەر شتێك باوی نەمابێ سوودی نەبێت و بیدەینە بەر ڕێژنەی ڕەخنە..!

ئەمین زەكی ئەو شێوازەی بەكارهێناوە لە (كوردی بە ناوبانگ) مشاهیر الكورددا، بەڵام بەلاوازی و هەژاری و كەم تفاقی، مافی تەواوی نەداوەتێ و زانیاری زۆری لەسەر كۆنەكردووەتەوە، گلەیی نەكردووە كە بۆ ئەو زانا و كەسایەتییە كوردانە، هەموو توانایان بۆ ئایین و ئەدەب و سەقافەتی عەرەب و فارس و تورك بەختكردووە، هیچیان بۆ كورد نەكردووە، هەر ئەوە بووە وای كردووە كورد درەنگ بێپەرژێتە سەر مێژوو و ئەدەب و نووسین بە زمان و خەتی خۆی، زۆر لەو زانا و كەسایەتییانەی كورد جێی سەرسامی و داهێنان بوون، بەڵام لە تاو خزمەتی ئایین و گەلانی خاوەن دەسەڵات، نەیان پەرژاوە، یان درەنگ پەرژاوینەتە سەر گەل و خەت و نووسین بە كوردی، دەیانتوانی ئەو خزمەت و نووسین و شیعر و ئەدەبە بە خەتی كوردی بكەن، ئایین لەوەدا هیچ نكولییەكی نەبووە، ئەوان خۆیان ئیهمال بوون و خەتی كوردییان بە هیچ زانیوە، بەڵام نووسەر (ئەمین زەكی) وەك خۆی باس دەكات، زۆر بە زەحمەت ژیانی ئەو كەسایەتییانەی بۆ ساغ بووەتەوە، ئەوە جێی نرخاندن و پێزانینە.

هاندەری سەرەكی بۆ نووسینەوەی مێژوو لە سەرەتای ئیسلامەوە عەقائدی و دینداری بووە، بۆ نیشاندانی ژیان و هەوڵ و جیهادی پیاوچاكان بووە لە ڕێی خوادا، مەبەست ناساندنی بەرزی ئیسلام بووە بۆ پاداشت گەیشتن، ئەوروپاش لە كۆندا كە مێژووی مەسیحییەتیان دەنووسی هەروایان دەكرد، خۆیان و مەسیحیان بەرزو، غەیری ئەوانی بە نەفام و بەربەری و نەزان و داگیركەر دەناساند، لە ئەوروپا و ڕۆژهەڵاتیش نووسینەوەی مێژوو كاری دووەم بووە، بۆ وەرگرتنی وانە لە ئەزمونەكانی چاكەكاران و ناساندنی ڕەوشتی بەرز، یان بۆ پەروەردەكردنی منداڵی پاشایان و میران، یان بۆ ناساندنی پاشاكان و دەسەڵاتیان بووە، وەك چیرۆك و گێڕانەوە بووە، هەر بۆ تەسلیە و خۆشی و كات بەسەربردن بووە، بەڵام ئەمین زەكی وای نەكردووە، مێژووی بۆ خۆشی و كات بەسەربردن نەنووسیوە، باسی شان و باهوی پاشایانی نەكردووە، ئەو لەوكاتەوە دەستی بە نووسینەوەی مێژووی كورد كردووە، كە تورك وازی لە هەڵگرتنی ئاڵای ئیسلام هێنا و ئاڵای تورك و تورانی بەرزكردەوە، باسی ئیسلام نەما، هەركەسە كەوتە باسی گەلی خۆی، ئەمین زەكیش ویستی باسی ژیان

و گوزەران و مێژووی میللەتەکەی خۆی بکات، باسە کۆنەکانی کوردی کۆکردەوە، لەگەڵ ئەوەشدا نەکەوتە هەڵەی نەتەوە پەرستییەوە، هەوڵی نەدا لە خۆوە کورد بەرزبکاتەوە و، بەشان و شەوکەتی کوردا هەڵبدات، دژی گەلانی تر بنووسێ، ئەو مەبەستی پاکردنەوە و ڕوونکردنەوە و ڕۆشنکردنەوەی مێژووی کورد بوو، کە تاریکی و تەمومژ و تەپوتۆز قەتماغەی لەسەر بەستبوو، داپۆشیبوو، هەرچەند لەملاولاوە ناو بەناو دەیویست وانە بدات، دەرس و عیبرەت لە ڕابردوو دەربهێنێ، شتێك بە کورد بڵێ، ئامۆژگاری گەلەکەی بکات، ئەوە ئاساییە.. مێژوونووسانی ئیسلام، بە زۆری ڕووداوەکانیان بە قەزاوقەدەر دەرکردووە، تەفسیری ڕووداوەکان و لێکۆڵینەوە و شیکردنەوەیان تیا نەکردووە، بە گوناهیان زانیوە لەسەرووی ویستی خواوە قسە بکەن، بە مەرجێ یەك لەسەر سێی قورئان چیرۆك و مێژووە، کە بۆ دەرس و وانە وەرگرتن هێنراون نەك بۆ کات بەسەربردن و خۆشی، مێژوونووسانی عەرەب و ئیسلام زۆربەیان خۆیان نەیانوێراوە شیکردنەوە بۆ ڕووداوەکان بکەن و مێژوو بخوێننەوە، دەنا خوا ڕێگەی دابوون، لە مێژووی ئیسلامدا زۆر باس لە پیرۆزکردنی پێغەمبەر و پیاوچاکان و سەحابە و خەلیفەکان و زانایان و وەسف و سەناو پیاهەڵدانی لە ڕادەبەدەر هەیە، وا نازانی باسی مرۆڤ دەکەن، کە چاکە و هەڵەشیان لێ دەوەشێتەوە، وەك لە زۆر ئایەتدا هەیە، بەڵکو لە ڕیزی مرۆڤ بەرزکراونەتەوە بۆ ئاستی مەلائیکە، کە هەمیشە نور دەبەخشن و لە چاکەدان، ناڵێی لەسەر زەوین، حەشوە و زیادەی زۆری بێ پێویست و بێسوود هەیە، شیعر و پیاهەڵدان زۆرە، لە جەنگی ئوحد و زۆر جەنگی تردا موسوڵمانەکان شکاون، خوا خۆی ئەو شتانە دەباتەوە بۆ لادانی مرۆڤەکان، با سەحابەش بن و پێغەمبەریشیان لە گەڵدابێت، لە شەرەفنامەشدا ئەوە هەیە، نەیتوانیوە لە شێواز و پێڕی سەردەمی خۆی لابدات، بەڵام لەمەدا ئەمین زەکی وەك ئەوانی نەکردووە، دوورە لە زەخرەفە و ڕازاندنەوە و حەشوە و زیادە، ئەوان تەنها سوودیان لە سەرچاوەی ئیسلامی وەرگرتووە، دەرچووی مزگەوت و حوجرەن، بەڵام ئەمین زەکی هەر چەند سەرەتا دەرچووی حوجرەیە، بەڵام دواتر بەرزترین دانشگای سەربازی گەورەترین پایتەختی جیهانی ئەوکاتەی تەواوکرد، سەرچاوەی مەسیحی بەکارهێناوە، ڕۆشنبیرە و پیاوی سەردەمی خۆیەتی، زمانی ئەڵمانی و فەڕەنسی و ئینگلیزی و تورکی و فارسی و عەرەبی زانیوە، شارەزای سەقافەتی ئەو میللەتانە بووە، دەیزانی ئەوانە چۆن باسی کورد و ناوچەکە دەکەن، بەڵام ورد نەبووە لەوەی باری کۆمەڵایەتی کورد لەو سەردەمانەی باسی دەکات دیاری بکات، ئەندازیاری نەخشەسازی بووە، سنووری زۆر ولاتی بەنەخشە کێشاوە، بەڵام نەیتوانیوە یان نەیویستووە جوگرافیای کوردستان دەستنیشان بکات، ئەمین زەکی لە هەموو ئەوانەی سەردەمی خۆی شارەزاتر و بیر فراوانتر بووە، ڕەنگە یەکەم کەس بێت کە گەلە کوردەکانی پێش دەوڵەتی مادی باس کردبێت، لولویی و گوتی و عیلامی و نایری و خالدی و هۆری و سوبارتی و ئورارتۆو، بەڵام شەرەفخان تەنها سوودی لە بیستن و گێڕانەوەی پیرەکان و وردەکاری و تێبینیەکانی خۆی وەرگرتووە، بەبێ بەڵگەنامە و سەرچاوەی نووسراو و کتێب، ئەمین زەکی چوار سەد ساڵ لە شەرەفخان دوور بووە، لە مێژووەکەیدا سوودی زۆری لە شەرەفخان وەرگرتووە، بەڵام شەرەفخان یەکەم کەس بوو مێژووی کوردی نووسیوە، ئەو هەموو زانیاریانەی لەسەر خێڵ و میر و سەرکردەکان و دەسەڵاتیان کۆکردۆتەوە، هەر بۆیە بە باوکی مێژووی کورد ناسراوە، ناکرێ گلەیی لە شێوازی شەرەفخان بکرێ، ئەوە شێوازی ئەو ڕۆژەیە و ئەوسا هەروا دەنووسرا، ناکرێ گلەیی بکرێ کە بۆچی شەرەفخان بە فارسی نووسیویەتی و بە کوردی نەینووسیوە، وەك ئەمین زەکی گلەیی لێ دەکات، بەڕای من ئەوە ئینصاف نییە و بێمانایە، بەڵام دەکرێ گلەیی بکرێ کە بۆچی باسی چینی خوارەوەی ڕەعیەتەکەی، باسی باری کۆمەڵایەتی کوردی ئەو کاتەی نەنووسیوە، شەرەفخان شتێکی

نەدەنووسی هەتا لێی تەئکید و مسۆگەر نەبوایە، خۆی عەیببار نەدەکرد، سنوری زانیاری خۆی دەزانی، ئەمین زەکیش مێژوویەکی واقیعی ئیجابی نووسیوە، پشتی بەسەرچاوە و بەڵگەنامە بەستووە، دوورە لە وشکی و ساردی، وای نەکردووە کە ڕای خۆی نەڵێ و خۆی ون بکات، لە ژێر چەکوشی سەنەد و مناقەشە شکلیەکاندا بە تەنها نەماوەتەوە، بەڵام شەرەفخان ئەو شێوازەی نەزانیوە و لەو سەردەمەدا باونەبووە، ئەمین زەکی هەوڵی نەداوە هۆکاری ڕووداوەکان دەربهێنێ، گوێی بە کۆمەڵگەی کوردەواری و چینایەتی و چواردەورە سیاسیەکە نەداوە، کاریگەری کەشە جوگرافیەکەی لە سەر نەبووە، ئەمین زەکی دوورە لەوەی باسێك، ڕووداوێك بهێنێ، عاتیفە و دەرونی خوێنەر بەلایەکدا بهەژێنێ، یان ڕقی لەبەرامبەر بێتەوە و هەستی تۆڵەی لا دروست بێت یان بیترسێنێ، وەك مێژوونووسانی ئیسلامی کە دەستی خوا و مەلائیکە دەهێننە ناو ڕووداوەکان و بەشدارییان پێ دەکەن، باسەکان پڕ دەکەن لە موعجیزە و پەرجوو وا دەکەن بەرامبەر بترسێ، مێژووەکەی ئەمین زەکی ڕووتە لە شیکار و دەرهێنانی مانا و فەلسەفەی مێژوو، جگە هەندێ شوێنی سادە، مەبەستی نووسەر دەرخستنی مێژووی گەلی کورد و شانازیەکانی ڕابردوویەتی، بەڵام نەیتوانیوە شیکردنەوە بۆ کۆمەڵگەی کوردی و چینەکان و باری ئابوری بکات، باسی شار و دێ و گۆڕانکارییەکانی بەدرێژایی مێژوو نەکردووە، دەبوو بە کورتیش بووە باسی بکردایە، چونکە لەسەردەمی نووسینی ئەمدا ئەو مانایانە درابووە مێژوو، ئەو نووسەرە ئەوروپی و عەرەبی و ڕۆژهەڵاتناسانەی کە ئەم پشتی پێ بەستوون، شیکار و خوێندنەوەیان بۆ ڕووداوەکانی مێژوو کردووە، کنە و پشکنینەکان دەریان

خستووە کە لە کوردستاندا زۆر جۆر پاشماوەی هونەری بووە، باسی زۆر لە ژیان و گوزەرانی بابل و ئەکەدیان بە وردی کردووە، ئەمین زەکی نەیتوانیوە شتێك لە قەڵا و شار و ئاودێری و شارستانی گەلە کۆنەکانی کوردستان بڵێ، گەلانی زاگرۆس کە ناوی بردوون، مێژوونووسانی لە ئەمین زەکی کۆنتر لە ئەوروپی و عەرەبی باسی زمان و عادات و دابو نەریت و ڕەفتاری کۆنی کورد و سۆمەر و ئەکەد و بابلیان کردووە، شەرەفخان و ئەمین زەکی بۆ باری کۆمەڵایەتی و دەرونی و ئایینی و شارستانی کورد لە مەسعودی وردتر و شارەزاتر نەبوون، کە هەزار ساڵ لە ئەمین زەکی و پێنج سەد ساڵ لە شەرەفخان کۆنتر و دوورتر بووە، ئەم تەنها ناوی هەندێ پاشا و ناوچە و جەنگەکانیانی بردووە، نەیتوانیوە فکرەیەك لەسەر ژیان و گوزەران و شارستانی گەلانی زاگروس لە گوتی و کاسی و لولویی و خالدی بدات، کە بەمەرجێ ئەوان دەستی باڵایان بووە لە دروستکردنی شارستانی ئاسیای ڕۆژئاوادا، شەڕی زۆر لەنێوان خەڵکی دەشت و شاخدا لەسەر ژیان و باری گوزەران ڕوویداوە، بەڵام شەرەفخان و ئەمین زەکی هەر نەچوون بەلایدا، ڕابردووی هەموو گەلێك هێڵێکی بەردەوام و بەدەم یەك بەسراوە و بۆشایی تیانییە، ئەمین زەکی هەوڵیداوە مێژووی کورد بێپچڕان و بۆشایی بەوردی بهێنێ و هەموی ڕووناك بکاتەوە و تاریکی نەهێڵێ، بەڵام زۆر کەم نەبێت سەرکەوتوو نەبوو، هەتا ئێستەش زۆر پارچە کات و سەردەم و زەمەن هەیە تاریکە و ونە و ڕوننەکراوەتەوە، لە ژێر هێڵی تاریکیدا دەناڵێنێت، ئەمین زەکی توانای گەنجی خۆی لە خزمەت تورك و حکومەتی عێراقدا بەخت کرد، کاتی نەبوو بۆشاییەکانی مێژووی کورد ڕوون بکاتەوە، دەنا

دانیشتوو: ١- ماجد ٢- جاهید ٣-فاتمە ٤- محەمەدئەمین زەکی
ڕاوەستاو: ١- سانیحە ٢- بەدیع ٣- هاوسەری بەدیع

توانای هەبوو، هیچ گەلێك نییە لە دونیادا تاریکییەکانی ژیانی هێندەی کورد زۆربێت، (نیکولامار) مێژوونووسی جۆرجی دەڵێ: کورد ئەو گەلەیە کە مێژوو لەبیری کردووە، یان لە بیری چووە، واتە ژیانی نەنووسراوەتەوە خۆیشی نەیکردووە.

هێڵی زەمەن بڕینی تیا نییە، بەڵام هێڵی ژیان و مێژووی کورد بڕینی زۆرە لەبەر زۆر هۆ، چونکە کورد لەوڵاتی خۆیدا و لەسەر خاکی خۆی بە ناوی زۆرەوە هەبووە، بەم ناوەی ئەمڕۆوە کە (کورد) ە نەبووە، کە لەسەردەمی ئیسلامدا بۆی یەکلا بووەوە، پێش ئیسلام بە پێی ناوچەو خێڵ و عەشیرەت، ناوی جیاوازی بووە، هەموو ئەو ناو و ناوچانە سەرەداوی لق و پۆی ئەو بوون، گرنگی مێژوونووس ئەوەیە لق و پۆکان ببەستێتەوە بەرەگەکەیەوە، هەتا درەختی نەسەب و ڕەچەڵەك و ژیانی کورد یەك بگرێتەوە، مێژووی پارچەکان و شوێنەکانی کۆبێتەوە، هێڵی تەمەن و زەمەنی لێك پچڕاوی پێك ببەسرێتەوە، ئەوە ئەرکێکی قورسە، ئەگەر هەندێ پارچەی ون مابوو، ئەوە لە مێژووی هەمو گەلێکدا هەیە.

کە کورد و کوردستانەکەی ئەمین زەکی تەواو دەکەیت، سوودی زۆر وەردەگری، بەڵام هەست دەکەیت ڕابردووی کورد لە هەندێ جێ بە تەمومژی ماوە، سەردەمی زۆری پچڕاو و ون و تاریك و ئاڵۆز هەیە، بۆشایی تیایە، ئەمین زەکی نەیتوانیوە سەردەمەکان پڕکاتەوە و تۆکمەیەك لە مێژووی کورد وەك کڵافەیەکی تەواو بخاتە بەردەست خوێنەر، ئاڵۆزاوە، پێش و پاش و زانیاری کەم لەسەر سەردەمێکی درێژ هاتووە، ڕەنگە ئەمین زەکی خۆشی هەستی بەوە کردبێت، هەر ئەوەندە زانیاری بووە، ئەو پیر و تەنها بووە، ئەو بیرۆکەیە هەر لای ئەو بووە، سەرچاوەکان و دەستنووسەکانی بەماڵەکەیەوە لەو تەمەنە پیرەدا سووتاوە، دووبارە نووسیویەتیەوە، بەو خەفەت و مەینەتییەوە هەر ئەوەی بۆ دەرهاتووە.

ئەمین زەکی تەنها سوودی لە مێژوونووسە دوورە ئەورووپییەکان وەرگرتووە، لە ڕوانگەی ئەوانەوە نووسیویەتی، زۆر کەم سوودی لە مێژوونووسی عەرەب و فارس و ئەرمەن و سریان وەرگرتووە، کە مێژوومان لەگەڵ ئەو گەلانە پێك هەڵپێکراو و پێك ئاڵاو و تێك هەڵپسراون، دەبێ ئەوەش بڵێین کە تاسەردەمی نووسینەکانی ئەمین زەکی لەسەر کورد زۆر شت نەدۆزرابووەوە، ئاسەوارەکان نەخوێنرابوونەوە، مینۆرسکی هەڵەی کردووە، ئەمین زەکیش ئەو هەڵەیەی وەك خۆی گواستووەتەوە، ئەمین زەکی بڕوای وایە کە گەلی کورد پاشماوەی گەلە کۆنەکانی سەرخاکەکەیەتی، لە پاشماوەی ئەوان ماوەتەوە و پێکهاتووە، زمانەکەشی پاشماوەی پەهلەوییە، وردە وردە پێش کەتووە و گەشەی کردووە، ئەمین زەکی ڕەخنە لە شەرەفخان دەگرێ کە بۆچی بە فارسی مێژووەکەی نووسیوە، شەرەفخان لە پێشەکییەکەیدا دەڵێ، بۆیە بە فارسی نووسیومە چونکە زمانی ئەدەب بووە بۆ فارس و کورد و زۆر گەلی تر، لە کوردی باوتر بووە.

## سەرچاوەکان:


١ـ کورد و کوردستان ـ محەمەدئەمین زەکی ـ ئینتشارات سیدیان ـ مهابات.
٢ـ سەرجەمی بەرهەمی محەمەدئەمین زەکی ـ ئامادەکردنی سدیق ساڵح ـ بەرگی یەکەم ـ بنکەی ژین ـ سلێمانی ـ ٢٠٠٥.
٣ـ مشاهیر الکرد ـ اعداد رفیق صالح ـ بنکەی ژین ـ الجزء الثانی ـ السلیمانیە ـ ٢٠٠٥.
٤ ـ تأریخی سلیمانی و وەڵاتی ـ محەمەدئەمین زەکی ـ ئامادەکردنی ڕەفیق ساڵح ـ بنکەی ژین ـ ساڵی ٢٠٠٦.
٥ـ ژیاننامەی مێژوونووسانی کورد ـ عوسمان سەید قادر ـ بەرگی یەکەم ـ چاپخانەی شڤان ـ سلێمانی ـ ٢٠٠١.
٦ ـ ڕۆژنامەی خەبات، ژمارە (٩٢٧) وە ژمارە (١٠١٢) لە ٢٠٠١/٢/٢... ڕۆژنامەی خەبات ژمارە، (٨٧٤)|١٥|٥|١٩٩٨، خەبات ژمارە (٨٧٥)، ٢٢|٥|١٩٩٨ خەبات ژمارە (٨٧٦) |٢٩|٥|١٩٩٨ ، (د عصمت شریف وانلی).
٧ـ هەفتەنامەی (الإتحاد)، ژمارە (٣٥٨) و (٣٥٩) و (٣٦٠) و (٣٦١) مانگی ٢|٢٠٠٠ د. کەمال فوئاد.

# محەمەدئەمین زەکی و خۆلاسەیەکی تەئریخی کوردو کوردستان

**محەمەد حەمەباقی**

## (خوێندنەوەیەکی خێرا)

محەمەدئەمین زەکی(١٨٨٠ - ١٩٤٨) سەرەتای(کوردی) نووسینی، بە شیعر دەستی پێکردووە، لەم بارەیەوە(پیرەمێرد:١٨٦٧ -١٩٥٠) دەڵێ: سەرەتای جونبوشی(محەمەدئەمەین زەکی) بە شیعر بوو، ئەوەڵ مەنظوومەی کە لە ئەستەمووڵ نیشانی منی دا، لەوانە بوو بەچاوەوە ببێ، ئاتەشین و ڕەنگین.. دوای ئەوەی کە(نەژاد)ی کوڕم لە جەزیرەی(هەگبەلی) هاتە دنیا، ئەو قەصیدەیەکی نووسیبوو. خالید ضیاو ئەکرەم بەگی ڕەجائی زادە زۆریان پەسەند کرد. بەڵام من زۆری لەگەڵ خەریك بووم، کە لەگەڵ شیعر خەریك نەبێ، قووەی تەحریری هەڵئەقرچێ. چاك بوو شوکر وازی لەو پیشە درۆزنەی ئەو سەردەمە هێنا و دەستی دایە عیلم و فەن.(١)

هەڵبەت دەبێ بزانین کە محەمەدئەمین زەکی، لەبەر دڵ و لەسەر تکاو داخوازیی (پیرەمێرد)، دەستبەرداری شیعر نەبوو، چونکە وەك دواتر دەزانین، لەماوەیەکی کەمی تەمەنیدا، لە شارێکی بچووکی وەك شاری(سلێمانی) یەوە، چۆتە شاری بەغداد بۆ خوێندنی(سەربازی) و لەوێوە بۆ خوێندنی باڵاتر بۆ ئەستەمووڵی ئەو ڕۆژگارەی سالانی (١٨٩٨)ی پایتەختی هەموو وڵاتانی ئیسلام و خاوەنی مێژوویەکی نزیکەی(٤٥٠) ساڵ دەوڵەتداریی و لەوێش پلەی سەربازیی بەرز و بەرزتر دەکرێتەوە و

گەلێ فەرمان و کاری لەشکریی پێ دەسپێردرێ، کە پلە دوای پلە و کار دوای کار، چاوی بە شارانی تازە و دنیای تازە و ئەوەندە گەشەکردوودا دەکرێتەوە، تیایاندا ڕادەمێنێ و هەرگیز ناتوانێ لەگەڵ وڵاتە داگیرکراوە، دواکەوتووەکەی خۆیدا بەراوردی بکات.
هەر پێوەند لەگەڵ کاری سوپاییدا، ساڵی(١٩٠٧) لە ئەستەموولْ بۆتە ئەندامی(لیژنەی نەخشە دانان)، بۆ دانانی نەخشەی ئەستەموولْ و ساڵی(١٩٠٨) بۆتە ئەندامی(لیژنەی نەخشە و دیاریکردنی سنووری تورکی-ڕووسی)
و ساڵی(١٩١٠) بۆتە ئەندامی لیژنەی دیاریکردنی سنووری(تورکیا -بولگاریا) و دوو ساڵ لەم کارەیدا ماوەتەوە و ساڵی(١٩١٢) لەکاتی هەڵایسانی جەنگی (بالکان) دا، ڕەوانەی ئەوێ کراوە و دواتر ساڵی (١٩١٣) لەگەڵ هەندێ ئەفسەردا، بۆ کاری سەربازیی بۆ فەڕەنسا نێردراوە و ماوەی ساڵێکی تێدا ماوەتەوە..
ساڵی(١٩١٤)ش کراوەتە ئەندامی لیژنەی دیاریکردنی سنووری تورکی-ڕووسی و دوای تەواوکردنی کاری ئەم لیژنەیە، چۆتە(بایەزید)،(تفلیس)و هەر لەم سەروبەندەدا، جەنگی یەکەمی جیهانی دەست پێدەکات و لەوێوە زۆر بە دژواریی و بە ڕێگەی: باکۆ، ڕستۆف، مۆسکۆ، پیتروگراد، فنلند، سوید دا بۆ تورکیا گەڕاوەتەوە..
ساڵی (١٩١٤) وەك ئەرکانێکی جەنگیی، لەتیپی(١) دا دامەزراوە و لەسەر داوای مارشاڵ (ڤۆندر گۆڵتس) یش ماوەی (٣) مانگ لە (ئەیا ستڤانۆس)دا ماوەتەوە، تا لە خولی فڕۆکەوانیدا بەشداری بکات و لە دووەمین ساڵی جەنگی یەکەمی جیهانیدا (١٩١٥)، پلەی سەربازیی بەرزتر کراوەتەوە و ڕاستەوخۆ بەشداریی بەرەکانی جەنگی کردووە و بۆ ئەرکانی جەنگیی سوپای عێراق، بۆ (سەلمان پاك) گوێزراوەتەوە و ڕاستەوخۆ لێرەش بەشداریی بەرەکانی جەنگی کردووە و هەر هەمان ساڵ لەسەر داوای (مستەفا کەمال -ئەتاتورك) ی فەرماندەی سوپا، کراوەتە یاریدەدەری سەرۆکی ئەرکانی جەنگ و بۆ (حەڵەب) و (فەلەستین) نێردراوە و ساڵانی (١٩١٧ -١٩١٨)، تا ئەو کاتەی بۆ سوپای(٣) ی سەر سنووری قەفقاسیا گوێزراوەتەوە، لەبەرەکانی جەنگدا بووە. لە کۆتایی هەمان ساڵدا بۆ (بەشی مێژووی جەنگ) گوێزراوەتەوە. هەموو ئەم کارانەیشی بەر لەوە ئەنجامداون، کە لە(٢٤ی تەمووزی ١٩٢٤)دا، بەیەکجاریی بۆ وڵات(عێراق) گەڕاوەتەوە.
ئەم کار و ئەرکە زۆرەی لە ماوەیەکی کەمی ژیانیدا، لە شاران و وڵاتانی جیاجیا و پێشکەوتووی دنیادا دیونی و لە پلە و پایەی هەستیار و باڵادا، لە ئەستۆی گرتن و بوونە مایەی ئەوەی ناسیاوی زۆرتر لەگەڵ گەورە

پیاوانی جیهان و سیاسەتمەداران و گەورە فەرماندەی سەربازیی و دیپلۆماسی دەوڵەتانی: تورکیا، ئێران، ڕووسیا، فەڕەنسا، بولگاریا، ئەڵمانیا، سوید دا پەیدا بکات و زمانی زۆریشیان فێر ببێ.. هەموو ئەمانەش، دیدو جیهانبینی و ڕۆحی ناسك و شاعیرانەی(محەمەدئەمین زەکی)یان لە گەڕەکی (گۆیژە)ی ساکار و سادەی (سلێمانی)ی زێدەوە، بەرەو ئاسۆی فراوانتر و لێکدانەوە و بیرکردنەوەی قووڵ و کراوەتر ڕێنوێنی کردووە و ئەو چەندین بەرنامە تازە و ئەرکە هەمەجۆرە دیپلۆماسییەی لە نزیکەوە تیایاندا ژیاو ڕاستەوخۆ ئەزموون و پیادەی کردن، هەریەکەیان بەجیا، ئیستگە و ئەزمونی نوێ بوون و هەریەکەشیان هەڵوێستە ڕامانی نوێیان پێ بەخشی.. چونکە کە چەندین جار لە لیژنەکانی دیاریکردنی سنووری نێوان دەوڵەتانی: تورکیا– ڕووسیا، تورکیا– بولگاریادا بووە ئەندام، نەخشەی وڵاتانی زۆری دیتن، کە سنووری جیاکراوە و قەوارەی سیاسیی ددان پێدانراویان لەلایەن دەوڵەتانەوە هەیە، بەڵام نەخشەی(کوردستان) ی وڵاتەکەی ئەمیان تێدا نەبوو!.. کە خۆی وەك فەرماندەیەکی باڵای سوپای عوسمانی، لە نزیکەوە —لە جەنگی یەکەمدا -بەرنامەی فراوانخوازیی دەوڵەتانی: عوسمانی، ڕووسیا، ئەڵمانیا، فەڕەنسا و.. پەیماننامەی پشت پەردەو ژێر بەژێر نێوان ئەم وڵاتانەی بۆ داگیرکردن و دابەشکردنی وڵاتان و گەلانی ناوچەکە بینی، چاکتر شارەزا و ئاگاداری دیوی ناوەوەی دەوڵەت بوو.. کە ڕەشەکوژیی دەیان و سەدان هەزار (ئەرمەن)ی لەلایەن سوپای عوسمانی و بە فەرمانی دەرباری عوسمانیی و بە بەرچاوی وڵاتانی: ڕووسیا، ئەڵمانیا، بەریتانیا، فەڕەنساوە بینی، لەوە گەیشت، کە داکۆکیکردن لە مافی گەلان، پرۆپاگندەی دەوڵەتانی زلهێزە، بۆ بەرژەوەندی خۆیان.. کە بانگەوازی (جیهاد) و (غەزای موقەددەس) دەوڵەتی عوسمانی -بەناو ئیسلامەوە -بینی، لە فرۆفێڵی درۆزنانەی دەرباری عوسمانی و هەڵخەڵەتاندنی گەلانی ژێر دەستەی ناو قەڵەمڕەوی عوسمانی گەیشت.. ئەو جیهاد و غەزا (نا مووقەدەس)ەی، بەناوی ئیسلامەوە، بە ئاگاداری و بە بەرچاوی محەمەدئەمین زەکی– یەوە، بە خەڵکی سادە دەگەیەندران و ئەوانیش پەرۆشتر لە سوپای عوسمانی، بەپیر جەنگەکەوە دەچوون، بەگوێرەی زانیاریی محەمەدئەمین زەکی، جگە لە کاولکردنی وڵاتەکەی و هەڵتەکاندنی ژێرخانی ئابووری، زیانی کوژرانی (نیو ملیۆن) کوردی ژێر دەستەی لێکەوتەوە.. (٢) لەکاتێکدا کە کورد لەم جەنگەدا، نەدەسەڵاتی لە بڕیاری هەڵگیرسان و نە لەکوژاندنەوە و نە قازانجی لە دەستکەوتەکانی جەنگەکەدا هەبوو.. لەوە زیاتر کە ئەگەر وڵاتەکەی (ئەم)، لەپێش هەڵگیرسانی جەنگەکەدا، بریتی بووبێ لە دوو بەشی داگیرکراو، ئەوا لەدوای جەنگەکە کرایە چوار بەشی داگیرکراو و بەرەو ڕووی چوار سیستەمی ناو چوار دەوڵەتی جیاواز کرایەوە و ئەو بانگەواز و ڕاگەیاندنانەی لەکات و لەدوای

**سێیەم کابینەی جەمیل مەدفەعی**
**١- عەبدولحسێن چەلەبی ٢- محەمەدئەمین زەکی ٣- تۆفیق سویدی ٤- ڕەشید خۆجە ٥- جەمیل مەدفەعی ٦- یوسف غونەیمە**
**٧- عەبدولعەزیز قەساب ٨- نووری سەعید**

جەنگەکەش، بۆ دیاریکردنی چارەنووس و مافی گەلانی ژێر دەستە بڵاو دەکرانەوە، کەچی کورد لەبەروبوومی کۆنگرەی (ئاشتی پاریس: ١٩١٩/١/١٨)و پەیمانی (سیڤەر: ١٩٢٠/٨/١٠)و کۆنگرەی (لۆزان: ١٩٢٣/٧/٢٤)، لەژێر دەستەیی و داگیرکردن زیاتر، هیچی بۆ نەمایەوە.. لە حاڵێکدا هەر دوای بڕانەوەی جەنگەکە و بە بەرچاوی کوردەوە، گەلانی نزیك و دراوسێی کورد، چەندان دەوڵەتی سەربەخۆیان بۆ دروست کرا.. هەموو ئەم ڕووداوانەوەش، بە هەموویان،(محەمەدئەمین زەکی) یان کردەوە بە هەویر و سەرلەنوێ و بەجۆرێکی دیکە هەڵیان شێلایەوە و وایان لێکرد هوشیاریی سیاسی زیاتر و قووڵتر بێ.. نفووزی کاریگەری بیانی و پێوەندییەکانی نێوان دەوڵەتان باشتر تێبگات.. لەسەروو هەموو ئەمانەشەوە زیاتر ئاشنای هەلومەرجی نالەباری ژیانی خەڵکی کوردستان بوو.

ئەم داروبارەی ژیانی (محەمەدئەمین زەکی لە تورکیا: ١٨٩٨ -١٩٢٤)و ڕووداوەکانی ئەو قۆناغە جەنجاڵ و مێژووییەی تیایدا ژیاوە، ئەگەر وەك دەڵێن: مێژوو زۆرجار خۆی دووبارە دەکاتەوە، تاڕادەیەك و بەهەندێ جیاوازییەوە، داروباری سەرەتای ژیانی میر شەرەفخانی بدلیسی(١٥٤٣-١٦٠٤)مان بیر دەخاتەوە، کە هەردووکیان دوای چوونە دەرەوەیان لە کوردستان و تێکەڵبوونیان بە دەربار و دامودەسگای هەردوو دەوڵەتی سەفەویی و عوسمانی و چاوکرانەوە و تێکەڵبوون و تێکچڕژانیان بە ڕووداوگەلێکی سیاسی و سەربازیی و نێودەوڵەتیدا، سەرومڕ بیروبۆچوونیان ئاڵوگۆڕی خێرای بەسەردا دێت و لە چارەنووسی گەلەکەیان دەکەنەوە.

زیارەتێکی ماڵباتی شەرەفغانی بدلیسی و شەرەفنامە:

لەسەروبەندی خۆئامادەکردنی دەوڵەتی عوسمانی دا، بۆ جەنگی چالدێران (١٥١٤)، زانای گەورە: حەکیم ئیدریس بدلیسی(؟ - ١٥٢٠)، پێشنیازی بۆ سوڵتان سەلیم (١٥١٢ — ١٥٢٠)کرد، دڵنەوایی میر و مەزنانی کورد بکات، بۆ ئەوەی لە شەڕی دژی سەفەویی، پشتیوانی دەوڵەتی عوسمانی بکەن و لەبەرامبەردا بەڵێنیان بداتێ، هەریەکەیان لە دەڤەری خۆیدا میرنیشین پێك بهێنن و سەر بەدەوڵەتی ناوەندی عوسمانی بن.. سوڵتان سەلیم پێشنیازەکەی پەسەند کرد و کوردان هاوکارییەکی زۆری لەشکری عوسمانییان کرد و ئاکامیش لەشکری سەفەوی تێکشکاو دامودەزگا و دەسەلاتی سەفەوییان، تا ناو قووڵایی ئێران ڕاونا، لەم هێرشەی سوپای عوسمانی دا، خودی حەکیم ئیدریس بدلیسی و (٤٦) میری کورد، تا گرتنی (تەورێز)ی پایتەختی سەفەویی لەگەڵ سوڵتان سەلیم دا بوون.(٣)

بەڵام دوای ماوەیەك، دەوڵەتی عوسمانی هەر ئەوەندەی کاری بە کورد نەما، وردە وردە لە بەڵێنی خۆی پاشگەز بۆوە، بەتایبەتیش لە سەردەمی سوڵتان سلێمانی قانوونی(١٥٢٠ — ١٥٦٦) کوڕی سوڵتان سەلیم دا، کە دەستی کرد بە داگیر کردن و تەنگ پێهەڵچنینی بەرو دوای میرنشینەکانی کورد و ساڵی ١٥٣٥،(وەك نموونە) میرنشینی بدلیسی داگیر کرد، کە میر شەمسەددین— باوکی(شەرەفخان) فەرمانڕەوای بوو.. میر شەمسەددین —یش هەر هەمان ساڵ بەناچاری پەنای بۆ شا تەهماسب (١٥٢٤_ ١٥٧٦)ی یەکەم برد لە تەورێز و لەو مێژووە بەدواوە، میر شەمسەددین، زۆر بە ڕێزەوە دەکرێتە فەرمانڕەوای(ساراب) و (مەراغە)و دوازدە ساڵ دوای ئەم پەنابردنە،(شەرەفخان) ساڵی (١٥٤٣)، لە گوندی(کەرەهڕوود)ی نزیك شاری(قوم) بەدنیا هاتووە و ئەگەرچی لەگەڵ بنەماڵەکەیاندا ئاوارە بووە، بەڵام وەك منداڵانی(شا)و شازادە و میر و میرزادەکانی سەفەویی، لە دەرباری (شا تەهماسب) دا پەروەردە دەکرێ و هێشتا مێردمنداڵ (١١ ساڵ) دەبێ، کە ساڵی(١٥٥٤) لەجێی باوکی دەکرێتە میری(سالیان و مەحموود ئاباد و موغان و شیروان). بەمجۆرە تا ساڵی(١٥٧٨)، واتە: تا تەمەنی دەگاتە(٣٦) ساڵیی، وەك میر و فەرمانڕەوایەکی کاراو لێهاتوو، لەچەند هەرێمێکی ئێراندا، بەرودوا فەرمانڕەوایەتی کردووە و لە تەمەنی(٣٧) ساڵیدا دووبارە بەناچاری لەگەڵ ماڵباتی خۆیان و هۆزەکەیاندا، بۆ کوردستانی ناو قەڵەمڕەوی عوسمانی گەڕاوەتەوە و دەرباری(عوسمانی)یش پێشوازی و ڕێزی زۆری لێناوە و بۆتەوە بە (میر)ی پاشالیکی (بدلیس)ی پشتاو پشت بۆ بەجێماوی.. بەڵام ساڵی(١٥٩٤) دەستبەرداری میرایەتی بۆ(شەمسەددین بەگ)ی کوڕە گەورەی دەبێ، کە وەك دیارە سەرقاڵبوونی زۆری بە نووسینەوەی(شەرەفنامە) ەوە، ناچاری کردووە هەموو کاتی خۆی بۆ ئەو پرۆژە گەورەیە تەرخان بکات(کە پرۆژەی عومری بووە)، چونکە هەر دوای گەڕانەوەی لە ئێرانەوە بۆ بدلیس (١٥٧٨)، یەکسەر دەستی بە نووسینی (شەرەفنامە) کردووە،(٤) کە نووسینی هەردوو بەرگەکەی، نزیکەی(٢٠) ساڵێکی خایاندووە.(٥) هەرچەندە من پێم وایە زۆر زووتریش و پێش گەڕانەوەیشی، کەڵکەڵە و گەرای نووسینی ئەم پرۆژەیەی لە مێشکدا هەبووبێ.

چونکە لەلایەکەوە زۆربەی هەرە زۆری ئەو سەرچاوانەی بۆ نووسینی ئەم کارەی پشتی پێبەستوون، بە زمانی فارسی بوون و دەگونجێ هەر ئەو ساڵانەی ژیانی لە ئێران، ئەو سەرچاوانەی لە کتێبخانە دەوڵەمەندەکانی

سەفەوی و ئەو چەندین شارەی ئێراندا چنگ خستبن، کەتیایاندا فەرمانڕەوا بووە. لەلایەکی تریشەوە و لەو زانیارییەوە، کە هەر دوای گەڕانەوەی بۆ (بدلیس)و دەست بەکاربوونەوەی میرایەتی، ناگونجێ پڕۆژەیەکی وا پڕ لە زانیاریی و پشت بەستوو بەو سەرچاوە زۆرە، بەدەم کاری زۆری ڕۆژانەی میرایەتییەوە بنووسرێ. (٦) چونکە(شەرەفنامە)، کە یەکەمین و تاقانە کتێبێکی مێژووییە، لە سەدەی شازدەدا، لەلایەن کوردێکەوە بەتایبەتی لەسەر مێژووی کورد نووسرابێ، هاوتەریب لەگەڵ ئەوەدا کە کتێبێکی مێژووییە، هاوکات لەکرۆکدا مانای هەست بە:(کورد بوون)ی ڕووناکبیرێکی هوشیارە، کە بەخەمی مێژووی نەتەوەکەیەوە بووە. ئەو هەست و خەمەی، کە نەتەوەی سەردەست، بەدرێژایی مێژوو، ئەوەندە جیاوازی لەنێوان خۆی و گەلانی ژێر دەستدا دروست دەکات، تا گەلە ژێردەستەکەش جیاوازییەکانی زمان و کولتوور و جوگرافیا و مێژووی بیردەکەوێتەوە و لەگەڵ جیاوازییەکانی داگیرکارەکەدا بەراورد دەکات. ئەوسا ئەو خەمە بەدوای ڕێگە چارە و دەرەتاندا دەگەڕێ بۆ ئەوەی بۆ بەرامبەرەکەی بسەلمێنێت، کە ئەمیش مرۆڤە و زمان و کولتوور و جوگرافیا و مێژووی تایبەت بەخۆی هەیە.. ئەو خەمەش لای (شەرەفخان) لە ئاکامی ئەو زنجیرە کارەسات و ڕووداوانەدا، دوای ژان و برک و خۆخواردنەوە و پەژارەیەکی بێبڕانەوە دێتە کوڵ، کە گەلی کورد – بنەماڵەی شەرەفخان وەك نموونەیەك – بەهیوای گەیشتن بە ئازادیی، لە قۆناغێکدا هاوکاریی و پشتیوانی دەوڵەتی (عوسمانی)یان کردووە و بەدڵ و بە گیان و پێ بەپێی لەشکری عوسمانی، لە دژی دەوڵەتی شیعە مەزهەبی سەفەویی جەنگاون. بەڵام سەرئەنجام لە ماڵوێرانی و بێ هیوایی زیاتر، هیچی تریان بۆ نەماوەتەوە. ناچار ڕوویان لە دەوڵەتی سەفەویی کردووە و لەوێش بەهەمان ئاکام گەیشتوون.. ئەوسا تەمی نائومێدی بەری چاوی تاریك کردوون و لای هەردوو دەوڵەتیش(عوسمانی و سەفەوی)، ئێسك گران و گومانبار هەژمار کراون و پەراوێزخراون و ناوبەناویش بەبیانووی جۆر بەجۆرەوە، تۆڵەیان لێکراوەتەوە.
شەرەفخان ئەگەرچی (٢٩)ساڵ دوای جەنگی (چاڵدێران) بەدنیا هاتووە، بەڵام ڕووداوەکانی جەنگەکە، لای بنەماڵەکەی خۆیان و لای جەماوەری دەوروبەری شەرەفخان و دواتریش لە پەنا بردنی شەرەفخان دا بۆ دەرباری سەفەویی، بە بەردەوامیی بەیادی شەرەفخان هێنراوەتەوە(ئەگەر نەڵێم بەچاویاندا دراوەتەوە). شەرەفخان –یش وەك ڕووناکبیرێکی هەڵقوڵاو و بەشداربووی ڕاستەوخۆی کۆمەڵێك ڕووداوی خێرای ژیانی خۆی

و پشتاوپشتی بنەماڵەکەی، کە لە ساڵی (١٣٨٤)ەوە تا ڕۆژگاری (شەرەفخان) فەرمانڕەوای پاشالیکی (بدلیس) بوو،(٧) لەدیوی ناوەوەی ئەو ڕووداوانە ورد بۆتەوە و بۆی دەرکەوتووە، ئەو ململانێ و جەنگانەی نێوان سەفەویی و عوسمانی و دەوڵەتانی پێش ئەوانیش، لە گەلانی ژێر دەستەیان بەناوی پاراستنی ئیسلام و مەزهەب و شتی ترەوە خەڵەتاندووە و کردوویانن بە سووتەمەنی ململانێ و جەنگەکانیان، بەڵام لەپشت پەردەوە و لەبناواندا، داکۆکی و پاراستنی قەوارەی سیاسی و نەتەوایەتی و زمان و کولتوور و جوگرافیا و مێژووی وڵاتەکانی خۆیان مەبەست بووە.. لێرەوە شەرەفخان، بەگیانی هوشیار و ئاگادارکردنەوەی نەتەوەکەی، کە نەتەوەیەکی جیاوازە و خاوەنی زمان و کولتوور و جوگرافیا و مێژووی خۆیەتی و دەبێ بیپارێزرێ. بە پێویستی زانیوە ئەم پەیامەی، بە نووسین و لە شێوەی مێژوودا بۆ گەلەکەی و بۆ دراوسێکانی گەلەکەی بگێڕێتەوە، کە وەك دیارە ئەم پەیامەی شەرەفخان(شەرەفنامە)، لە ڕۆژگار و داروبارێکی ئەوپەڕی بێ هیوایی کورد دا نووسراوە. بۆیە هەر ئەو سەردەمە، کە هێشتا چاپ و چاپخانە دانەکەوتووە، وەك دەرەتان و هیوا بەخشین، پێشوازییەکی خێرا و گەرمی لە لایەن خوێنەران و ڕووناکبیرانەوە لێکراوە و هەر ئەو ڕۆژگارەش، نووسخەی زۆری لە لایەن خۆشنووسانەوە لەبەر نووسراوەتەوە و لە دوای نووسینەوەیشی، دەیان و سەدان ساڵ، دەستاودەست و ماڵوماڵ و شاران و وڵاتان گێڕدراوە و گەڕیدەکانی ئەوروپا و کورد ناسانیش بەپەرۆش و تاسەوە عەودالی پەیداکردنی بوون، لەوانە: ژان باتیست تاڤێرنی، کە لە ساڵەکانی (١٦٢٣ – ١٦٦٨)دا، لە یەکێك لەو شەش سەردانەی بۆ کوردستانی کردووە، سەردانی میرنشینی (بدلیس) و دیدەنی(ئەبداڵ خان)ی میری بدلیس و نەوەی شەرەفخانی کردووە، دەستنووسی (شەرەفنامە)ی لە کتێبخانە دەوڵەمەندەکەی(ئەبداڵ خان) دا دیتووە.(٨) ئەولیا چەلەبی-ش کە دیداری هەمان میر و هەمان کتێبخانەی کردووە، چاوی بە چەندان نوسخەی دەستنووسی (شەرەفنامە) کەوتووە. مالکۆڵم(١٧٦٩– ١٨٣٣)و کلودیوس جەیمس ڕیچ(١٧٨٧ – ١٨٢١)یش، کە سەردانی ئەمانوڵلاخانی گەورە(١٧٧٥ -١٨٢٤)ی میری ئەردەڵانیان کردووە (١٨٠٩، ١٨٢٠)، دەستنووسی (شەرەفنامە)یان لێ وەرگرتووە.(٩)
*****

محەمەدئەمین زەکی بەرلەوەش بۆ وڵات بگەڕێتەوە(١٩٢٤)، دەیزانی (شیعر) دەرەقەتی خەم و خەونەکانی نایەت، بۆیە(وەك پێشتر وتمان) هەر لە

ساڵی(١٩٠٩)ەوە، سەرچاوە و زانیاریی بۆ نووسینی مێژووی کوردستان کۆکردەوە. بەڵام ساڵی (١٩١٩) ماڵەکەی و کتێبخانەکەی(لە ئەستەموول) دەسووتێن و دووبارە دەست بەکۆکردنەوەی سەرچاوە و زانیاریی دەکاتەوە. هەرچەندە لەهەمان ئەو ماوەیەدا، کە خۆی بۆ ئەم پرۆژەیە ئامادە کردووە(١٩٠٦– ١٩٢٢)، هەشت – نۆ کتێبی نووسیون و بەچاپی گەیاندوون، بەڵام هەموویان بریتی بوون لە کاروباری سەربازیی و جەنگ و بیرەوەری خۆی، وەك فەرماندەیەکی سوپای عوسمانی لە جەنگی یەکەمی جیهانیدا(١٩١٤-١٩١٨)و هەمووشیان بە زمانی(تورکی) بوون، کە ئەمانەش نیشانەی تری دوورکەوتنەوەی(محەمەدئەمین زەکی) بوون لە شیعر.

محەمەدئەمین زەکی درەنگتر لەو هاوڕێیانەی بۆ وڵات گەڕایەوە، کە لە ئەستەموول پێکەوە بوون و لەگەڵ هاتنەوەیاندا بۆ وڵات، لە پێکەوەنانی دەوڵەتی عێراق(١٩٢١)دا بەشدار بوون و پلە و پۆستی باڵایان وەرگرت. محەمەدئەمین زەکی-یش هەر زوو پلەی باڵای لە دەوڵەتی عێراقدا وەرگرت. بەڵام ئەو کارو پلە باڵایانەی بۆ ئەوە بوون، تا لە ژیانی جەنجاڵی ئەستەموول دووربکەوێتەوە و کەشوهەوایەکی ئارام و سەقامگرتووی بۆ بڕەخسێ و دەست بە پرۆژەی نووسینەوەی مێژووی کورد و کوردستان بکات، کە پرۆژەی هەموو ژیان و هەموو خەونەکانی بوو. بۆیە هەروای کرد و یەکەمین ساڵی دوای گەڕانەوەی بۆ وڵات(١٩٢٥)و بە پشتیوانی ئەو زانیاریی و سەرچاوانەی لە وڵاتانی ئەوروپا لە ئەرشیفی وڵاتانی دراوسێدا، دەستی خستبوون، دەست بە نووسینەوەی پرۆژەکەی دەکات و دوای(٦) ساڵ، بەرگی یەکەمی(خوڵاسەیەکی تەئریخی کورد و کوردستان:١٩٣١) و ساڵی(١٩٣٧)یش بەرگی دووەم تەواو دەکات. هەردوو بەرگەکەش لە لایەن ڕووناکبیرانی کوردەوە، بەتاسە و ڕێزێکی زۆرەوە، پێشوازی و دەستخۆشی لێدەکرێت و لەپێشیانەوە، شاعیر و ڕووناکبیری مەزن: پیرەمێرد(١٨٦٧- ١٩٥٠)، لەزنجیرەیەك وتاری ڕۆژنامەی(ژیان) و(ژین) و گۆڤاری (گەلاوێژ)دا، دەستخۆشی و مشتومڕی مێژوویی لەگەڵ محەمەدئەمین زەکی دا دادەمەزرێنێ.(١٠) بەدوایدا: شێخ محەمەدی خاڵ و ئوسمان سەبری، هەریەکەیان بەجۆرێك لێی دەدوێت، کە یەکەمیان لە نامەیەکی سوپاس و پێزانیندا:(ئەوەڵەن بەناوی هەموو قەومی نەجیبی کوردەوە، ثانیەن بەناوی هەموو عولەما و ئودەبا و شوعەرا و مەشایخەوە، تەشەکوری مەعالی محەمەدئەمین زەکی) دەکات(١١) و لە دواییدا زەبر و ڕەنگدانەوەی (خوڵاسەیەکی تەئریخی کورد و کوردستان) لای لاوان و خوێندەوارانی کورد، بۆ محەمەدئەمین زەکی باس دەکات و دەڵێ: ئەمڕۆ هەموو لاوان و خوێنەران و تێگەیشتووانی قەومەکەیشی، ئەو ئەپەرستێ و هەر یەکێك لەوان، هەیکەلێکی مەعالی ئەمین زەکی لە دڵ و دەروونی خۆیا داناوە و..(١٢) دووەمیشیان: یەکەمین کوردێکە، کە نرخاندنێکی شیاوی لەبارەی هەردوو بەرگی(خوڵاسەیەکی..) بڵاوکردەوە..(١٣) پێبەپێی ئەمانیش محەمەد عەلی عەونی، هەردوو بەرگەکەی(خوڵاسەیەکی..) بەرودوا:(١٩٣٧، ١٩٤٥) بۆ عەرەبی تەرجەمە کردن.. کە ئەگەر هۆی ئەم پێشوازییە گەرم و خێرایەی ڕووناکبیرانی کورد بپرسن، دەستبەجێ لە چەند خاڵێکدا دەڵێین:

١- محەمەدئەمین زەکی لە داروبارێکدا ئەم دوو بەرگەی مێژووی کورد و کوردستانی بەخوێنەران گەیاند، کە گەلی کورد، دوای بڕانەوەی جەنگی یەکەمی جیهانی، بەسۆنگەی ئەوەی لە هەموو ئەو ئاواتانەی بێبەش بوو، کە چاوەڕێی دەکردن لەڕێگەی(کۆمەڵی نەتەوەکان)ەوە پێی بگات، تووشی بێ هیواییەکی یەکجار تاریك بووبوو. تەقەللاکانی کوردیش خۆی، لە بزووتنەوەی شێخ مەحموودی حەفید(١٨٨١ – ١٩٥٦)، لە ساڵانی(١٩١٩-١٩٢٥)و شۆڕشی شێخ سەعید(١٩٢٥)و جووڵانەوەی سمکۆی شکاك(١٩١٤ -١٩٣٠)، کە تێشکانی هەموویان، تێشکانی ڕۆحی نەتەوەی کوردیان بەدوای خۆیاندا هێنا و ئەوەندەی تر، کورد خۆی بە تێشکاو و دەرکراوی مێژووی خۆی دەزانی و وای هەستدەکرد ئەو خەباتەی بۆ پاراستنی زمان و جوگرافیا و مێژووی خۆی کردووە، بە ئەنجام نەگەیشتوون، ئیتر هەموو لەمەودوا هەموو ئەو شتانەی لەبەر مەترسیدان، بەتایبەتیش کە لەم قۆناغە تاریکەدا، هیچ پشتیوان و کۆمەڵە و حیزب و ڕێکخراوێکی کوردی نەبوو، تا بەرگریی لە پاراستن و بووژاندنەوەی ئەو بنەما سەرەکییانەی گەلی کورد بکات.

٢- ئەو سەرچاوانەی محەمەدئەمین زەکی، لە نووسینی مێژووەکەیدا، بۆ پشکنین و دۆزینەوە و ساغکردنەوە و سەلماندنی سەربەخۆیی زمان و جوگرافیا و مێژووی ڕەگەزی کورد، پشتی پێ بەستبوون، بەتایبەتیش ئەوانەی کوردستان و وڵاتانی ئەوروپا، وەك: مینورسکی، مارك سایکس، سپایزەر، لۆنگریك، درایڤەر، نورمان، لسترنج، هۆل، نۆلدگە و... هتد. سەرچاوە گەلێکی پڕ لە زانستی دەوڵەمەند و تازە و جێی متمانە بوون، کە زۆربەیان(لەو سەردەمەدا) نەك هەر بۆ سەر زمانی کوردی، بەڵکو بۆ زمانەکانی: عەرەبی، فارسی، تورکی –یش تەرجەمە نەکرابوون. بۆیە ئەم زانیارییە تازانەی مێژووی(کورد و کوردستان) ڕاستییەکی سەلمێنراوی بۆ ڕووناکبیران

و خوێنەرانی کورد، لەسەر مێژووی نەتەوەکەیان پشت ڕاست کردەوە، تا بەشانازییەوە پشت بەو مێژووی زانستەیان ببەستن، کە تا ئەو کاتە(مخابن بە - شەرەفنامە - شەوە)، لە ڕوانگە و بۆچوونی(شانامە - ی فیردەوسی: ٩٤٠ — ١٠٢٠) بە ئەفسانە هەڵچنراو و بێ بنەمای زانستی و هەندێ مێژوونووسانی عەرەبی وەك: مەسعوودی، ئیبن قوتەیبە، دینەوەری و مێژوونووسانی سەرەتای ئیسلام، بنەچە و دێرینەی کوردیان بۆ سەر دێو و درنج و جنۆکە دەگێڕایەوە.(١٤) بەڵام محەمەدئەمین زەکی، بە بڕوایەکی نەگۆڕ و پتەوەوە، ئەو بۆچوونە پووچانەی ڕەتکردنەوە و نەتەوەی کوردی، وەك مرۆڤێکی شکۆمەند و هاوتای هەموو مرۆڤی ئەم سەر زەمینە پێناسە کرد.

لەدوای مێژوونووسینی(شەرەفنامە: ١٥٩٧)ەوە، تا مێژووی نووسینی هەردوو بەرگی(خۆلاسەیەکی تەئریخی کورد و کوردستان: ١٩٣١، ١٩٣٧)، کە دەکاتە (٣٤١) ساڵ، واتە: نزیکەی سێ سەدە و نیو، جگە لەچەند مێژوونووسێکی سەر بە میرنشینی ئەردەڵان، کە هەموویان هەر مێژووی میرانی ئەردەڵانیان نووسیوە،(١٥) ئیتر مەلا مەحموودی بایەزیدی(١٧٩٩— ١٨٦٩): اداب و رسومات اکرادیە و حسێن حوزنی موکریانی (١٨٩٠ -١٩٤٧)یش مێژووەکانیان، مێژوویەکی گشتگیر و سەروەری دێرینە و بنەچەی کورد و کوردستان نین. بۆیە(خۆلاسەیەکی تەئریخی کورد و کوردستان)ی محەمەدئەمین زەکی، مێژوویەکە، نەك هەر مەودایەکی مێژوویی سێ سەدە و نیوی دوای(شەرەفنامە) پڕ دەکاتەوە: بەڵکو مەودایەکی سەدان و هەزاران ساڵی نە نووسراوی کورد و کوردستان پڕ دەکاتەوە، بەتایبەتیش کە بە دیالێکت و لە ناوچەیەکدا نووسراوە، کە(١٠٠)سەد ساڵ، بەر لە محەمەدئەمین زەکی، شاعیرانی ناودار: نالی، سالم و کوردی و هاوڕێکانیان، بناغەی هەمان ئەو دیالێکتە نوێیەیان دامەزراند و شیعری نیشتمانپەروەرانەیان پێ نووسی، بەڵام ئەوانیش مەیدانی (مێژوو) یان بە چۆڵی بەجێ هیشتبوو، کە محەمەدئەمین زەکی ئەم کەلێنەشی پڕکردەوە.

لەبەر ئەم هۆیانە، خۆلاسەیەکی تەئریخی کورد و کوردستان، ڕووداوێکی مەزنی مێژووییە، کە لەدوای (شەرەفنامە)ەوە، ڕووداوی وا پڕ ئاوازە و کاریگەر لە مێژووی ڕووناکبیری کوردیدا ڕووی نەداوە، چونکە (وەك وتمان) لەسەردەم و قۆناغێکدا نووسرا، کە ڕۆحی نەتەوەیی کورد، لە بارێکی داهێزران و بێ هیوابیەکی نادیاردا دەژیا و ئەم مێژووە، وزە و وره و خوێنێکی تازەی پێبەخشی، تا لەبەردەم دابەشکردن و داگیرکاریی و بێبەشکردنی لە ژیان و ئازادی و سەربەخۆییدا، متمانە بەخۆی پەیدا بکاتەوە و دڵنیای بکات، کە ئەویش وەك مرۆڤ، هەموو مەرجەکانی ئەوەی تێدایە، مافی ژیانی ئازاد و سەربەخۆیی و پێکەوەنانی قەوارەی سیاسی و نیشتمانی خۆی هەبێ، ئەم متمانە پێبەخشینەوەیەش دەبێتە هەوێنی وەرسووڕانێکی نوێ لە مێژووی هەستی نەتەوەیی کورداو ڕووداوێکی ڕووناکبیریی و مێژوویی ئەوەندە ناوازەیە، وەك چۆن لە مەیدانی جوگرافیاییدا پرۆژەی دروستکردنی شارێکی تازەی وەك نموونەی شاری بەغداد(٧٦٢ز)، یان: شاری(سلێمانی: ١٧٨٤)، وەك دوو پێویستی جوگرافیایی، بڕیاری دروستکردنیان دەدرێ و دەبنە دوو ڕووداوی تازەی جوگرافیایی دوو شاری تازە لەسەر نەخشەی جیهان زیاد دەکەن و بۆ هەتا هەتا و هەمیشە ناویان لەسەر نەخشەی جیهان دەمێنێتەوە. هەر بەو جۆرە(خۆلاسەیەکی تەئریخی کورد و کوردستان)یش، ڕووداوێکی گەورەی مێژووییە.

لەجیی خۆیدایەتی لەبۆنەی ناوهێنانی ئەو(دیالێکت)ەی (خۆلاسەیەکی تەئریخی کورد و کوردستان)ی پێ نووسراوە، بڵێم: ئەوە ئاشکرا و زانراوە، کە ئێستا بەو دیالێکتە دەڵێن: دیالێکتی کرمانجی ناوەڕاست، یان وەك لە دەمێکە(ئارخۆ. دزکۆ: ١٨٥٣) ناوی ناوە: دیالێکتی سلێمانی(١٦)، کە دیارە مەبەست لە دیالێکتی سلێمانی، بەمانای ئەوەی ئەم دیالێکتە، لەدوای دروستبوونی شاری سلێمانی (١٧٨٤)ەوە، گەڵاڵە بووە و داکەوتووە و بەم پێیە ئەم پرسیارە دێتە گۆڕێ: ئەی پێش دروستبوونی شاری(سلێمانی)، دانیشتوانی (شارەزوور — شوێنی ئێستای سلێمانی)، بە چ دیالێکتێك پەیڤیون؟.

وەڵامی ئەمەش دیسان زانراوە، کە دیالێکتی (گۆران) بووە. بەڵام محەمەدئەمین زەکی نموونەیەکی زیندووی بۆ سەلماندنی ئەم ڕاستییە باسکردووە، کە هێشتا زمانەوانانی کورد، ئاماژەیان بەم بەڵگەیە نەکردووە. محەمەدئەمین زەکی لەم بوارەدا و لەباسی ڕووداوەکانی لەشکرکێشی و هێرش و کاولکارییەکانی (نادر شا: ١٦٨٨ — ١٧٤٧) ی ئەفشاردا، بۆ سەر کوردستان و ناوچەکانی: شارەزوور و کەرکووك(١٧٣٢ — ١٧٤٣)دا، دەڵێ: (مەعامەلەی نادر شا، دەرهەق بە کورد، زۆر خراپ بوو و کوردەکان ئەیان بوغزاند. حەتتا دائی بەشەڕی لەگەڵ: تۆپاڵ عوسمان پاشا—دا بەلەهجەی — گۆران — هەجوویەکیان بۆ هەڵبەستبوو..) (١٧). بەمانایەکی تر: تا سەدەی هەڤدەش، شێوەزارو ئەدەبیاتی شارەزوور و گەرمیان و کەرکووك، هەر دیالێکتی (گۆران) بووە.

### دوا سەرنج:

ئەو سەرچاوانەی محەمەدئەمین زەکی بۆ نووسینی (خۆلاسەیەکی..) کۆی کردونەتەوە، نزیکەی(٢٥٠) سەرچاوە بوون. لەناو ئەمانەدا ئاماژەمان بەهەندێ لە سەرچاوەگەلی کوردناسان و خۆرهەڵاتناسان کرد، بەڵام

هاوکات کەڵکی لە سەرچاوەیەکی زۆری دراوسێکانی کورد و مێژوونووسانی عەرەبیش وەرگرتووە و لەناو ئەمانەدا وەك نموونە: سیاحەتنامەی ئەولیا چەلەبی، تەئریخی عمومی موراد بەگ، تەئریخی نەعیما، تەئریخی جەودەت، تەئریخی عمومی ئەحمەد ڕەفیق ڕەسملی، خەریطەی عوسمانی تەئریخی، قاموس الاعلام ش س سامی، حاجی خەلیفە، تاریخ ایران باستان(حسن پیرنیا – مشیر الدولە)و.. گەلێکی دیکە. بەداخەوە زانیارییەکانی (هەندێ) لەم سەرچاوانەی، بەبێ بەراورد و لێکۆڵینەوە، وەك خۆیان بۆ کتێبەکەی گواستوونەتەوە، کە بەر لە من مامۆستایان: محەمەد جەمیل بەندی ڕۆژبەیانی،(١٨) حیسامەددین نەقشبەندی،(١٩) د. کەمال فوئاد،(٢٠) د. عەبدولفەتاح عەلی بۆتانی،(٢١) د. فرست مرعی، سەرنج و ڕاستکردنەوەیان لەئاستیاندا نووسیوە و خۆزگەم ئەوەیە لە کاتی سەرلەنوێ لەچاپدانەوەی سەرجەمی بەرهەمەکانی محەمەدئەمین زەکی دا، هەموو ئەو سەرنج و ڕاستکردنەوانەیان پێ زیاد بکرێ.. سەرنجێکی زۆر ورد، کە ئەو بەرێزانە بەلایدا تێپەڕیون، مێژووی مەرگی ڕابەر و شۆڕشگێڕی ناسراو: شێخ عوبەیدوڵڵای نەهری– یە، کە محەمەدئەمین زەکی لە لاپەڕە (٣٣٤)ی بەرگی یەکەمی مێژووەکەیدا، چەردەیەکی لەبارەی شۆڕشەکەیەوە باسکردووە و ئەو زانیارییانە بۆ ئەو کاتە(١٩٣١)، ورد و بەکەڵك بوون و ئاماژەی بەسەرچاوەکانی ئەم بابەتە نەکردووە، بەڵام کە باسی گرتن و خۆبەدەستەوەدانی شێخ عوبەیدوڵڵای کردووە، نووسیوێتی: ساڵی ١٨٨٣، خۆی بەدەستەوەدا! لەکاتێکدا بەگوێرەی ئەو بەڵگە ڕەسمییانەی ئێمە دەستمان کەوتوون، دەریدەخەن کە شێخ عوبەیدوڵڵا لە (١٨٨١/١/٢١ ز)دا، خۆی بەدەستەوە داوە و بەگیراویی و دەستبەسەریی بۆ موسڵ و لەوێشەوە بۆ: ئەسکەندەروونە، بەیرووت، حیجاز، مەدینە و تائیف براوە و دوای مانەوەی نزیکەی دوو ساڵ و دوو مانگ، ڕۆژی (١٢/ ١٠/ ١٨٨٣)، لە شاری (تائیف) کۆچی دوایی کردووە.(٢٢)

**پەراوێز:**

١- ڕۆژنامەی (ژین)، سلێمانی، ژمارە (٥٥٥)، ٩ی شوباتی ١٩٣٩، ل ١.

٢- خولاسەیەکی تەئریخی کورد و کوردستان، جزمی یەکەم، ١٩٣١، بەغداد، ل ٢٥

٣- شەمسی محەمەد ئەسکەندەر (دکتۆر)، مێژووی کورد لەسەدەی ١٦هەمدا، وەرگێڕانی بۆ کوردی: شوکر مستەفا، چاپەمەنی وەزارەتی ڕۆشنبیری هەرێمی کوردستان، هەولێر، چاپی یەکەم، ل ١٨

٤- هەمان سەرچاوە، ل ٣١.

٥- هەمان سەرچاوە، ل ٣١ – ٣٢.

٦- جێی بیرهێنانەوەیە، کە محەمەدئەمین زەکی –ش (٢٠) ساڵ بەر لەنووسینی (خوڵاسە - ١٩٣١)، واتە لەساڵی (١٩١٠)ەوە، دەستی بەکۆکردنەوەی سەرچاوەو زانیاری بۆ ئەم کتێبە کردووە، بەڵام مەخابن ساڵی (١٩١٩) کتێبخانە و ماڵەکەشیان سووتاوە. دووبارە دوای

١-محەمەد مەخزوعی ٢- ژاڵە ٣- حەسەن ٤- سانیحە

گەڕانەوەی بۆ عێراق (١٩٢٤) کەوتۆتەوە پەیداکردنی سەرچاوە و زانیاری
٧- شەمسی ئەسکەندەر (سەرچاوەی پێشتر ناوهێنراو) ل ٢٣
٨- هەمان سەرچاوە، ل ١٦
٩- کلودیوس جەیمس ڕیچ – گەشتنامەی ڕیچ بۆ کوردستان (١٨٢٠)، و بۆ کوردی: محەمەد حەمەباقی، چاپی پێنجەم، چاپەمەنی موکریانی، هەولێر ٢٠١٢، ل ٢٣٨ – ٢٤٠
١٠- پیرەمێرد لە ژمارەکانی ڕۆژنامەی (ژیان) و (ژین)و گۆڤاری (گەلاوێژ)دا، ئەم وتارانەی لەبارەی (خۆلاسە...) ەوە نووسیوە:
- ڕۆژنامەی (ژیان)، ژمارە ٤٢٢، ساڵی ٩، ٨ی کانوونی یەکەمی ١٩٣٤، ل ١
- ڕۆژنامەی (ژیان)، ژمارە ٤٢٥، ساڵی ١٠، ٥ی کانوونی دووەمی ١٩٣٥، ل ٢
- ڕۆژنامەی (ژیان)، ژمارە ٤٢٧، ساڵی ١٠، ١٩ی کانوونی دووەمی ١٩٣٥، ل ٢
- ڕۆژنامەی (ژیان)، ژمارە ٤٣١، ساڵی ١٠، ١٦ی شوباتی ١٩٣٥، ل ١- ٢
- ڕۆژنامەی (ژیان)، ژمارە ٤٣٤، ساڵی ١٠، ٢٣ی ئازاری ١٩٣٥، ل ١
- ڕۆژنامەی (ژیان)، ژمارە ٥٠٢، ساڵی ١١، ١٤ی تشرینی یەکەمی ١٩٣٦، ل ٢
- ڕۆژنامەی (ژیان)، ژمارە ٥٤٢، ساڵی ١٢، ١٥ی تشرینی دووەمی ١٩٣٧، ل ١- ١٢
- ڕۆژنامەی (ژیان)، ژمارە ٥٤٣، ساڵی ١٢، ٢٣ی تشرینی دووەمی ١٩٣٧، ل ٢
- ڕۆژنامەی (ژیان)، ژمارە ٥٥٥، ساڵی ١٣، ٩ی شوباتی ١٩٣٩، ل ١
- ڕۆژنامەی (ژیان)، ژمارە ٥٧٣، ساڵی ١٣، ٦ی تەموزی ١٩٣٩، ل ١
- ڕۆژنامەی (ژیان)، ژمارە٥٧٩، ساڵی ١، ٢٢ی ئازاری ١٩٤٥، ل ٣
- گۆڤاری (گەلاوێژ)، ژمارە (١١ -١٢) ساڵی ٣، دووەم – کانوونی یەکەمی ١٩٤٢، بەغداد، ل ٢١ -٢٣
١١- ڕۆژنامەی (ژین)، سلێمانی، ژمارە ٥٧١، ٢٢ی حوزەیرانی ١٩٣٩، ل ٣. هەروەها هەمان ڕۆژنامە، ژمارە ٥٧٢، ٢٩ی حوزەیرانی ١٩٣٩، ل ٢
١٢- هەمان سەرچاوە
١٣- گۆڤاری (هاوار)، ژمارە ٢٩، سێ شەممە، ١٠ی حوزەیرانی ١٩٤١، ساڵی ٩
١٤- شرفنامە (تاریخ مفصل کردستان)، بە اهتمام ولادیمیر ولیامینیوف زرنوف، انتشارات اساطیر، چاپ اول، ١٣٧٧ هـ . ش، ص ١٢ -١٣.
١٥- ئەو مێژوونووسانە بریتین لە: یادداشتە
- یاداشتەکانی مەئموون بەگی کوڕی بێگەبەگی ئەردەڵان (١٥٧٧ز)، کە بەتەنیا ئەمیان نزیکەی (٢٥) ساڵ بەر لە (شەرەفنامە) نووسراوە
- مەلا محەمەد شەریف (قازی ئەردەڵان): زبدة التواریخ (١٧٩٩ – ١٨٠٠).
- محەمەد ئیبراهیم ئەردەلانی: ذیل شرفنامە (١٨١٠).
- خوسرەو بەگی ئەردەڵان: لب التواریخ (١٨٣٣).
- ماهشەرەف خانم (مەستوورە: ١٨٠٤ – ١٨٤٧): مێژووی ئەردەڵان.
- عبدالقادر بن رستم بابانی: تاریخ و جغرافیای کردستان (١٨٦٩).
-علی اکبر و قائع نگار کردستانی: حدیقەی ناصری (١٨٩١).
١٦- ئەلیکساندەر خودزکۆ: چەند لێکۆڵینەوەیەکی فیلۆلۆژی دەربارەی زمانی کوردی – دیالێکتی سلێمانی – و. بۆ کوردی: د. نەجاتی عەبدوڵڵا.
١٧- خۆلاسە... ل٢٠٧
١٨- گۆڤاری ڕۆشنبیری نوێ، بەغداد، ژمارە ١٢٢، حوزەیرانی ١٩٨٩، ل ٧٥ – ٨١. هەروەها: مجلة المجمع العلمی العراقی – الهیئة، بغداد، المجلد ٢٧ – ٢٨، ١٩٩٨.
١٩- گۆڤاری (ژین)، سلێمانی، ژمارە (١)، تەموزی ٢٠٠٩.
٢٠ – مقدمة الطبعة الثانیة من الجزء الثانی من کتاب (خلاصة تآریخ الکردو کردستان)، لندن، ١٩٨٦.
٢١- گۆڤاری (ژین)، سلێمانی، ژمارە (١)، القسم العربی، تموز ٢٠٠٩، ص ٣٥١ – ٣٧٠
٢٢- چی لەبارەی (ئەمین زەکی بەگ)ەوە نووسراوە، ئامادەکردنی: ڕەفیق ساڵح، چاپەمەنی بنکەی (ژین)، سلێمانی، ٢٠١٠، ل ٣٨٦.
٢٣- بۆ زیاتر زانیاریی لەم بارەیەوە بنواڕە: محەمەد حەمەباقی، شۆڕشی شێخ عوبەیدوڵڵای نەهری (١٨٨٠) لەبەڵگەنامەی قاجاری دا، چاپەمەنی موکریانی، هەولێر، ٢٠٠٠، ل ٢٥، ٢٤٧، ٢٤٨

سەرنج: سەیر لەوەدایە بەڕێز (د. کەمال فوئاد) لەئاست مێژووی ناوبراودا، لەباتی ئەوەی ڕاستی بکاتەوە، مێژووی مەرگی شێخ عوبەیدوڵڵای نەهری کردۆتە (١٨٨٨)! لەم بارەیەوە بنواڕە: چی لەبارەی (محەمەدئەمین زەکی بەگ)ەوە نووسراوە. سەرچاوەی پێشتر ناوبراو، ل٣٤٥

# ئەمین زەکی بەگ لە ناوەڕۆکی کتێبی کوردیدا

بوار نورەدین

لەم سەرەتایەدا پێویستە بڵێین، کتێبە ناوازەکەی مامۆستا ڕەفیق ساڵح بە ناوی (چی لە بارەی «محەمەدئەمین زەکی بەگ»ـەوە نووسراوە) ئامادەی کردووە، کارێکی کەم وێنەیە و لە خۆیدا بیبلیۆگرافیایەکی تایبەت بە ڕەحمەتی (محەممەد ئەمین زەکی بەگ)ـە؟ چونکە کاری لەم جۆرە بۆ کەم نووسەر و ناوداری کورد ئامادە کراوە... لەگەڵ ئەمەشدا و بەهۆی کۆمەڵێك هۆکار و کێشەی (کتێب) و (کتێبخانە)ی کوردییەوە، هەست دەکەین هەندێکیانی بەرچاو نەکەوتبێت؟
لەلایەکی ترەوە لە پێناو ناوەڕۆکی ئەم ژمارەیەی (ڕۆڤار)دا، بە وردی بەناو فایلی بیبلیۆگرافیاکەماندا گەڕاین و توانیمان بیبلیۆگرافیایەکی تایبەت بە (محەممەد ئەمین زەکی بەگ) ئامادە بکەین و بەو شێوازەی خوارەوە ڕێکیان بخەین، لە کاتێکدا، کارەکەی ئێمەش هەموو بڵاوکراوەکانی نەگرتووەتەوە — وەك: گۆڤار و ڕۆژنامە-، هەروەك لە بابەتەکەی تریشدا ئاماژەی پێ کراوە، بیبلیۆگرافیاکەش تەنها لە بارەی کتێبی کوردییەوەیە... بەڵام لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا، دەکرێ هەردووکیان ببنە تەواوکەری یەکتری و تا ڕادەیەکی زۆر کارەکە لە کۆتایی نزیك بووبێتەوە، واتە بە هەردوو بیبلیۆگرافیاکە —کتێبەکەی مامۆستا ڕەفیق و ئەم بیبلیۆگرافیایە- توانیبێتمان زۆربەی سەرچاوەکان لە بارەی ژیان و بەرهەمەکانی ڕەحمەتی (ئەمین زەکی بەگ)ەوە، بخەینە بەردەستی خوێنەران و لێکۆڵەران...
سەرەتا پێنج کتێب دەناسێن کە بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ کاریان لەسەر ژیان و بەرهەمەکانی ڕەحمەتی کردووە، هەروەها پێویستە خوێنەر لەوە ئاگادار بکەینەوە، شێوازی ناساندنی کتێبەکان شێوەیەکی تایبەتە و لێرەدا ناکرێت ئەم هەموو وردەکارییانە بخەینەڕوو، بەڵکو خوێنەر دەتوانێت بۆ سەرەتای (کتێبی: بیبلیۆگرافیای ناسێنراو و پۆلێنکراوی کتێبی تایبەت بە کورد و کوردستان: ١٩٢٥- ٢٠١٠ «بەرگی یەکەم: مێژوو»، ئامادەکردن: بوار نورەدین، چاپی یەکەم- چاپخانەی «سەردەم» سلێمانی- کوردستان، لە بڵاوکراوەکانی دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، ٢٠١٢) بگەڕێتەوە، هەروەها هەمان ئەو (هێما)یانەی لە بابەتەکەی تردا بەکارهاتوون، لێرەشدا بەکارهاتوونەتەوە:

١. محمد أمين زكي
لەسەر ئەكی عەلائەددین سەجادی چاپكراوە
چاپ: یەكەم، چ: معارف، ش: بەغدا، ژس: ؟، س: ١٩٤٨، ل: ٨٠، ق: (١٥×٢١)
ناوەرۆك:
وێنەی ئەمین زەكی بەگ/ لە لاپەڕە ٣دا نووسراوە: یادی محەممەد ئەمین زەكی بەگ/ سەرەتا: عەلائەددین سەجادی/ وتاری: مەعالی مامۆستا تۆفیق وەهبی بەگ/ وتاری: سەعادەت مەعرووف چیاووك بەگ/ وتاری: مامۆستا شێخ محەممەدی خاڵ قازی سلێمانی "مەرگی ئەمین زەكی"/ وتاری: مامۆستا عەبدولقادر قەزاز/ وتاری: مامۆستا مەلا مستەفای سەفوەت/ وتاری: ئەبوبەكر ئەفەندی "شێخ جەلال"/ سۆزی مامۆستا پیرەمێرد بۆ خوالێخۆشبوو/ شیوەنە بەجۆشەكەی سەلام/ شینەكەی بێكەس/ چەند وتارێكیش بە زمانی عەرەبی.

٢. دوو تەقەلای بێ سوود
نووسەر: محەممەد ئەمین زەكی بەگ
توێژینەوە، لێكۆڵینەوە و پێشەكی و پەراوێز ڕێكخستن: سەباحی غالب
چاپ: یەكەم، چ: هەڵوێست، ش: لەندەن، ژس: ؟، س: ١٩٨٤، ل: ١١٦، ق: (١٧×٢٣)
ناوەرۆك:
كەڵكەڵەی دۆزینەوەی دوو تەقەلای بێ سوود/ كورتەی ژیانی محەممەد ئەمین زەكی/ هەندێ چالاكی محەممەد ئەمین زەكی لە پارلەماندا/ نرخاندنێكی دوو تەقەلا/ بەرهەمە چاپكراوەكانی محەممەد ئەمین زەكی و نووسینەكانی لە گۆڤاری گەلاوێژدا/ بەرگی ئەسڵی دوو تەقەلای بێ سوود/ لاپەڕی ئەسڵی سەرەتاكەی/ سەرەتا/ ئەو عەریزەی كە دراوە بە مەلیك فەیسەڵی یەكەم- ٢٥ی كانوونی سانی ١٩٣٠/ مەلحەقی عەریزەكە- نامەی وەزارەتی دەرەوەی بەریتانیا دەربارەی مەسەلەی كورد لە كوردستانی خوارووا/ ئەو عەریزەی دراوە بە مەندووبی سامی- ٢٥ی مایسی ١٩٣١/ پێڕست/ كورتەیەك دەربارەی كتێبەكە بە زمانی ئینگلیزی.

٣. محمدأمین زكي ودوره السیاسي والإداري في العراق ١٩٢٤-١٩٤٨
نووسەر: دارا جمال غفور
لە بڵاوكراوەكانی بنكەی ژین
چاپ: یەكەم، چ: شڤان، ش: سلێمانی، ژس: ٢١٣٥، س: ٢٠٠٨، ل: ١٧٢، ق: (١٧×٢٤)
ناوەرۆك:
ڕۆڵی سیاسی و ئیداری محەممەد ئەمین زەكی لە ئیراقدا لە نێوان ساڵانی ١٩٢٤- ١٩٤٨...

٤. چی لە بارەی "محەممەدئەمین زەكی بەگ"ـەوە نووسراوە
ئامادەكردن: ڕەفیق ساڵح
لە بڵاوكراوەكانی بنكەی ژین
چاپ: یەكەم، چ: شڤان، ش: سلێمانی، ژس: ١٩٩٠، س: ٢٠٠٩، ل: ٤٥٠، ق: (١٧×٢٤)
ناوەرۆك:
پێڕست/ لەنێوان محەممەد ئەمین زەكی و پیرەمێرددا/ تەئریخ و ئەشخاص/ ئیجتیماعییات/ بابەتی تری كوردی لەبارەی محەممەدئەمین زەكی بەگەوە/ عەلی كەمال باپیر: ئەمین زەكی بەگ/ شێخ محەممەدی خاڵ: تەشەكوری مەعالی ئەمین زەكی بەگ/ ڕەفیق حیلمی: ئەمین زەكی بەگ عەسكەرو موئەرریخ/ ئوسمان صەبری: تاریخا كورد و كوردستانێ/ عەلائەدین سەجادی: ئەمین زەكی كۆچی كرد/ ڕەشید نەجیب: ئەمین زەكی/ شاكر فەتاح، ئەمین زەكی بەگ/ ئەمین زەكی بەگ: سەردار حەمەد ئاغا/ دوكتۆر ت. ب. مەریوانی: كورد فیلەتەنی دەوێ/ ئەمین زەكی بەگ مێژوونووسێكی گەورەی كورد/ هەر نەمر بێت ئەمین زەكی بەگ/ مەحموود زێوەر: لەگەڵ ناودارانا- ئەمین زەكی بەگ/ غ. ڕ. "غەفوور ڕەشید داراغا": ئەمین زەكی بەگی مێژووناس/ محێدین شێخانی: لە یادی مێژوونووسی بەناوبانگی كورد محەممەدئەمین زەكی بەگ/ جەمال محەممەد محەممەدئەمین: لە یادی كۆچی مێژوونووسی كورد ئەمین زەكی بەگدا/ جەمال محەمەد محەممەدئەمین: لە پیاوە ناودارەكانی كورد ئەمین زەكی بەگ/ سەباحی غالب: هەندێ چالاكیی محەممەد ئەمین زەكی بەگ لە پەرلەماندا/ دوكتۆر عیزەدین مستەفا ڕەسووڵ: ئەمین زەكی و ئەدەب/ مستەفا ساڵح كەریم: چەپكێك نامەو یادگاری نێوان ئەمین زەكی بەگ و حاجی تۆفیق بەگ/ محەممەد حەمەبۆر: دوو تەقەلا بێسوودەكەی ئەمین زەكی بەگ/ مستەفا نەریمان: محەممەد ئەمین زەكی لە كتێبی (بغداد وصوك حادثە ضیاعی)/ جەمیل ڕۆژبەیانی: هەڵەی مێژوویی لە (تاریخ الدول والإمارات الكردیە) و (شەرەفنامە)دا/ هیدایەت ئەحمەد: ئەمین زەكی بەگ مێژوونووسێكی شاعیر بوو/ م. جەمیل ڕۆژبەیانی: دودمانی ئاریانی و مێژووی كورد و كوردستانی ئەمین زەكی بەگ/ مەلا جەمیل ڕۆژبەیانی: لە یادی مێژوونووسێكی مەزن و نەمری كورددا/ دكتۆر كەمال مەزهەر ئەحمەد: لەنێوان ئەحمەد خواجا و ئەمین زەكی بەگدا/ مامۆستا جەعفەر "فازڵ كەریم ئەحمەد": محەممەدئەمین زەكی/ مامۆستا جەعفەر: قاوەخواردنەوەیەك لەگەڵ كیژەكەی هێرۆدۆتی كورددا/ مامۆستا جەعفەر: ژنێك لە دارگوڵ- دانیشتن لەگەڵ كچەزایەكی هێرۆدۆتی كورددا/ د. حیسامەددین نەقشبەندی: چەند سەرنجێكی ڕەخنەگرانە سەبارەت بە نووسینەكانی محەممەد ئەمین زەكی بەگ لەبارەی مێژووی كورد و كوردستانەوە لە سەردەمی ئیسلامیدا/ خالد تەوەكولی: مۆدیلی ناسیۆنالیسمی ئەمین زەكی بەگ و پرۆژەی

کۆمەڵایەتی لە کوردستان/ ما کتب عن محمد أمین زکی باللغە العربیە/ مشاهیر الأکراد- أمین زکی وزیر المواصلات والأشغال/ شاکر علی التکریتی: نصف ساعە مع معالی الاستاذ محمد أمین زکی/ الدکتور أحمد عثمان أبوبکر: بمناسبە مرور أربعین سنە علی صدور کتاب (خلاصە تأریخ الکرد وکردستان)/ عبد الله محمد حداد: قلم معطاء فی سفر التاریخ الکردی/ کمال رؤوف محمد: صفحە عراقیە منسیە/ میر البصری: محمد أمین زکی الوزیر العالم المؤرخ/ محمد ملا جمیل الروژبیانی: تصحیح الاخطاء التأریخیە (من لجنە التأریخ)/ الدکتور کمال مضهر أحمد: مقدمە الطبعە الثانیە من کتاب (خلاصە تأریخ الکرد وکردستان)/ خیری أمین العمری: محمد أمین زکی/ الدکتور کمال فؤاد: ملاحضات انتقادیە حول کتاب (خلاصە تأریخ الکرد وکردستان) لمؤلفە الراحل محمد أمین زکی/ أ. د. عبد الفتاح علي البوتاني: محمد أمین زکی من خلال کتابە (خلاصە تأریخ الکرد وکردستان من أقدم العصور التأریخیە حتی الآن)/ ابراهیم باجلان: الذکری الحادیە والستون لرحیل عمید التأریخ الکردی محمد امین زکی سیرە ثقافیە وتأریخیە حافلە/ د. فرست مرعی: الادیان فی خلاصە تأریخ الکرد وکردستان (ملاحضات وإستدراکات)/ پاشکۆ: تقریر محمد أمین زکی نائب السلیمانیە بشأن الجیش العراقی.

٥. ئەلبوومی محەمەدئەمین زەکی بەگ
ئامادەکردنی: سدیق ساڵح
لە بڵاوکراوەکانی بنکەی ژین
چاپ: یەکەم، چ: کەکۆن، ش: سلێمانی، ژس: ، س: ٢٠١٢، ل: ١٨٠، ق: (٢١×٢٩)
ناوەرۆك:
ئەم ئەلبوومە: سدیق ساڵح/ هذا الالبوم/ مێژوونووسی گەورە محەممەد ئەمین زەکی/ المؤرخ الکبیر محمد أمین زکی/ وێنەکان کە لەسەر ئارت و بە شێوازێکی جوان چاپ کراون و لە ژێر هەر وێنەیەکیشدا، زانیاری لەبارەی وێنەکانەوە نووسراوە.

ئەمانەش ئەو کتێبانەن کە –بە هەر شێوەیەك بێ- باسیان لە ژیان و بەرهەمەکانی خوالێخۆشبوو کردووە، یان بابەتی ئەویان تێدا بڵاو کراوەتەوە:

١. کارەستەی شعرای هاوعصرم، نووسەر: عەلی کەمال باپیر ئاغا، چاپی یەکەم، چاپخانەی (ژیان)، سلێمانی، ١٩٣٩: ئەمین زەکی بەگ...
٢. شعر و ادبیاتی کوردی، نووسەر: ڕەفیق حیلمی، چاپی یەکەم، چاپخانەی (تەفیز)، بەغدا، ١٩٤١: وێنە و چەند نموونە شیعرێك و کورتەیەك لە ژیانی کۆمەڵێك شاعیری کورد وەك: ئەمین زەکی بەگی عەسکەر و موئەرخ...
٣. مێژوو- کورتە باسێکی مێژوو و کورد و مێژوو، نووسەر: د. کەمال مەزهەر ئەحمەد، بە یاریدەی ئەمینداریتی گشتیی ڕۆشنبیری و لاوان چاپ کراوە، چاپی یەکەم، چاپخانەی (دار آفاق عربیە)، بەغدا، ١٩٨٣: بەشی سێیەم: کورد و مێژوو/ دەستەی دووەمی مێژوونووسانی کورد: ئەمین زەکی...
٤. کاکەیی، پشکنین و لێکۆڵینەوە و توێژ هەڵدانەوەی: محەمەد ئەمین هەورامانی، لەسەر ئەرکی عەلی بۆسکانی چاپکراوە، چاپی یەکەم، چاپخانەی (ئەلحەوادس)، بەغدا، ١٩٨٤: چی دەربارەی کاکەییەوە نووسراوە؟/ ئەمین زەکی بەگ و عەلی ئیلاهی...
٥. خەباتی ڕۆشنبیران- ئەم نووسراوە بەشی هەرە گەورەو گرنگی (یادنامەی ساڵی ١٩٣١)مە، کە خەباتی (ڕۆشنبیرانی کورد) لەو ساڵەدا پیشان دەدات، نووسینی: شاکر فەتاح، چاپی یەکەم، چاپخانەی (ئەلحەوادس)، بەغدا، ١٩٨٤: ئەمین زەکی بەگ و مێژووی کورد ٢-٤-١٩٣١/ وتاری ئەمین زەکی بەگ...
٦. ناڵەی دەروون- کۆمەڵە وتارێکی ویژەیی و مێژوویی و ئایینیی و کۆمەڵایەتین- بەشی یەکەم، نووسەر: محەممەدی خاڵ، بە یارمەتی لیژنەی نیشتمانی ئاهەنگ گێڕان بە بۆنەی هاتنی سەدەی پانزەهەمی کۆچییەوە لە کۆماری عێراق لە چاپ دراوە، چاپی یەکەم، چاپخانەی (ارشاد)، بەغداد، ١٩٨٤: چلەی کۆچی ئەمین زەکی...
٧. گەنجینەی مەردان و یاداشتی ڕۆژانی دەربەدەری، نووسینی: مەلا عەبدوڵلای

محەمەدئەمین زەکی

زێوەر، نووسینی بە شێوەی نوێ و پێشەکی و پەراوێز بۆ
نووسین: محەممەدی مەلا کەریم، بە یارمەتی ئەمینداریێتی
گشتی ڕۆشنبیری و لاوان لە چاپ دراون، چاپی یەکەم،
چاپخانەی (ئەلئەدیب)، بەغداد، ١٩٨٥: ئەمین زەکی بەگ...
٨. شیعر و ئەدەبیاتی کوردی، نووسەر: ڕەفیق حیلمی، چاپی
دووەم؟ چاپخانەی (ئەلتەعلیم ئەلعالی)، بەغدا، ١٩٨٨: ئەمین
زەکی بەگ...
٩. دیاری نەورۆز لە پەخشانی کوردیدا، کۆکردنەوە
و ئامادەکردن و پەراوێز بۆ نووسینی: عومەر ئیبراهیم
عەزیز، پێشەکی: موختار حەیدەر، لەسەر ئەرکی زانکۆی
سەلاحەددین لە چاپ دراوە، چاپی یەکەم، چاپخانەی
(ئەلفنون)، بەغدا، ١٩٩٠: ژیان و بەرهەمی محەممەد ئەمین
زەکی بەگ...
١٠. کوردناسی، نووسەر: م. ئاورنگ، وەرگێرانی لە
فارسییەوە: بورهان قانع، چاپی دووەم، چاپخانەی (ژیار)،
سلێمانی، ١٩٩٩: پێشەکی: لێکدانەوەکانی ئەمین زەکی
بەگ...
١١. نزار- گۆڤارێکی حەفتەیی سیاسی کوردی و عەرەبی
یە- مجلە أسبوعیە سیاسیە جامعە باللغتین العربیە والکردیە
(١٩٤٨/٣/٣٠- ١٩٤٩/٢/١٥): ئامادەکردنی: ڕەفیق سالّح،
لێکۆڵینەوە و پێرستکاری: سدیق سالّح، لە بلاوکراوەکانی
دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، چاپی یەکەم، چاپخانەی
(سەردەم)، سلێمانی، ٢٠٠٠: نزاری ژمارە ١- هەندێ بابەتی
وەك: ئامۆژگاری ئێمە بۆ نزار: ئەمین زەکی بەگ...
١٢. پیرەمێرد و پێداچوونەوەیەکی نوێی ژیان
و بەرهەمەکانی- بەرگی یەکەم، کۆکردنەوە و
لێکۆڵینەوەی: ئومێد ئاشنا، لە بلاوکراوەکانی دەزگای
چاپ و بلاوکردنەوەی ئاراس، چاپی یەکەم، چاپخانەی
(و-پەروەردە)، هەولێر، ٢٠٠١: ئەوانەی ناسیمن: ئەمین
زەکی بەگ...
١٣. ژیاننامەی مێژوونووسانی کورد- بەرگی یەکەم،
ئامادەکردنی: عوسمان سەید قادر، لەسەر ئەرکی
ڕێکخراوی (**Helpage International**) چاپکراوە،
چاپی یەکەم، چاپخانەی (بەدرخان)، سلێمانی، ٢٠٠١:
محەممەد ئەمین زەکی بەگ...
١٤. ڕەشید نەجیب- ژیانی و بەرهەمەکانی ١٩٠٦- ١٩٦٨،
ئامادەکردنی: ئومێد ئاشنا، لە بلاوکراوەکانی دەزگای چاپ
و بلاوکردنەوەی ئاراس، چاپی یەکەم، چاپخانەی (و-
پەروەردە)، هەولێر، ٢٠٠١: ئەمین زەکی...
١٥. ناودارانی کورد، نووسەر: میر بەسری، وەرگێرانی لە
عەرەبییەوە: عەبدولخالق عەلائەددین، لە بلاوکراوەکانی
دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، چاپی دووەم، چاپخانەی
(سەردەم)، سلێمانی، ٢٠٠٢: محەممەد ئەمین زەکی...
١٦. خەرمان- شارا- تۆماری تەمەن- ئەرشیف ٣، نووسینی:
کەریم زەند، چاپی یەکەم، چاپخانەی (ئەزمڕ)، سلێمانی،
٢٠٠٣: ئەمین زەکی بەگ...
١٧. ئاوێنەی ژینم- یادداشتەکانی شاکر فەتاح-١،
کۆکردنەوە و ڕێکخستنی: ئەحمەد سەید عەلی بەرزنجی،
لە بلاوکراوەکانی دەزگای چاپ و بلاوکردنەوەی ئاراس،
چاپی یەکەم، چاپخانەی (و- پەروەردە، هەولێر، ٢٠٠٣:
ئەمین زەکی بەگ...
١٨. محاسەبەی نیابەت، ئامادەکردنی: ئەحمەد حسێن، لە
چاپکراوەکانی بەڕێوەبەرێتیی گشتیی چاپ و بلاوکردنەوەی
وەزارەتی ڕۆشنبیری، چاپی یەکەم، چاپخانەی (و-
ڕۆشنبیری)، سلێمانی، ٢٠٠٥: ئەمین زەگی بەگ، ئەو
قەڵەمەی ئاسۆ لە ئامێزی دەگرێت: ئەحمەد حسێن ئەحمەد/
لە مەڕ محاسەبەی نیابەتەوە/ محاسەبەی نیابەت/ معاریف/ بە
کورتی (مامۆستا محەممەد ئەمین زەکی).
١٩. مێژووی ئەدەبی کوردی- بەرگی پێنجەم- نێوانی
هەردوو جەنگی یەکەم و دووەمی سەدەی بیستەم، دانانی:
د. مارف خەزنەدار، لە بلاوکراوەکانی دەزگای چاپ
و بلاوکردنەوەی ئاراس، چاپی یەکەم، چاپخانەی (و-
پەروەردە)، هەولێر، ٢٠٠٥: بەشی شازدەم: ئەمین زەکی...
٢٠. شاری سلێمانی ململانێی گروپە کۆمەڵایەتییەکان

١٨٢٠- ١٩٢٠، نووسەر: مامۆستا جەعفەر، لە بڵاوكراوەكانی (پەنجاهەمین ساڵیادی كۆچی دوایی یەكەم مەلیكی كوردستان شێخ مەحموودی حەفید+ بنكەی ژین)، چاپی دووەم، چاپخانەی (شڤان)، سلێمانی، ٢٠٠٦: محەممەد ئەمین زەكی...

٢١. باخێك لە وشە- گەشتێك بە ژیاننامەی پڕشكۆی پیرەمێرددا، نووسینی: مستەفا ساڵح كەریم، لە بڵاوكراوەكانی دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، چاپی یەكەم، چاپخانەی (سەردەم)، سلێمانی، ٢٠٠٦: چەپكێك نامە و یادگاری نێوان ئەمین زەكی بەگ و حاجی تۆفیق...

٢٢. گەلاوێژ- گۆڤارێكی ئەدەبی و سەقافی مانگیی كوردییە- ژمارە ١- ١٢ كانونی یەكەمی ١٩٣٩- تشرینی دووەمی ١٩٤٠، خاوەن ئیمتیاز و سەرنووسەر: ئیبراهیم ئەحمەد، بەڕێوەبەری نووسین و سەرپەرشتیاری چاپ: عەلائەددین سوجادی، لە بڵاوكراوەكانی ڕێكخراوی ئیبراهیم ئەحمەد- پڕۆژەی چاپكردنەوەی گۆڤاری گەلاوێژ -١-، چاپی یەكەم، چاپخانەی (كارۆ)، سلێمانی، ٢٠٠٧: ژمارە یەك- ساڵی یەكەم: زمانی كوردی و ئەدەبی: محەممەد ئەمین زەكی بەگ/ ژمارە سێ ساڵی یەكەم: كوردی بەناوبانگ- ئەمیرخانی برادۆست و دمدم قەڵا: محەممەد ئەمین زەكی (بۆ ژمارەكانی تر درێژەی هەیە)/ ژمارە چوار ساڵی یەكەم: لە قەبرستانی تەئریخا- ئەحمەدی زووحاك قارەمانێكی نەناسراوی كورد: محەممەد ئەمین زەكی/ ژمارە پێنج و شەش ساڵی یەكەم: ئیملای كوردی/ كوردی بەناوبانگ- مەلەك ئەلعادل سەیفەددین ئەبوبەكر محەممەد: محەممەد ئەمین زەكی/ ژمارە هەشت ساڵی یەكەم: كوردی بەناوبانگ- مەلەك ئەفزەل: محەممەد ئەمین زەكی/ ژمارە نۆ ساڵی یەكەم: كوردی بەناوبانگ- مەلەك ناسر سەلاحەددین یوسف: محەممەد ئەمین زەكی/ ژمارە ١١-١٢ ساڵی یەكەم: كوردی بەناوبانگ- ئەبو ئەلفیدا: محەممەد ئەمین زەكی...

٢٣. گەلاوێژ- گۆڤارێكی ئەدەبی و سەقافی مانگیی كوردییە- ساڵی دووەم ژمارە ١- ١٢ كانوونی دووەم ١٩٣٩- كانوونی یەكەمی ١٩٤١، خاوەن ئیمتیاز و سەرنووسەر: ئیبراهیم ئەحمەد، بەڕێوەبەری نووسین و سەرپەرشتیاری چاپ: عەلائەددین سوجادی، لە بڵاوكراوەكانی ڕێكخراوی ئیبراهیم ئەحمەد- پڕۆژەی چاپكردنەوەی گۆڤاری گەلاوێژ -٢-، چاپی یەكەم، چاپخانەی (كارۆ)، سلێمانی، ٢٠٠٧: ژمارە یەك و دوو ساڵی دووەم: كوردی بەناوبانگ- مەولانا ئیدریس بتلیسی: محەممەد ئەمین زەكی بەگ/ ژمارە سێ و چوار ساڵی دووەم: كوردی بەناوبانگ- مەلەك ساڵح نەجمەددین ئەیووب: ئەمین زەكی بەگ/ ژمارە پێنج و شەش ساڵی دووەم: كوردی بەناوبانگ (چەند ناودارێك): محەممەد ئەمین زەكی بەگ/ ژمارە حەوت و هەشت ساڵی دووەم: كوردی بەناوبانگ (چەند ناودارێك): محەممەد ئەمین زەكی بەگ/ ژمارە ٩-١٢ ساڵی دووەم: كوردی بەناوبانگ (چەند ناودارێك): محەممەد ئەمین زەكی بەگ...

٢٤. گەلاوێژ- گۆڤارێكی ئەدەبی و سەقافی مانگیی كوردییە- ژمارەكانی ساڵی سێیەم ١٩٤٣، خاوەن ئیمتیاز و سەرنووسەر: ئیبراهیم ئەحمەد، بەڕێوەبەری نووسین و سەرپەرشتیاری چاپ: عەلائەددین سوجادی، لە بڵاوكراوەكانی ڕێكخراوی ئیبراهیم ئەحمەد- پڕۆژەی چاپكردنەوەی گۆڤاری گەلاوێژ -٣-، چاپی یەكەم، چاپخانە (؟)، سلێمانی، ساڵ ؟: ژمارە پێنج و شەش ساڵی سێیەم: كوردی بەناوبانگ (چەند ناودارێك): محەممەد ئەمین زەكی بەگ (بۆ ژمارەكانی تر درێژەی هەیە)...

٢٥.ناڵەی دەروون- كۆمەڵە وتارێكی وێژەیی و مێژوویی و ئاینی و كۆمەڵایەتین، نووسەر: شێخ محەممەدی خاڵ، لە بڵاوكراوەكانی دەزگای چاپ و بڵاوكردنەوەی ئاراس، چاپی یەكەم، چاپخانەی (ئاراس)، هەولێر، ٢٠٠٧: چلەی كۆچی ئەمین زەكی...

٢٦. گوڵی دڵی مەلای گەورەی كۆیی، نووسینی: مەلا حوسێن گورژی، لە بڵاوكراوەكانی نووسینگەی تەفسیر، چاپی یەكەم، چاپخانەی (؟)، هەولێر، ٢٠٠٨: ئەمین زەكی بەگ...

٢٧. مێژوو- كورتە باسێكی مێژوو و كورد و مێژوو، نووسەر: د. كەمال مەزهەر ئەحمەد، لەبڵاوكراوەكانی دەزگای چاپ و بڵاوكردنەوەی هیڤی، چاپی دووەم، چاپخانەی (هیڤی)، هەولێر، ٢٠٠٨: بڕوانە كتێبی ژمارە ٣.

٢٨. سنووری كوردستان، نووسەر: د. عەبدوڵڵا غەفور، لە بڵاوكراوەكانی دەزگای چاپ و بڵاوكردنەوەی موكریانی، چاپی سێیەم، چاپخانەی (و- پەروەردە)، هەولێر، ٢٠٠٩: بەشی سێیەم: سنووری نەتەوەیی كورد: محەممەد ئەمین زەكی...

٢٩. گۆڤاری ڕۆژی نوێ- ساڵی یەكەم (ژمارە ١-٦) (نیسان- ئەیلوولی ١٩٦٠)، ئامادەكردنی: سدیق ساڵح- ڕەفیق ساڵح، لە بڵاوكراوەكانی بنكەی ژین، چاپی یەكەم، چاپخانەی (شڤان)، سلێمانی، ٢٠١٠: ژمارە چواری ساڵی یەكەم: ئەمین زەكی- مێژوو نووسیی گەورەی كورد...

٣٠. گۆڤاری هەتاو ١٩٥٤- ١٩٦٠/ بەرگی یەكەم- بەشی یەكەم (ژمارە ١-١١)، ئامادەكردن: سدیق ساڵح، ڕەفیق ساڵح، عەبدوڵڵا زەنگەنە، پێشەكی و لێكۆڵینەوە: د. كوردستان موكریانی، پرۆژەی هاوبەشی بنكەی ژین و دەزگای موكریانی، چاپی یەكەم، چاپخانەی (باز)، هەولێر، ٢٠١٠: ژمارە سێ: ئەمین زەكی بەگ: شاكر فەتاح/ ئەمین زەكی بەگ: سەردار حەمەد ئاغا سلێمانی...

٣١. شیعر و ئەدەبیاتی كوردی، نووسەر: ڕەفیق حیلمی، لە بڵاوكراوەكانی دەزگای چاپ و بڵاوكردنەوەی ئاراس، چاپی (دووەم نووسراوە بەڵام سێیەمە)، چاپخانەی ئاراس، هەولێر، ٢٠١٠: ئەمین زەكی بەگ...

# بیبلیۆگرافیای بەرهەمەکانی محەممەد ئەمین زەکی بەگ

ئا: بوار نورەدین

یەکێك لە بایەخە هەرە گرنگەکانی (بیبلیۆگرافیا)، دۆزینەوەی ئەو بابەتانەیە کە نووسەران و لێکۆڵەران بەدوایدا دەگەڕێن. بە پێی ئەوەی چەند ساڵێکە خەریکی ئامادەکردنی بیبلیۆگرافیایەکین بە ناوی (بیبلیۆگرافیای ناسێنراو و پۆلێنکراوی کتێبی کوردیی تایبەت بە کورد و کوردستان)ـەوە، تاکو نووسینی ئەم بابەتە، زۆرتر لە ٥٠٠٠ ناونیشانی (کتێبی کوردی)یمان ئامادە کردووە، لەبەر ئەمە پێمان باش بوو بۆ ئەم ژمارەیەی (ڕۆڤار) -هەروەك لەلایەن دەستەی ئامادەکارەوە داوامان لێ کرا- دوو بیبلیۆگرافیا ئامادە بکەین: بیبلیۆگرافیای بەرهەمەکانی (محەممەد ئەمین زەکی بەگ). بیبلیۆگرافیای ناوی ئەم کەسایەتییەی کورد لە نێو کتێب و کتێبخانەی کوردیدا.
سەرەتا پێویستە لەمەش ئاگادارتان بکەینەوە، بیبلیۆگرافیاکەمان تەنیا لە بارەی (کتێبی کوردی)یەوەیە، واتە گۆڤار و ڕۆژنامەی نەگرتووەتەوە، تەنها ئەوانەی گرتووەتەوە کە وەك (کتێب) دووبارە چاپ کراونەتەوە، هەروەها کتێبی بە زمانەکانی: عەرەبی، فارسی، تورکی، ئینگلیزی... نەگرتووەتەوە، بەڵام لە پێناوی ئەم بابەتەدا، هەوڵی ئەوە دراوە بۆ (کتێبە کوردییەکان)ی بە هەمان شێوازی بیبلیۆگرافیاکەمان، کتێبەکانی بناسێنین، هەروەها بە شێوازێکی تریش، کتێبە (عەرەبی) و (تورکی)یەکانی بخەینە ڕوو، ئەمە لە کاتێکدایە، ڕەنگە لە ئامادەکردنی بیبلیۆگرافیای بەرهەمەکانی (ئەمین زەکی بەگ)دا کە بە زمانەکانی تر نووسراو و چاپکراون، بواردنی تێ کەوتبێت، بە تایبەت لە بابەتەکەی تردا بە شوێن ئەو بابەتانەدا گەڕاوین کە لە بارەی (ناو) و (ژیان) و (بەرهەم) ـەکانی (ئەمین زەکی بەگ)ـەوە نووسراون.
تێبینی: لە پێناو دووبارە نەبوونەوەی هەندێ لە وشەکان، ئەم چەند هێمایەمان دیاری کردووە: (چاپ: نۆرەی چاپە واتە چاپی یەکەم و دووەم/ چ: چاپخانە/ ش: شوێن/ ژس: ژمارەی سپاردن/ س: ساڵ/ ل: لاپەرە/ ق: قەوارە- مەبەست لە سانتیمەترە و

"پانی"ی پێش "درێژی"ی نووسراوە).

محاسبەی نیابت (بو موكلە محترمەكانم)- ئەوی حسابی پاكە لە محاسبە بی باكە
نووسەر: محەممەد ئەمین زەكی
چاپ: یەكەم، چ: دار السلام، ش: بەغدا، ژس: ؟، س: ١٩٢٨، ل:٣١، ق: (؟)
ناوەرۆك:
محاسبەی نیابەت/ تەشكیلات/ سەحیە/ مەعارف/ ئینشائات/ ڕێگەی لوا/ خەتی تەلەگراف و تەلەفۆن و مەركەزی بوستی/ معاونی بەلەدیە/ خزمەتی عمومی و خسوسی/ نەتیجە.

خلاصەیەكی تاریخی كورد و كوردستان- جلدی أول (جزمی اول) لە زور قدیمەوە تا دوری نادر شاە
نووسەر: محەممەد ئەمین زەكی
فائدەی ئەم ئەوەل چاپی كوردیەی بۆ (یانەی سەركەوتن)ـە
چاپ: یەكەم، چ: دارالسلام، ش: بەغدا، ژس: ؟، س: ١٩٣١، ل:١٩٤، ق: (١٤×٢١)
ناوەرۆك:
وێنەی نووسەر/ ئەم كتێبەم چۆن نووسی؟/ فەسڵی یەكەم: كوردستان و جێگە و مقداری كورد/ فەسڵی دووەم: مەنشەئی كورد/ فەسڵی سێیەم: موختەسەر ئەحوالییەی تەئریخی كورد و كوردستان/ فەسڵی چوارەم: كورد لە دوای فتوحاتی توركدا (تا دەوری ئیلخانی)/ فەسڵی پێنجەم: كورد تا دەوری سەفەوی/ هەڵەی چاپ/ نەخشەیەك.

خلاصەیەكی تاریخی كورد و كوردستان- جلدی أول (جزمی دوەم)
نووسەر: محەممەد ئەمین زەكی
چاپ: یەكەم، چ: دارالسلام، ش: بەغدا، ژس: ؟، س: ١٩٣١، ل:٢١٥١، ق: (١٤×٢١)
ناوەرۆك:
فەسڵی شەشەم: ئەحوالی كورد تا ئیمرۆ/ ١- كورد تا دەوری نادر شاە/ ٢- كورد تا ئەواستی عەسری سیازدەمینی هیجری/ ٣- كورد لە ئەواخری عەسری هەژدەمین و عەسری نۆزدەمینی میلادیدا/ ٤- كورد لە عەسری بیستەمینا/ فەسڵی حەوتەم: ١- شكڵ و تەبیاتی و ژیانی كۆمەڵیی كورد/ ٢- موعتەقەدات و دیانەت/ ٣- زمان (لسان)/ ٤- جەمعیات، مەجموعە و جەرائدی كوردی/ فەسڵی هەشتەم: عەشائری كورد/ ١- لە ئەوائلی ئیسلامێتیدا/ ٢- لە دەوری حكومەتی كولەمنی میسردا (عەسری هەشتەم)/ ٣- لە پێش شەڕی گەورەدا (١٩١٤- ١٩١٨م)/ خشتەیەك بۆ عەشایەرە كوردەكان/ ناوی ئەو كتێبانەی كە بۆ نووسینی ئەم ئەسەرە (كتێب) ئیستفادەم لێكردووە (سەرچاوەكان)/ خولاسەی ژیانی خاوەنی (خیوی) ئەم كتێبە.

دو تەقەلای بێ سوود
نووسەر: محەممەد ئەمین زەكی
ئەم كتێبەی لە ساڵی ١٩٣٥دا نووسیوە كە ڕێی بڵاوكردنەوەی پێ نەدراوە و دەستی بەسەردا گیراوە... دواتر (سەباحی غالب) لە ناو كەرەستەكانی (ئەدمۆندز)دا دۆزییەوە و لە ساڵی ١٩٨٤دا، بە لێكۆڵینەوەیەكەوە لە چاپی دا... (لە بابەتەكەی تردا دانراوە)

خلاصەیەكی تاریخی كورد و كوردستان- جلدی دوەم
نووسەر: محەممەد ئەمین زەكی
چاپ: یەكەم، چ: العربیە، ش: بەغدا، ژس: ؟، س: ١٩٣٧، ل:٤٣١، ق: (١٤×٢١)
ناوەرۆك:
مدخل: حكووماتی ئەو ئەقوامی قەدیمییە كە لەگەڵ ئەسڵی كورددا موتەناسبی هەیە/ حكوومەتی سالارییە/ حكوومەتی دۆستەكی مەروانی/ حكوومەتی بەرزیكانی (حسنویە)/ حكوومەتی ئەییوبیە/ حكوومەتی زەند/ حكوومەتی ئەتابەكی لوری گەورە (فەزڵەوی)/ حكوومەتی ئەتابەكی لوری بچووك/ حكوومەتی بەنی ئەردەڵان/ حكوومەت و ئەمارەتی براخوی/ حكوومەتی شەددادییە/ حكوومەتی مەلیك كورد/ ئیماراتی كورد/ ئیمارەتەكانی بەینی جزیرە و دەرسیم/ ئیمارەتەكانی بەینی جزیرە و كاس/ ئیمارەتەكانی بەینی جزیرە و خوی/ كۆمەڵی جنووبی هەكاری (بادینان، داسنی، سۆران، بابان)/ ئەمارەتی بانە/ ئەمارەتی گەڵباخی/ ئەمارەتی كەڵهور/ ئەمارەتی زەنگنە/ ئەمارەتی شوانكارە/ ئەماراتی خوراسان/ ناوی هەندێ لە سەرچاوەكان/ ناوەرۆكی بەرگی یەكەم و دووەم.

تاریخ سلیمانی ۆ وڵاتی- لە دوری زور قدیمەوە تا اولی احتلال (١٩١٨م)
نووسەر: محەممەد ئەمین زەكی
چاپ: یەكەم، چ: النجاح، ش: بەغدا، ژس: ؟، س: ١٩٣٩، ل:٢٩٤، ق: (١٦×٢١)
ناوەرۆك:
ئەوەی لەم كتێبەدا نووسراوە (ناوەرۆك)/ سكاڵایەك/ لە زەمانی قەدیمەوە تا دەوری ئیسلام/ باسێكی تاریخی قەدیمی وڵاتی سلێمانی- قەومی لولو- مەدینەتی- زمانی- جوگرافیای/ ئاسار و مەواقعی قەدیمەی/ لە ئیبتیدای دەوری ئیسلامەوە

١- ئەم بەرگە لە لاپەرە ١٩٥ـەوە دەست پێدەكات تاكو ٣٩٤، هەروەها پاشكۆكەشی بە تیپ (أ، ب، ج...) ئەژمار كراوە.

تا دەوری بابان/ باسێکی کورتی دەوری خولەفا و ئەمەوی و عەباسی- دەوری بوەیهی- حکوومەتی حەسنەوی و بەنو عەناز و حکوومەتی ئەردەڵانی- وە موناسەبەتی پەیاکردنی لەگەڵ حکوومەتی عوسمانی و حادساتی/ دەوری حکوومەتی بەبە: خانەدانی ئەوەل تا پێنجەم/ میر بوداق بەبە- میر بوداق/ دووەم خانەدانی: پیر نەزەر- سێیەم و چوارەم خانەدان: میر سلێمان و میر ئیبراهیم/ حاجی شێخ میر حسین و بوداق بەگ/ حاجی شێخی دووەم/ خزر بەگ و عافەتی خانەدانی چوارەم/ خانەدانی پێنجەم- بەبەی وڵاتی سلێمانی/ عنوانی (بەبە) لە کووە هاتووە؟/ مەنشەئی ئەم بنەماڵە/ فەقە ئەحمەد چۆن هاتە ناوەوە؟/ ریوایات و مەناقبی/ حیکایەتی کەیغان/ خولاسەی تاریخی سلێمان بەبە و یا میر سلێمان شەری لەگەڵ حکوومەتی ئەردەڵان و ئێران و حکوومەتی عوسمانی/ چوونە ئەستەمبوڵی/ بەکر بەگ (بەکرە سوور)/ تەیموور خان بەگ/ هاتنی عەشیرەتی جاف لە ئێرانەوە/ وەزعییەتی عموومی کوردستانی جنووبی/ شەری بەکر بەگ لەگەڵ والیی بەغداد/ کوژرانی/ فاسیلەی ئەمارەت/ غەلبە سەندنی عەشیرەتی زەنگنە/ خانە پاشا: دوورخستنەوەی زەنگنە/ سەفرەی خانە پاشا بۆ ئێران لەگەڵ لەشکری بەغداد/ حاکمیەتی ئەردەڵانی/ سەفەری (هەمەدان)ی/ شەری لەگەڵ لەشکری ئێران/ ئەسیرکردنی شازادە لەتیف میرزا/ شەری (ئینجەدان)/ رێکەوتنی خانە پاشا لەگەڵ لەشکری ئەفغان و شکانی لەشکری عوسمانی/ رێکەوتنەوەی لەگەڵ حکوومەتی عوسمانی/ سەفەری بۆ تەرەفی (تەبریز) و (تاغستان)/ لەناوچوونی/ خالید پاشا: هاتنی نادر شاه بۆ وڵاتی سلێمانی/ شەری سەلیم بەگ لەگەڵ لەشکری ئێران/ رێکەوتنی سەلیم بەگ لەگەڵ نارد شاه/ زەوتکردنی وڵاتی بەبە/ سەلیم پاشا/ سلێمان پاشا/ دەفعەی دووەم سلێمان پاشا/ محەممەد پاشا/ دەفعەی دووەم: ئەحمەد پاشا/ دەفعەی دووەم: محەممەد پاشا/ دەفعەی سێیەم: ئەحمەد پاشا/ مەحموود پاشا/ ئیبراهیم پاشا/ عوسمان پاشا/ دەفعەی دووەم: ئیبراهیم پاشا/ عەبدولرەحمان پاشا/ دەفعەی سێیەم: ئیبراهیم پاشا/ دەفعەی دووەم: عەبدولرەحمان پاشا/ خالید پاشا/ دەفعەی سێیەم: عەبدولرەحمان پاشا/ سلێمان پاشا/ دەفعەی چوارەم: عەبدولرەحمان پاشا/ دەفعەی دووەم: خالید پاشا/ دەفعەی پێنجەم: عەبدولرەحمان پاشا/ دەفعەی سێیەم: خالید پاشا/ دەفعەی شەشەم: عەبدولرەحمان پاشا/ مەحموود پاشا/ عەبدوڵلا پاشا/ دەفعەی دووەم: مەحموود پاشا/ دەفعەی دووەم: عەبدوڵلا پاشا/ سێیەم جار: مەحموود پاشا/ سلێمان پاشا/ ئەحمەد پاشا/ موتالەعەیەکی کورت دەرحەق بە ئیمارەتی بەبە/ ئەحوالی جوغرافیە/ دوای دەوری بابان تا زەمانی ئیحتیلال/ عەشایەری وڵاتی سلێمانی/ مەشاهیری وڵاتی سلێمانی/ مورشیدینی بەناوبانگی ئەم تەریەقەتە لە وڵاتی سلێمانی دا/ شێخ مەعرووفی نۆدەهی/ کاك ئەحمەدی شێخ/ مورشید و خولەفای تەریقەتی نەقشی/ مەولانا خالید/ شێخ عوسمانی تەوێڵە/ شێخ محەممەد/ شێخ عومەر/ حاجی شێخ ئەمین خاڵ/ شێخ محەممەد (مەحوی)/ عولەما و شوعەرای ساحەب ئەسەر و ریجالی مەشهووری/ سەید ئەبوبەکر (مصنف)/ ئەبو عودەی/ مەلا ئەحمەد گۆرانی/ ئەحمەد فائیز ئەفەندی/ سەید ئەحمەد (نەقیب)/ شێخ ئەحمەد/ حاجی مەلا ئەحمەد/ ئەحمەد پاشا/ ئەحمەد حەمدی بەگ/ ئەحمەد موختار بەگ/ مەولانا ئەلیاس/ ئەمین فەیزی بەگ/ سەید جامی/ شێخ حەسەن/ حەسەن کەنوش/ شێخ حسین (قازی)/ خەستە/ مەلا خزر (نالی)/ خەلیل خالید پاشا/ رەسوول زەکی/ رەسوول مەستی/ زەهاوی/ محەممەد فەیزی ئەفەندی/ رەشید پاشا/ سەعید پاشا/ سلێمان یەمەنی ئەفەندی/ شارەزووری/ ئەبولقاسم ئەحمەد/ ئەبوبەکر محەممەد/ مورتەزا عەبدوڵلا/ محەممەد کەمالەددین/ ئەبو حامید محەممەد/ مەلا ساڵح (حەریق)/ ساڵح ئەفەندی (ئاهی)/ عارف سائب/ مەلا عەبدولرەحمان پێنجوێنی/ شێخ عەبدولرەحمان/ عەبدولرەحمان بەگ (ساڵم)/ شێخ عەبدولرەحمان/ مەلا عەبدولرەحیم (مەولەوی)/ شێخ عەبدولسەمیع/ عەبدوڵلا موسیب پاشا/ مەلا عەبدوڵلا بێتووشی/ مەلا عەبدوڵلا رەش/ مەلا عەبدوڵلا عیرفان/ شێخ عەبدولکەریم (بەرزنجی)/ شێخ عەبدولقادر (سنەیی)/ عەبدوڵلا حەسەن/ عوسمان پاشا/ عیزەت بەگ/ عەزیز بەگ بابان/ شێخ عەلی/ شێخ عومەر (شارەزووری)/ شێخ عومەر (قەرەداغی)/ شێخ مەلا عومەر/ شێخ محەممەد/ محەممەد حەمدی پاشا بابان/ شێخ محەممەد موزەفەر/ محەممەد رەئفەت ئەفەندی/ محەممەد ئیبن رەسوول/ شێخ محەممەد/ مەلا محەممەد خاکی/ مەلا محەممەد ئیبن ئەلحاج/ محەممەد رەشید پاشا بابان/ محەممەد پاشا جاف/ محەممەد ئاغا (دەربەند فەقەرە)/ شێخ محەممەد/ مەحموود بەگی ساحێبقران/ شێخ مەحموود/ مەحموود پاشا جاف/ شێخ محێدین/ شێخ مستەفا/ مستەفا بەگ (کوردی)/ حاجی مستەفا پاشا/ مستەفا زهنی پاشا/ مەلا مستەفا/ مەقسوود ئەفەندی/ وەلی دێوانە/ یەعقووب بەگ/ شێخ یوسف/ یوسف زیا ئەفەندی/ ئەو کتێبانەی کە بۆ نووسینی ئەم ئەسەرە ئیستیفادەی لێ کراوە ئەمانەن (سەرچاوەکان)/ جەدوەلی خەتەئ و سەواب (وشەی هەڵە و راست).

خولاصەیەکی تاریخی کورد و کوردستان- بەرگی یەکەم و دووەم
نووسەر: محەممەد ئەمین زەکی بەگ
لە بڵاوکراوەکانی دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم
چاپ: ؟، چ: سەردەم، ش: سلێمانی، ژس: ٣٦٠، س: ٢٠٠٠، ل:٢٧٠، ق: (١٦×٢٢)
ناوەرۆك:
وتەیەکی پێویست بۆ ئەم چاپە نوێیە: دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم/ هەمان ناوەرۆکی چاپی یەکەمی هەردوو بەرگی یەکەم

و دووەمی هەیە، بڕوانە هەردوو کتێبی ژمارە ٢ و ٣.

خولاصەیەکی تأریخی کورد و کوردستان- بەرگی یەکەم و دووەم
نووسەر: محەممەد ئەمین زەکی بەگ
لەبلاوکراوەکانی دەزگای کتێبفرۆشی سۆران- هەولێر
چاپ: ؟، چ: شڤان، ش: سلێمانی، ژس: ٣٦٠، س: ٢٠٠٠ (بەهەمان -ژمارە سپاردنی ساڵی ٢٠٠٠- لە ٢٠٠٤دا چاپ کراوەتەوە)، ل:٢٧٨، ق: (١٦×٢٢)
ناوەرۆك:
وتەیەکی پێویست بۆ ئەم چاپە نوێیە: دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم/ هەمان ناوەرۆکی چاپی یەکەمی هەردوو بەرگی یەکەم و دووەمی هەیە، بڕوانە هەردوو کتێبی ژمارە ٢ و ٣.

سەرجەمی بەرهەمی محەممەد ئەمین زەکی بەگ- یەکەم بەرگ٢
نووسەر: محەممەد ئەمین زەکی بەگ
ئامادەکردنی: سدیق ساڵح
لە بلاوکراوەکانی بنکەی ژین
چاپ: یەکەم، چ: شڤان، ش: سلێمانی، ژس: ١٤٦، س: ٢٠٠٥، ل:٢٥٥، ق: (١٦×٢٢)
ناوەرۆك:
پێڕست/ پێشەکی: سدیق ساڵح/ موحاسەبەی نیابەت/ دوو تەقەلای بێ سوود/ خولاسەی دوو تەقریری مەبعووسی سلێمانی ئەمین زەکی بەگ/ بەیاناتی ئەمین زەکی بەگ مەبعووسی سلێمانی لە مەجلیسی مەبعووسان/ کوردی بەناوبانگ/ سوڵتان سەلاحەددینی ئەییوبی/ میر محەممەد پاشا/ ئەمیرخانی برادۆست و دمدم قەلا/ ئەحمەدی زووحاك- قارەمانێکی نەناسراوی کورد/ مەلیکول عادیل سەیفوددین ئەبوبەکر محەممەد/ باباتاهیر/ مەلیك ئەفزەل/ ئەبول فیدائی/ مەولانا ئیدریس بدلیسی/ ئەمیر ئەرسەلان خان/ عیمادوددین ئیسماعیل/ سوڵتان ئیسحاق/ مەلیك ساڵح نەجمووددین ئەییووب/ ئیسماعیل پاشا/ ئیسماعیل تەیموور پاشا/ ئیسماعیل حەقی بابان/ مەلیك ئەشرەف/ ئیسماعیل ئەلکوردی/ مەلیکول موعیز ئیسماعیل/ ئەفراسیاب بەگ/ ئالغ بەگ/ ئولغ بەگ/ ئەلقاس بەگ/ ئیمام قولی بەگ/ ئیمام قولی سوڵتان/ ئەمانوڵلاخان/ ئەمانوڵلاخان/ ئەمیرخانی برادۆست/ ئەمیرخان بەگ/ ئەمیرخانی موکری/ ئەمیر قولی سوڵتان/ ئەمیرەبەك/ ئەمیرە پاشا/ ئەمین فەیزی بەگ/ ئیبراهیم ئەفەندی/ شێخ ئیبراهیم ئەلکوردی/ ئیبراهیم ئەفەندی/ ئیبراهیم سالار/ ئەمیر ئیبراهیم خان/ ئەبول هیجا/ سەیفوددین ئەبوبەکر محەممەد/ ئەبوبەکر مەلا جامی/ ئەبوبەکری گۆرانی/ ئیبن دینار/ ئەبو سەعید/ ئەبو سوعوود ئەفەندی/ مەلا ساڵح حەریق/ ساڵح ئەفەندی ئاهی/ تاهیر بەگ/ عارف سائیب/ مەلا عەبدولرەحمانی پێنجوێنی/ شێخ عەبدولرەحمان/ ئیبنول حاجیب/ ئەبو حەسەن عەلی سەیفوددین/ ئەبو عیسا محەممەد زیائەددین/ میر ئەبوبەکر/ ئیبنوخەلەکانی هەولێری/ ئەبوفەزڵ محەممەد ئەفەندی/ ئیبنول موستەوفی ئەلئەربیلی/ توورانشا/ ئیبن فەخر ئەربیلی/ ئەبو فەتح نەسر/ ئەبو فەتح محەممەد/ ئەبو فەتح/ ئەحمەد تەیموور پاشا/ ئەحمەد ئەلمەشتووب/ ئەحمەد بەگ/ قازی ئەحمەدی ئەفەندی تەهازادە/ ئەتابەگ ئەحمەدیل/ ئاق سونگور ئەحمەدیلی/ ئەحمەد نوسرەتوددین/ مەلیك ئەوحەد/ ئولوخان بەگ/ ئوغوز خان/ ئوغوز بەگ/ ئوغوز بەگ/ ئەلپارغۆن/ ئەڵلاوێردی بەگ/ ئۆغلان بوداغ/ ئەولیا بەگ/ ئووەیس بەگ/ سەلاحەددین و ئەهلی خاچ/ بۆ پیرەمێردی خۆشەویست/ تاریخ و ئەشخاس/ تاریخ و ئەشخاس/ تاریخ و ئەشخاس/ زمانی کوردی/ زمانی کوردی و ئەدەبی/ زمانی کوردی بۆچی گۆڕاوە- چۆن یەك ئەگرێ؟/ ئەم لەهجانەی کوردی چۆن ئەبێتە یەك لەهجە؟/ زمانی کوردی/ قسە و زمانی کوردی/ ئەو کاغەزەی کە لە ئەستامووڵەوە هاتووە/ کاغەزی ئەمین زەکی بەگ مەبعووسی سلێمانی/ جوابی پرسیاری (قانع)/ نەورۆز/ لە ئەمین زەکی بەگەوە سەلام بۆ (سەلام)/ نامەکەی مامۆستای گەورە ئەمین زەکی بەگ/ ئامۆژگارییەکی دڵسۆزانە/ ئامۆژگاریمە بۆ (نزار)/ دوانامەی ئەمین زەکی بەگ بۆ (پیرەمێرد)/ پاشکۆ: یادی کۆچی ئەمین زەکی/ ئیندێکسی ناو. لە چاپدراوەکانی بنکەی ژین.

سەرجەمی بەرهەمی محەمەد ئەمین زەکی بەگ- سێیەم بەرگ- تاریخی سلێمانی وە ولاتی
نووسینی: محەممەد ئەمین زەکی بەگ
ئامادەکردنی: ڕەفیق ساڵح
لە بلاوکراوەکانی بنکەی ژین
چاپ: دووەم، چ: شڤان، ش: سلێمانی، ژس: ٩٠٧، س: ٢٠٠٥، ل:٢٦٥، ق: (١٦×٢٣)
ناوەرۆك:
هەمان ناوەرۆکی چاپی یەکەمی هەیە، بڕوانە کتێبی ژمارە ٦.

خولاصەیەکی تاریخی کورد و کوردستان لە زۆر قەدیمەوە تا ئیمرۆ- سەرجەمی بەرهەمی محەممەد ئەمین زەکی بەگ- چوارەم بەرگ
نووسەر: محەممەد ئەمین زەکی
ئامادەکردنی: ڕەفیق ساڵح
لە بلاوکراوەکانی بنکەی ژین
چاپ: دووەم، چ: و- پەروەردە، ش: هەولێر، ژس: ٢٤٩، س: ٢٠٠٦، ل:٣٠+٢٩١+٣٠+٣٠٢، ق: (١٧×٢٣)
ناوەرۆك:

٢- بەرگی دووەمی ئەم بەرهەمە بە زمانی عەرەبییە، لەبەرئەمە لێرەدا دانەنراوە و لەگەڵ کتێبە عەرەبییەکانی دانراوە...

پێشەکی... دکتۆر کەمال مەزهەر ئەحمەد/ ڕاستکردنەوەی چەند هەڵەیەکی مێژوویی لەلایەن لیژنەی مێژووی کۆڕی زانیاری عیراق- دەستەی کوردەوە: محەممەد مەلا جەمیل ڕۆژبەیانی.
خولاسەیەکی تاریخی کورد و کوردستان جلدی ئەووەڵ- لە مەبدەئی تاریخەوە تا ئیمرۆ... لێرەوە هەمان ناوەرۆکی چاپی یەکەمیان هەیە، بڕوانە هەردوو کتێبی ژمارە ٢ و ٣. پێڕستی ئەم بەشە. خولاسەیەکی تاریخی کورد و کوردستان بەرگی چوارەم- بەشی دووەم/ چەند سەرنجێکی ڕەخنەگرانە لە کتێبی (خولاصەیەکی تاریخی کورد و کوردستان)ی خوالێخۆشبوو محەممەد ئەمین زەکی بەگ: د. کەمال فوئاد/ لێرە بەدواوە هەمان ناوەرۆکی چاپی یەکەمی هەیە، بڕوانە کتێبی ژمارە ٤/ پێڕستی ئەم بەشە.

خولاصەیەکی تاریخی کورد و کوردستان- جلد ١
نووسەر: محەممەد ئەمین زەکی بەگ
چاپ: ؟، چ: ؟، ش: ؟، ژس: ؟، س: ؟، ل:٣٩٨، ق: (١٦×٢٢)
ناوەرۆك:
هەمان ناوەرۆکی چاپەکانی تری هەیە، بڕوانە کتێبەکانی ژمارە ٢ و ٣ و ٤.

کورد و کوردستان جلد ١-٢-٣
نووسەر: محەممەد ئەمین زەکی
لە بڵاوکراوەکانی ئینتیشاراتی سەیدیان مهاباد
چاپ: ؟، چ: ؟، ش: ئێران، ژس: ؟، س: ؟، ل: ٣٦٨+٤٣١، ق: (١٧×٢٤)
ناوەرۆك:
هەمان لاپەڕەی چاپی یەکەمی هەر سێ بەرگەکەیە، بێ هیچ دەستکارییەك... بڕوانە هەر سێ کتێبی ژمارە ٢ و ٣ و ٤.

کتێبە عەرەبییەکان

تقرير محمد أمين زكي نائب السليمانيه بشأن العراقي
چاپ: یەکەم، چ: مطبعة الحكومه، ش: بغداد، س: ١٩٢٩، ل: ٣٤.

خلاصه تأريخ الكرد وكردستان- من أقدم العصور التأريخيه حتى الآن
نووسەر: محەممەد ئەمین زەکی بەگ
وەرگێڕانی لە زمانی کوردییەوە بۆ سەر زمانی عەرەبی: محەممەد عەلی عەونی
چاپ: یەکەم، چ: السعاده، ش: مصر، س: ١٩٣٩، ل: ٤٧٢.

مشاهير الكرد و كردستان- الجزو الأول
نووسینی لە گۆڤاری گەلاوێژدا بە زمانی کوردی: محەممەد ئەمین زەکی بەگ
کۆکردنەوە و وەرگێڕانی بۆ سەر زمانی عەرەبی: سانیحە محەممەد ئەمین زەکی بەگ
چاپی یەکەم، چ التفیض الأهلية، ش: بەغداد، س: ١٩٤٥، ل: ٢٩٠.

مشاهير الكرد و كردستان- الجزء الثاني
نووسینی لە گۆڤاری گەلاوێژدا بە زمانی کوردی: محەممەد ئەمین زەکی بەگ
کۆکردنەوە و وەرگێڕانی بۆ سەر زمانی عەرەبی بە دەستکاری (محەممەد عەلی عەونی)ییەوە: سانیحە محەممەد ئەمین زەکی بەگ
چاپ: یەکەم، چ: السعاده، ش: قاهیرە- مصر، ژس: ؟، س: ١٩٤٧، ل: ٢٥٠.

تأريخ السليمانيه و أنحائها
نووسەر: محەممەد ئەمین زەکی بەگ
وەرگێڕانی لە زمانی کوردییەوە بۆ سەر زمانی عەرەبی: محەممەد جەمیل ڕۆژبەیانی
چاپی یەکەم، چ: النشر و الطباعة العراقيه المحدوده، ش: بەغدا، ١٩٥١، ل: ٣١٦.

خلاصه تأريخ الكرد وكردستان- من أقدم العصور التأريخيه حتى الآن
نووسەر: محەممەد ئەمین زەکی بەگ
وەرگێڕانی لە زمانی کوردییەوە بۆ سەر زمانی عەرەبی: محەممەد عەلی عەونی
چاپ: دووەم، چ: سەلاحەددین، ش: بەغداد، ژس: ؟، س: ١٩٦١، ل: ٥١٨، ق: (١٧×٢٤)

خلاصه تأريخ الكُرد وكُردستان، من أقدم العصور التأريخيه وحتى الآن
نووسەر: محەممەد ئەمین زەکی بەگ
وەرگێڕانی لە زمانی کوردییەوە بۆ سەر زمانی عەرەبی: محەممەد عەلی عەونی
چاپ: سێیەم، چ: ؟، ش: لەندەن، ژس: ؟، س: ١٩٨٢...

خلاصه تأريخ الكُرد وكُردستان، من أقدم العصور التأريخيه وحتى الآن
نووسەر: محەممەد ئەمین زەکی بەگ
وەرگێڕانی لە زمانی کوردییەوە بۆ سەر زمانی عەرەبی: محەممەد

عەلی عەونی
چاپ: چوارەم، چ: ؟، ش: بەیرووت، ژس: ؟، س: ١٩٨٥...

خلاصه تأريخ الكرد وكردستان- من أقدم العصور التأريخيه حتى الآن
نووسەر: محەممەد ئەمین زەکی بەگ
وەرگێڕانی لە زمانی کوردییەوە بۆ زمانی عەرەبی: محەممەد عەلی عەونی
چاپ: پێنجەم، چ: ؟، ش: ؟، ژس: ؟، س: ١٩٨٦...

تأريخ السليمانيه و أنحائها
نووسەر: محەمەد ئەمین زەکی بەگ
وەرگێڕانی لە زمانی کوردییەوە بۆ سەر زمانی عەرەبی: محەمەد جەمیل ڕۆژبەیانی
لەبڵاوکراوەکانی بەڕێوەبەرێتی گشتیی چاپ و بڵاوکردنەوە- سلێمانی
چاپ: دووەم، چ: وەزارەتی ڕۆشنبیری، ش: سلێمانی، ژس: ١٩٧، س: ٢٠٠٢، ل: ٣٣٨، ق: (١٦×٢٢)

الآثار الكامله للمؤرخ الكردى محمدأمين زكى (مشاهير الكرد وكردستان)، الجزء الثاني
نووسەر: محەممەد ئەمین زەکی بەگ
ئامادەکردنی: ڕەفیق سالح
لە بڵاوکراوەکانی بنکەی ژین
چاپ: دووەم، چ: شڤان، ش: سلێمانی، ژس: ٢٧٧، س: ٢٠٠٥، ل: ٤٩٥، ق: (١٧×٢٤)

الآثار الكامله للمؤرخ الكردى محمدأمين زكى (مشاهير الكرد و كردستان)، الجزء الثاني
نووسەر: محەممەد ئەمین زەکی بەگ
ئامادەکردنی: ڕەفیق سالح
لەبڵاوکراوەکانی بنکەی ژین و دار الثقافة والنشر الكرديه
چاپ: سێیەم، چ: الوقف الحديثة، ش: بغداد، ژس: ٩٧١، س: ٢٠١١، ل: ٤٥٩، ق: (١٧×٢٥)

کتێبە تورکییەکان
عثمانلى اردوسى، بغداد، ١٣٢٤ ھ.
عثمانلى اسفارى حقندە تدقيقات، استانبول، ١٣٣٦ ھ.
عراق نصل غائب ايتد، استانبول، ١٣٣٦ ھ.
عراق سفرى خطالرمزى، استانبول، ١٣٣٦ ھ.
حرب عموميده عثمانلى جبهه لرى وقايعى، استانبول، ١٣٣٧ ھ.
سلمان پاك ميدان محاربەسى و ذيلى، استانبول، ١٣٣٩ ھ.
بغداد وصوك حادثه ضياعي، استانبول، ١٣٣٩ ھ.
عراق تاريخ حرب مختصرى، استانبول، ١٣٣٩ ھ.
كوت الاماره هجوم و محاصرەسى، (دوو بەرگی دەستنووسە لە ئەرشیڤی عەسکەریی بریتانیا پارێزراوە).
حيات خاطراتى (سێ دەفتەری دەستنووسە، یەکەمیان کراوە بە عەرەبی).

سەرچاوەکان:
بیبلیۆگرافیای ناسێنراو و پۆلێنکراوی کتێبی کوردیی تایبەت بە کورد و کوردستان (یەکەم بەرگی چاپکراو «سەردەم- سلێمانی- ٢٠١٢» و نۆ بەرگی تری دەستنووس...)، ئامادەکردنی: بوار نورەدین.
ئەلبوومی محەمەدئەمین زەکی بەگ، ئامادەکردنی: سدیق ساڵح، لە بڵاوکراوەکانی بنکەی ژین، چاپی یەکەم، چاپخانەی (کەکۆن)، سلێمانی، ٢٠١٢.
ما أُلف عن تأريخ الكُرد وكُردستان باللغه العربيه والمعرّبه حتى عام ٢٠٠٧م، ئامادەکردنی: د. حوسامەددین عەلی غالب نەقشبەندی، لە بڵاوکراوەکانی بنکەی ژین، چاپی یەکەم، چاپخانەی (شڤان)، سلێمانی، ٢٠١١.

ئەمین زەکی

ئەو لە پێشدا گوێی لە بەرد گرت
گوێی لە داربەندو سەوڵ و
گوێی لە ڕەگ گرت .. تا بزانێ
کە ئەم کوردە بنەچەکەی لە کوێوە
ئەچێتەوە سەر کام شاخ و داخی باوک و
کام ڕەزی دایک ؟
ئەو لە پێشدا گەڕایەوە بۆ پێشی مێژوو
"لولو"ی لە ئەشکەوتدا ناسی
"گوتو"ی لە ڕاوی نێچیری
دوای داستاندا ناسی .
"کاردوخ"ی کرد بە باپیرە هەرە گەورەو
ئەشکەوتەکەی "شانەدەر"یشی
بە ڕەحمی دایک !

ئەمین زەکی
وتی "شەرەفخان" چرای ماڵی مامۆستامانە
"شەرەفنامە" خوێندنگامانەو
کورد سەرچاوەی پێدەبینێو
دڵی کوردستان ڕانگاوە ! .

سەدەی بیستەمینی هاتبوو
لەگەڵ خۆیدا مەشخەڵی عەقڵی زۆر تازەی هەڵکردبوو .
ئەو ئەیزانی وەختێ کە هوشیاری نەبێ
خەونەکانی سبەی ڕۆژیش نایەنە دی !
ئەو ئەیزانی مێژوو هەوێنە
تا ئەو هەوێنەیشی پێدا نەبێ
نە چرای خۆی داگیرسێ و نە مرۆڤیش ڕا ئەچڵەکێ !
ئەو ئەیزانی ئەو وەختەی مێژوو ئەنووسێ .. عەقڵ ئەنووسێ
لەو عەقڵەوە پێناسەی "کورد و کوردستان"
ئەداتە دەستی هەموو جیهان .

ئەمین زەکی
تێپەی نووسی . خاکی نووسی . خۆرەتاو و ئاوی نووسی .
بنەچەی ئەم قەومە کۆنەی
لە قووڵایی ئەشکەوتەوە
هێنایەوە بەر ڕووناکی !

شێرکۆ بێکەس
2013/1/24

# شینەکەی بێکەس

بەشی کورد ئەبێ دەرد و خەفەت بێ
ڕۆژێ بە تیرێ جەرگی لەت لەت بێ
ئاسمانی بەختی لێڵو تاریك بێ
ئەستێرەی کز و ڕوو لە مەینەت بێ
***

قەد نەبوو ڕۆژێ گەردوشی دەوران
چەرخی هەڵسووڕێ بە کەیفی کوردان
ناشکوری نەبێ خۆشی لە ئێمە
دوورە بە غەیری شیوەن و گریان
***

بەڵێ زەمانەی چەرخی کەچ ڕەفتار
وا لێمان بۆتە دوژمنی خوێن خوار
دایم خەریکە و بۆ هەل ئەگەڕێ
زیانێ بدا لە کوردی هەژار
***

ورد سەرنج ئەدا کێ بە قیمەتە
کێ نەختێ خاوەن هەوڵ و هیممەتە
گورج ئەی ڕفێنێ و لەناوی ئەبا
سەیری کە چەندە چەوت و نەگبەتە
***

جەنابی ئەمین زەکی بەگ کە وا
پیاوێ بوو بۆ کورد گەورە و پێشەوا
داخی بە جەرگم زوو لە دەسمان چوو
نازانم بڵێم چی لە حەق ئەوا؟!
***

پیاوێ بوو هەتا بڵێن منەوەر
خاوەنی عیلم و ئەخلاق و هونەر
عومری خۆی دانا لە ڕێی خزمەتا
پێویستە قەدری بگرینە سەر سەر
***

پیاوێك بوو بۆ کورد تاریخی نووسی
لای نەدا لەڕێ موقع و کورسی
زۆر فیداکار و میللەت پەرست بوو
هەواڵی قەومی بە دڵ ئەپرسی
***

پیاوێکی زانا و هێمن و بە بیر
ڕەوشتی بەرز و بەڕاو تەدبیر
ئاواتە خوازی بەرزی وەتەن بوو
پشتیوانێ بوو بۆ لات و فەقیر
***

پیاوێ بوو ئەمما زۆر تەواو پیاو بوو
خاوەن کردار و موقع و ناو بوو
پیاوی وا نامرێ دیارە ئەمێنێ
لەناو عالەما بەرز و ناسراو بوو
***

ئەی خاك دەخیلتم قەدری بزانە
ئازاری نەدەی لەلات میوانە
تەئریخی کۆچی ئەمین زەکی بەگ
"میللەت مەحزونە زۆر پەرێشانە"

# سۆزی مامۆستا پیرەمێرد بۆ خوا لێ خۆش بوو

داخێ که فەلەك نای بە جەرگما * کزم لە کزەی سەرە مەرگما
بەخت و بەرگم ڕەش چاو سپی بەشین* فرمێسك سورو سویر؛ بۆ حمەدامین
اۆف لایی پیری لایی نەخۆشی* لایی پەرۆشی خەوش و سەرخۆشی
لایی ماتەمی و ماتی و بێهۆشی* بۆ پیرێکی گەنج کە خاك دای پۆشی
گوڵ لێم بوو بەخار، کوڵشەن پڕ جەخار
هوزاری هەژار زار و نالەبار
ئەلاوێننەوە لاوان دڵ غەمبار* خوا ئاهی پیریم بۆ بخاتە کار
باوەڕم هەیە کە وا گیانی پاك* نامرێ ئەچێتە هەوارگەی ئەفلاك
هەر وەك گەلاوێژ بە جریوە و ڕوناك
پرشنگ ئەداتە ڕوی مەڵبەندی خاك
ها ئەوە گیانی حمەد امینە* نگهبانە بۆ ئەم سەرزەمینە
چونکە باوەڕی بە خواو ئایینە* جێ ی خاڵی تابێ لە خۆی ئەمینە

# سۆزی مامۆستا بێخود

له یارانی وەفاداران ئەدیبێکی زەکی مابو
ئەویش پشتی له دنیا کردو ڕووی بو ملکی عقبی بو
امینی عاصمەی رأفت زکی بەگ خادمی میلەت
دبیری مکتبی غیرەت وزیری شاری بەغدا بو
که هات بۆ زیارەتی خاکی وطن یەعنی سلێمانی
دریغا زوو وەفاتی کردو ڕوحی جنت آرا بو
بلابا ناله هاودەم بێ لەچاو ئەسرین به خوررەم بێ
ضیای ڕوژی فرح کەم بێ شەوی غەم ظلمەت افزا بو
خرەد تاریخی کۆچی ئەو زەعیمەی وا به بێخود وت
که بەدرو برجی عرفانو معالی ایمشەو آوا بو.

عەبدولڕەحمان بەگی بابان

# شینی کۆچی ئەمین زەکی ئەکا

ئەی جمال الدینی ئەفغان ڕیزەچینی خوانی تو
وەی محمد عەبدە عەبدی بارەگای عرفانی تو
ئەی نظام الدین لە رأیا کەمترین دەربانی تۆ
وەی فریدالدین لە علما تابعی فەرمانی تو
تۆ مسیح نیت و بەلام آثارەکەت معجزنما
کوردی زیندو کردەوە تەئریخی کوردوستانی تو
گیانی پاکت مەیلی خاکی نیشتمانی کرد بو
جێ ی لە دڵیا پێ نیشان دا مقبرەی سەیوانی تو
گەر لەبەر چاو غائبی حاشا نەمردوی نامری
قبلەگاهی قەومی کوردە جێگەی جولانی تو

شەپازلەییکی دیو — دەستی لە پریکا درا بە بنا گویما،
کاسی کردم؛ امین زەکی بەگ مردا!
دەنگی "مردا!" دەنگیکی داچلەکینەرە، لەمە نەفرینتر
دەنگ نیە بو گوی ی پیاو؛
بەلام ئەو پەیامەی ئەم دەنگە دای بە بناگوی ی منا
پەیامی کارەساتیکی قورس بو، پەیامی کارەساتیکی زور
قورسی گشتی.
"امین زکی بەگ مردا!" ئەوەی ئەگەیاند کە تانجەروی
زانستی سەدەی بیستەممان وشك بوو، تانجەروییکی
زانست کە هەموو بستیکی خاکەکەمان بەراوی بوو.
چەند سالی بوو، ئەژدەهایی خوی گیرکردبوو لەم
چەمەدا؛ ئەژدەهای نەخۆشی.
اوی بەخور خوی گەلی جەنگی بەرامبەر بە ئەژدەهاکە؛
دریغا، چاری نەبوو؛ فریدون نەگەییشت بە فریای ئاوو
بەراوا،
ئەوەتا، سەر زەویمان وشك بوو.
امین زکی بەگ لەگەڵ ئەوەدا کە ئەوەندە سال بوو، لە
زورانا بوو لەگەل نەخوشیەکەی، وە روژ بەروژ زەبوونتر
بەدەسیەوە، بەلام گیانی بەهاداری، بوو کاتیك بی، سست
و بی هیوا نەبوو؛
ئەو چەمە بە خورە هەتا ئەوکاتەی کوتوپر وشك بوو،
هەر بە گور بوو، هەر بەفەر بوو.
امین زکی بەگ بە راستی سروشتی هەنگی هەبوو؛ بێ
سرەوتن لەکارا بوو، کاری ریك و پیك و زانستی بوو.
یەك هەنگ نەبوو، کورەیی بوو، کورەییکی بەپیت
و بەرەکەت بوو. نەء هەنگ نەبوو، هەنگ رقی هەل
ئەسی، بە پیاوەوە ئەدا؛ ئەو هەرگیز رقی هەل نەئەسا،
کینی نەبو.
هەنگوینی شیرینی هەنگ ئەخوری و ئەبریتەوە،
کەوسەری ئەو نابریتەوە، کردەوە زانستیەکانی ئەو ایمە
لێرە پشتاوپشت لی بەرخور ئەبین، خویشی لە پاداشتی
ئەمەدا ناوی لە گیتی دا نەمر، وە رەوانی لە بەهەشتدا
کەوسەر نوشە.
سەرچاوەی ئەم تانجەروی زانستیە سلیمانی یە؛ سلیمانی
پییەوە ئەنازی، کورد پییەوە ئەنازی، عراق پییەوە ئەنازی.
ایستا روو ئەکەمە رولەکانی ئەمرو،
ئەی لاوینە،
بیرەوەری پیاوی گەورە و ستایشی کردەوەی بەرز و
بەکەلکیان بە زمانیکی پەسەندکاری یەوە، هەر چەندە
ئەرکیکی سوپاس بژیری یە،
بەلام پتری بو اموژگاری ایوەیە.
ژیانی زانستی ی پیاوی گەورەی نەتەوەییك وینەیە بو
لاوەکانی کە لە اسایی ی بکەنەوە.
ووتم، امین زکی بەگ پرشنکی سلیمانی یە، رولەی
کوردە، وە پیگەیشتووی عراقە؛ بەلام ئەبی بزانن کە
امین زکی بەگ بە سروشتی مەزن، بە رەوشتی پاك،
بە کردەوەی چاك، وە بە تی‌کوشینی بی وچان توانی
پیالەییکی زانستیتان بو تی بکا.
تی کوشینی زانستی ی امین زکی بەگ وینەیە بو
ایوە، کردەوەی زانستی امین زکی بەگ دەستووری
کردارتانە، لەسەری برون. چاك بزانن کە نەتەوی
لاوەکانی، لە تی کوشیندا بو زانست، چاو لە زانا
گەورەکانی نەکا، بەشی بەش براوی یە.

# وتاری مامۆستا شێخ محەمەدی خاڵ

قازی سلێمانی

## مەرگی ئەمین زەگی

ایمرو زمانم لال و قەلەمم کولە، لە هەموو باسیکدا، تەنیا لە باسی مەرگی امین زەکی دا نەبیت، چونکە نووسیین الهامیکە لە نووسەر "کاتب"ەوە بو سەرنووکی قەلەمەکەی، انجا ئەگەر نووسەر کەیف خوش بوو، ئەوا قەلەمەکەی ئەکەویتە سەماو گۆرانی وتن، وە ئەگەر دل تەنگ بوو، ئەوا قەلەمەکەی دەست ئەکا بە شیوەن و گریان و فرمیسک هەل رشتن،

زور خەفەت بارم کە تا دوینی بوو شانازییمان ئەکرد بە امین زەکی و بە گەورە ناومان ئەبرد، وە گوی مان لە قسە بەرزە بەنرخەکانی ئەگرت، کەچی ایمرو شینی بو ئەکەین و بوی ئەلاوینینەوە.

بەلام جیهان هەروا بی وفاو بێ بەقایە، وەك نقشیکە لەسەر ئاو، بەلکو وەك بلقی سەر او، وایە تا هەیە پووچە کە نەما ئەبی بە هیچ، کەوابوو دنیا هیچ و پووچە.

ژیانی جهان وەك پەردەیەکی سینەما وایە کە بە پیش چاودا دیت و ئەررواو تی ئەپەرریت، یا وەك شانووی تمثیل، وە بەسەرهاتەکەی وەك تمثیل وایە، جا ئەم شانووە هەر روژەی جورە تمثیلیکی لەسەر ئەکریت، دەمی سوورو دەمی شین، یا دەمی پی کەنیین و دەمی گریان، ایمەش لەسەر ئەم شانووە دەمی سەیری مەردوم ئەکەین، دەمیکیش خومان هەل ئەسوورریین و مەردوم سەیرمان ئەکات.

ژیان زنجیرەیەکە لە خەم و تەم و خەفەت و دەردی سەری،

بە

دیمەن جیان بەلام بەراستی یەکن.

ژیان چیە؟ روژە لەدوای روژو شەوە لەدوای شەو، بەلکو هەناسەیە لەدوای هەناسە، هەر هەناسەیەك کە مەردوم ئەیدا هەنگاویك نزیکی ئەخاتەوە بە مردن، یا خشتیك لە بناغەی کوشکی عمری دەردینی لەبن، ئەمەتە دنیای بێ وەفا.

ئەم ئەرزە کونە هەوارە خلائفیش کوچە

طماعی سووری نەبی کەس لەژیری چادری شیین

دوگەز زەمین وسە گەز جاو ومستەخولیکە

لە باسی پێ خەف و راحەت هەتا ئەگاتە سەریین

مردن گەورەترین پەندو عبرتە بو ئادەمیزاد. مردن بەچاوێك تەماشای هەموو کەسیك ئەکات، گەورەو بچووك، دەوڵەمەندو هەژار، خویندەوارو نەخویندەوار، گەنج و پیر، جوان و ناشرین، باوك و کور، دایك و کچ، پیاو و ژن، دین دارو بی دین، چاك و خراپی لەلا وەك یەکە، ارستقراطی ئەگەر بە چاویکی وردبوونەوەوە تەماشای مردن بکا ئەبی بە دیمقراطی.

مردو تا گەورەتربی پەندو عبرەتی زورترە، مەردوم ئەگەر بیربکاتەوە لە مردنی ئەسکەندەرو دارا، تەیموری لەنگ و، ناپلیون سامی زیاتر لی ئەنیشی، چونکە گەورەیی ئەمانە - هەر وەك هەژاریکی بی نەوا — لەبەر هەلمەتی مردنا رووخاوە، کەوابوو گەورەیی و دەولەمەندیی و پایەبەرزیی شتیکی هیچ و پووچن لەبەر وەیشومەی مردنا، بە هەناسەیەك ئەرووخین و ئەچنەوە پەردەی نەبوون.

بەلام ئەوی کە هەرگیز نەرووخی، وە بەدریژایی شەوو روژو سال و مانگ هەر بمینی و پایەداربی ناوە.

مەرگ و ژین مثلی سیبەرو تاوە* ئەوی بمینی هەر تەنها ناوە زور دەمیکە ادەمیزاد لیکی داوەتەوەو تیگەیشتووە کە عمری لە جهانا، بەپێ عمری گەلی شتی ترەوە زۆر کەمە، فیلیك سەد سال ئەژی، کیسەلیك دووسەد سال ئەژی، سوورە چناریك هەزار سال ئەژی، کەچی ئادەمیزاد — کە لە هەموویان گەورەترە، وە یاری بەهەموو جیهان ئەکات — چل

پەنجا سال ئەژی، جا لەبەر ئەمە ئادەمیزاد لەزور دەمیکەوە خەریکە بە چاکە و خزمەت کردن ناوی خوی ایجگاری "ئەبدی"وە عومری خوی درێژ بکات، وە لەدوای مردنی هەلگری و بیخاتە سەر ژیانی.
جا لەو رووەوە زور کەس لە گەورە و هەل کەوتووەکانی جیهان، وە لە بلیمەتوو تی گەیشتوانی دەوران، هەریەکە بەرەنگێك ناوی خوی ایجگاری ی کردووە، یەکیك بە دادو عەدالەت، یەکیك بە عیلم و زانیین، یەکیك بە اختراع و شتی بەکەلك دروست کردن، یەکیك بە خیرو چاکەو دەست گرتن، یەکیك بە شیعری جوان و کتیبی بەکەلك نووسین.
کی ئەلی حەزرەتی عمرو صلاح الدینی ایوبی مردووە؟ کێ ئەلی ئیمامی اعظم و ئیمامی شافعی مردووە؟ کێ ئەلی ادیسون و مارکونی مردووە؟ کی ئەلی روکفلری ئەمریکانی مردووە؟. کە لە ژیانی خۆیا (١٤) ملیون پاوەندی لە خیرو چاکەو دەست گرتنی هەژارانا بەخت کردووە، کی ئەلی جەمیل صدقی زەهاوی و امین زەکی مردووە.
امین زەکی ئەستیرەیەکی گەش بوو لە ئاسوی سلیمانی هەلات (٦٨) سال بە ئاسمانی ژیانەوە مایەوە، هەمیشە لە ورشەو پرشە و بریسکەو تریسکەدابوو، وە هەردەمە شوینیکی رووناك کردوتەوە، وە گەلیك بە رووناکی ئەو ریگای دۆزی وەتەوە.
امین زەکی لە گەلی لاوە شایستەیە کە دوورو دریژ لی بدویین، بەلاّم لەبەرئەوەی کە وەخت کەنگە تەنها لە باسی نووسین و تەئریخەکەی ئەدویین.
امین زەکی یەکەمین کەسە لەدوای خاوەنی شرف نامە، کە تاریخی کوردو کوردستانی لە پینج هەزار سال لەمەوپیشەوە نووسی، وە بەدوو جلد لە چاپی دا، وە گەلەکەی خوی ناسی بە هەموو نەتەوەکانی سەر زەوی، و اثباتی قومیت و ملیتی کردن بو هەموو جیهان.
امین زەکی یەکەمین کەسە کە ناوی (١٠٥٧) کەسی کوکردوتەوە لە پیاوی گەورەو بەناوبانگی کورد، وە لە کون و قوژبنی کتیبی بیگانان دەری هیناوون، وە بەدوو جلد تەرجەمەی ژیانی نووسی وون، وە ناوی ناوە (مشاهیر الکرد) و لەچاپی داوە.
امین زەکی یەکەمین کەسە کە تاریخی ولاتی سلیمانی نووسی و لەچاپی دا، وە پیشانی عالەمی دا کە ولاتی سلیمانی لەناو عالەمی علم و ادەبا هەمیشە وەك ئەستیرەی گەلاویژ درەوشاوەتەوە.
امین زەکی یەکەمین کەسە کە بە تالیفەکانی نەك هەر خزمەتی کورد، بەلکو خزمەتی هەموو روژهەلاتی ناوەراستی کردووە.
امین زەکی یەکەمین کەسە کە شهیدی نووسین و تالیف کردن بوو، وە دەست و پەنجەی کول بوو، وە لەو ری یەدا سەری خوی دانا.
امین زەکی یەکەمین کەسە کە خوی وەك موم دائەگیرساند و ئەسوتاند تا گەلەکەی لەبەر رووناکیەکەیا دانیشن و بەهرەمەند بین.
بەلی امین زەکی بە دییمەن شەربەتی مەرگی خواردەوە، وە هەر وەك لەدەم کەلی سلیمانی هەلاتبوو، هەروەها هاتەوە سلیمانی و لە اسوی سلیمانی اوابوو، وە بە ایجگاری خۆی فریدایە باوەشی نیشتمانەوە.
ئەی خاکی پاکی نیشتمان اگاداربی تاقانە رووڵەو جگەر گوشەکەت بکە، ازاری خویوو پەنجەکانی مەدە، چونکە شەهیدی ریگای تویە
بو ملتەکەی هیند تی کوشابوو
قەلەمی دەست و پەنجەی شکا بوو
لەوساوە کە ئەو ئەسپەردەی گلە
فرمیسکم تیکەل بە خوینی دلە
بەلی امین زەکی گیانی پاکی هەل فری و پەروازی کرد لەم جیهانە پەستەوە بو بەهەشتی بەرز، لەم زەوی خاکەوە بو اسمانی پاك، لە دراوسیتی ئادەمیزادەوە بۆ دراوسیتی خواو فریشتە.
امین زەکی جاران ئەگەر لە رەنجابوو ئیستا لە گەنجایە، جاران ئەگەر لە ایش و نیشا بوو ایستا لەنوشایە، جاران ئەگەر لە زیندانی ژیانا بوو ایستا لە کوشکی بەهەشتایە، جاران ئەگەر هەر لەپیش چاو بوو ایستا لەناو دڵ و دەروونایە.
زۆر کەسی وابووە هەزار ئەوەندەی امین زەکی دەوڵەمەندو دەست داربوون، بەلاّم چونکە خزمەتیان نەبووە، لەگەڵ چرای عمریان کوو ژاوەتەوە و لاشەکەیان شارراوەتەوە، ناویشیان لەسەر رووپەررەی جهان شوراوەتەوە، وە لەیادو لەبیری کەسا نەماونەتەوە، وەلی امین زەکی تا دنیا دنیابی و گەلەکەی لەرووی کاربی ئەمیش هەیە، وەتا ئەو زیندو بی ئەمیش زیندوە.
کەوابوو ئەی امین زەکی خۆت بە مردوو نەزانیت، تۆ نەمردویت، هەمو کوردێك وینەیەکی توی لەسەر دلی خوی هەل کەندووە، بەیانی
و ایواری یادی خوتو کردەوە
جوانەکانت ئەکات.
لەخوا ئەپارریمەوە، بە مهرەبانی
خوی لیت خوش بیت، وە
شوینەکەت کویر نەکاتەوە، وەبتکا
بە سەرمەشق و پیشەوا. بو هەموو عراق
و کوردەواریی لە کردارو رەفتارە
جوانەکانتا.

ئەو زانا گەورەیەی کە هەموو تەمەنی شیرینی خۆی بەخت کرد لە پێناو وریاکردنەوەی ئێمەدا و لە ڕێی پێشیناندا بۆ ئێمە بۆ پێشکەوتن و ئازادی و کامەرانی.
ئەمین زەکی بەگ، لە ساڵی ١٩٤٨دا کۆچی دوایی کرد، بەم مردنەی جگەری نەتەوەی کوردی سووتاند. نەتەوەی سەربڵندی کوردیش لە شێوەیەکی مەردانە و جواندا لە خاکی سلێمانیدا ناشتی و لە پاش (٤٠) ڕۆژ شیوەنێکی یەجگار دڵسووتێنەر، یەکجار کاریگەری بۆ کرد و بەوەش وازی نەهێنا، مێژووی ژیانی خوالێخۆشبووی لەگەڵ کارەساتی مردن و شیوەنیا لە نووسراوێکا نووسییەوە و چاپی کردو بڵاوی کردەوە.
بەڵام نەتەوەکەمان ئەبێ بەمەندە ڕێزگرتنی ئەمین زەکی بەگ واز بهێنێ؟! نەء، نابێ واز بهێنێ. ئەبێ هەروەك ناوی مێژووی ژینی زیندوو کردووەتەوە، گیان و کردەوەشی زیندوو بکاتەوە، تا بتوانێ گەلی جوامێر و نەژادی کورد لە کاروانی ژیاندا بەرەو پێشکەوتن و سەربەرزی و کامەرانی بروا بەرێوە. نزیکەی دە دوانزە ساڵێك لە پێش مردنیا، لە شەقڵاوەدا خوالێخۆشبوو خانوویەکی خنجیلانەی جوانکیلەی لە شوێنێکی خۆش و سازگاردا لەناو باخێکی گەورە و میوەداردا بۆ ڕابواردنی هاوین بۆ خۆی دروست کردبوو. لەو خانووەدا پرشنگی زانست و فەننی لە ناو نەتەوەکەی خۆیا بڵاو ئەکردەوە. ئامۆژگاریی هەموومانی ئەکرد بۆ ژینێکی بڵندتر و ڕێکوپێك تر. چارەی بێچارە و دەردەدارانمانی ئەکرد، دەستی هەژارانمانی ئەگرت و ڕێگای پیشان ئەداین بۆ پێکهێنانی هاوینەهەوارێکی جوان و خۆش و ڕێکوپێك، تا دەوڵەمەند بین و لە هەژاری و نەخۆشی ڕزگارمان کات.
لەو خانووەدا بەرەنگاریی هەژاری و زۆرداری و نەخۆشی و نالەبارییمانی ئەکرد. لەو خانووەدا نووسراوە نایابەکانی خۆی بۆ ئەنووسینەوە، کە خۆمان و بێگانەش تێ‌بگەیەنێ لە زرنگی و دەسەڵات و بەکەڵکیی نەتەوەی کورد بۆ دانیشتوانی سەرزەمین.
هەر لەو خانووەدا حکوومەتی هان ئەدا کە شەقڵاوە و پیرمام و سەرسەنگ و زاوێتە و تەلکێف و سۆلاڤ و پێنجوین و پیرەمەگروون و قۆپی قەراخ بکرێنە هاوینەهەوارانی ڕێکوپێك تا کوردستانی عێراق لە دەست هەژاری و زۆرداری و نەخۆشی و نالەباری و نەخوێندەواری ڕزگار کات و بمانکاتەوە بە گەلێکی زیندووی پایە بڵند.
جا ئەم خانووە بە نرخەی "ئەمین زەکی بەگ"ـە، کە یانەی ئەم هەموو بیری بەرز و کردارە بەکەڵکانە بوو، لە پاش مردنی خۆی چۆڵ و هۆڵ ماوەتەوە، وا خەریکە وێران ئەبێ،... وا دایارە نەوەکانی ئەمین زەکی بەگ پێیان ناکرێ خەمی بخۆن، چاودێریی بکەن... لەبەر کاروباری خۆیان، ناتوانن ئەم هەوارگە نایابە بە نرخە ببووژێننەوە، بەڵام ئایا نەتەوەی کورد ناتوانێ پارێزگاریی ئەم خانووە خۆشەویستە بکات؟!! ناتوانێ ماوە نەدات ئەم دەستگا و دووکانە تێك بچێت؟! ناتوانێ کردەوە و بیری بەرزی ئەمین زەکی بەگ بژێنێتەوە؟! بەڵێ، ئەتوانێ لەوە پتریش بکات.
کە لە ساڵی ١٩٥٣ بیستم نەوەکانی ئەمین زەکی بەگ خەریکن ئەم خانووە نازدارە بفرۆشن، دڵم هەڵقرچاو ترسام لەوەی دەست کریارێکی نامەرد و سەرنەوی کەوێ! وە ئەوسا ئابرووی نەتەوەکەمان بچێ! لەبەر ئەوە لەگەڵ هەندێ خزم و کەسوکاری "ئەمین زەکی بەگ"دا ڕاوێژم کرد بۆ بەرەنگاریکردنی ئەم فرۆشتنە. باش بوو لەوساوە تائێستا خانووەکە نەفرۆشراوە، بەڵام ئەوەی من ئەمەوێ بهێنرێتە دی، ئەوەیە: ئەم خانووە لەلایەن نەتەوەی کورد و هەموو هاتوچۆکەرانی شەقڵاوەدا تا بمێنێ، تا نووسراوەکانی ئەمین زەکی بەگ و نووسراوانی کورد و نووسراوانی بە کەڵکی هەموو لایەکی تیا بخوێندرێتەوە، جگە لەوە ژوورێکی تری تیا برازێنرێتەوە بە وێنەکانی ئەمین زەکی بەگ و جلوبەرگ و هەندێ کەلوپەلی ناوازە و خۆشەویستی خۆی، تا نەتەوە و نەژادی کورد هەموو دەم یادی خوالێخۆشبوو بکەن و هەموودەم تێکۆشن وەك ئەو بۆ پێشکەوتن و سەربەرزی و کامەرانییی گشت لاییمان. دیارە ئەم خانووە تازەکردنەوە و پۆشتەکردنەوەی ئەوێ، دیارە کە بۆ پاراستن و هەڵسووراندنی ئەو فەرمانانە کە گوتران لە سەرەوە، یەك دوو کەسی ئەوێ؛ پێویستە ئەمانەش بخرێتە بەرچاو. جا لەم بابەتەوە قسەم -بە تایبەتی- لەگەڵ هەندێ تێگەیشتوان و نیشتمانپەروەران و دەوڵەمەندانی کورد کرد، قسەکانمیان پێ‌خۆش هات و گەلێکیان بەڵێنیان دا کە قسە و ئاواتەکانم بهێننە دی و بە پارە و تێکۆشین لەم ڕووەوە یارمەتیم بدەن. جا بۆ ئەمەی هەموو نەتەوە ئاگای لەم کەین و بەینە بێت، ئەوا هەموو شتێکم خستە پێش چاوی هەموان. هیوادارم کە بەم زوانە لە سلێمانیدا و لە پێش هەموو کەسێکا لە دانیشتوانی سلێمانی، لیژنەیەك لە نەوەکانی ئەمین زەکی بەگ خانووەکەی بکرێ و تەرخان (وەقف)ی کات بۆ بەلەدییەی شەقڵاوە، بەو مەرجەی بیکات بە ناوازەگاه (مەتحەف) و خوێندنەوەخانەیەکی گشت لایی و بە پوولی خۆی کاروباری خانووەکە و پاراستنی خانووەکە تاسەر هەڵسووڕێنێ. جگە لەوە، هەر شتێکی تریشی پێویست بوو بۆی بکات، جا ئەوەندەی پارەی پێویست بێ بۆ کرین و ئاواکردنەوە و دامەزراندنی خانووەکە تا ئەدرێتە دەست بەلەدییەی شەقڵاوە، دەبێ ئەو لیژنەیە لە دەوڵەمەندان کۆی بکاتەوە.
ئەی نەتەوەی کوردی مەزن-
ئەوەندەی ئەمین زەکی بەگ، بۆ تۆی کردووە، شکسپیری بوێژ و نووسەر بۆ گەلی ئینگلیزی نەکردووە، لەگەڵ ئەوەشا گەلی ئینگلیز لە سێسەد ساڵ پترەوە تا ئێستا ئەو خانووەی کە شکسپیری تیا بووە، پاراستوویەتی و هەموودەم

تازەی کردووەتەوە و ئاوەدانی کردووەتەوە و بە نووسراو و کەلوپەلەکانی شکسپیرەوە تەرخانی کردووە بۆ کەڵکی گشت لایێ. جا ئەوەی لە تۆش هیوا ئەکرێ، ئەوەیە کە تەنیا بە شیوەنکردن بۆ مەرد و زانایەکی وەك ئەمین زەکی بەگ واز نەهێنرێ و وەك گەلی ئینگلیز چاکەی شکسپیری خۆی دایەوە، تۆیش چاکەی ئەمین زەکی بەگی خۆت بدەیتەوە.
جا لەم ڕووەوە ڕوو لە هەموو هونەرمەند و کارگوزارە نیشتمانپەروەرەکانمان ئەکەم و هیوادارم کە ئەم ئاواتە پیرۆز و بەرزەمان بهێننە دی.
(تەواو)

دوو ڕوونکردنەوەی گۆڤاری هەتاو:
پێشنیاز (ئیقتراح)ی مامۆستا شاکیر بەگ فەتاح لە بارەی خانووەکەی بەهەشتی ئەمین زەکی بەگەوە، دارێکە چەندین بەران دێنێ:
١. ئەمەگدارێتی بە نیشتمانپەروەران نیشاندان، ئاکارێکی پیاوانەیە و جێگای خۆیەتی.
٢. خانووی ناوبراو بەو چەشنەی کە ئەو پێشنیازی کردووە، ببێتە قوتابخانەیەکی وا کە ساڵی هەزاران نیشتمانپەرستان پێ‌گەیەنێ و دەرسی هەستی کوردایەتی تێدا فێر دەبن.
٣. هاوکاری و جوامێرێتیی وا دەبێتە گەورەترین هۆ و بەڵگە بۆ ئەو کەسانەی کە بیانەوێ لە ڕێگەی نیشتمان و کوردایەتی گیانبازی بکەن، چونکو بەوە دڵنیا دەبن کە ڕەنج و ئەرکیان بە خۆڕایی ناڕوا و نەتەوەکەی پێی دەزانێ و ئاکاری بەرز و ناوی پیرۆزیان هەتاهەتایە ڕاگیراو دەبێ. ئیتر هیوام بەهێزە کە دەریای جوامێرێتی و دڵسۆزانەی دەستڕۆیشتووەکانمان بۆ پێکهێنانی ئەو ئاواتە بێتە جۆش، کە کەڵکی گەل و نیشتمانی پێوە بێ تا ڕەوانی پاکی ئەمین زەکی بەگیشی پێ شاد و خەرۆ ببێ.
لەو دەرفەتەدا بە مایەی بەختیاریی خۆمی دەزانم کە بە گوێی برا موکریانیەکانم ڕاگەیەنم و ڕووی ئەوەیان لێ بنێم کە ئەوانیش لە ڕووی ئەمەگداری و دڵسۆزییەوە خانووەکەی حوزنی بپارێزن، بەڵکو لە دوا ڕۆژا بیکەنە کتێبخانە و خوێندنگەیەکی گشتی بە ناوی خۆی و بە هەزاران نوسخە کتێبی تەئریخی و ئەدەبی بە هەموو زمانێکی دونیا هەر لەلایەن خۆمانەوە پێشکەشی دەکرێت و گەورەترین ئاواتیشم ئەوەیە کە لە هەلێکدا تەرمەکەشی لێرەوە بگوێزنەوە مەهابادێ، تا ئەو پاڵەوانەی کە یەکەمین کەسێك بووە مێژووی بە زمانی کوردی نووسیوەتەوە و چاپخانەی بۆ کوردان دامەزراندووە و کوردی فێرە کوردی نووسین و خوێندنەوە کردووە، سەری خۆی کردبووە گۆ و چەوگانی تەشقەڵە و سیاسەتی ڕۆژگار، شوێن بزر نەبێ.

**١- سەید ئەحمەدی بەرزنجی ٢- ؟ ٣- محەمەدئەمین زەکی ٤- ؟ ٥- بەدیع**

# محەمەدئەمین زەکی بەگ، پیاوێکی ئینسایکلۆپیدیایی، نیگارکێشێکی پێشەنگ

د. جەزا بەکر

تێکستە ڕۆشنبیری و فیکرییەکانی مێژوونووس و گەڕیدە و تەنانەت کەسایەتییە سەربازییەکانیش لە نێوکۆی فەرهەنگی مێژوویی مرۆڤایەتیدا، هەر بە تەنیا خۆی لە نێو کولتووری (خوێندنەوە و نووسیندا) نابینێتەوە. بەڵکو لە لای هەندێك لە بیرمەند وکەسایەتییە مێژووییەکان و مێژوونووسە ناودارەکان خۆ دەهاوێتە نێوکایەی (ئەدەب وهونەرەوە). گەلێك لە ڕۆژهەڵاتناس و گەڕیدەکان لە میانی هونەری نیگارکێشانەوە، هەستی ستاتیکی وتوانای ئەفراندنی هونەری خۆیان پەخشکردووە، بە جۆرێك هەندێکیان بەرەو ڕۆژهەڵاتی پڕ لە ئەفسون و وڵاتانی عەرەبی سەفەریان کردووە و ئیمپرێشنەکانی خۆیان لە هەمبەر سروشت و کولتوور و ژیانی ڕۆژانەی ئەو شارستانیەتانە تۆمارکردووە،

بە تایبەتی کە زیاتر پەیڕەوی ستایلی (ڕیالیزم)یان کردووە، چونکە ڕیالیزم ئاوێنەیەکە بۆ بەرجەستەکردنی (واقیع- ڕیە ڵ) وەکوخۆی، تا ئەو ڕادەیە کە چوونەتە نێو قووڵایی بابەتەکانی وەکو (زەماوەند، خەتەنەکردن، ڕاوکردن، زۆرانبازی) و گەلێك دیمەنی سەرنج ڕاکێشتر. دواتریش ئەم کارە هونەرییە لە سەردەمی شۆڕشی ئیمپرسیۆنیستەکاندا گەشەی کرد و زیاتر پێشکەوت وگۆڕانکاری ڕیشەیی لە میدیا و کەرەسەی بەکاربراو لە پرۆسەی نیگارکێشاندا ڕوویدا، ئەویش لە میانی داهێنانی (تیوبی ڕەنگەکانەوە بوو ) بە جۆرێك ئاسانکارییەکی لە ڕادە بەدەری بۆ نیگارکێشەکان کرد و، بە سانایی دەیانتوانی بچنە نێو سروشت و شەقام و کۆڵانەکان، تاڕاستە وخۆ نیگاری دیمەنەکان بکێشن.

به تایبه‌تی( ڕەنگی ئاوی) تایبه‌تمەندی له
ڕادەبەدەری هەیە لە ڕووی بەکاربردن و
گواستنەوەوە، ئەمە بێجگە لەوەی کە لە ڕووی
تەکنیکی هونەرییەوە خەسڵەتێکی ستاتیکی تاکانە
و تێکسچەرێکی شەفاف و قەشەنگی هەیە. لەم
ڕوانگەیەشەوە زۆرلە مێژوونووس وگەڕیدە و
ئەفسەرە سەربازییەکان هەمیشە (ڕەنگی ئاوییان) لە
هەگبەکەیاندا هەڵگرتووە و لە هەر وێستگەیەکدا
ئارەزوویان کردبێت دەستیان بە نیگارکێشانی
ئەو بابەتە کردووە کە هەڵیانبژاردووە، بە تایبەتی
شوێنەوار و تەلار و باڵەخانە مێژووییەکان و دیمەنە
سروشتییە هەمەجۆرەکان سەرنجی ڕاکێشاون.
بەڵام ئەوەی لێرەدا گرنگە ئەوەیە، هەندێك لەوانە
وەك (پێشەنگ) لە مێژووی هونەری نیگارکێشی
وڵاتەکەیاندا ئەژمارکراون، نزیکترین نمونەش
(عەبدولقادر ڕەسام) و(محەمەدئەمین زەکی)ن کە
بێجگە لە ئەزمونی سەربازی نیگارکێشیش بوون. لە
هەمان کاتیشدا بە پێشەنگی هونەری نیگارکێشانی
عێراقی هاوچەرخ دادەنرێن. ئەمە لە کاتێکدایە،کە
مێژووی ئەم هونەرە لە عێراق و ناوچەکەشدا،
شتێکی نوێیە و تا ئێستاش مشتومڕی لە سەرە، بۆیە
دەکرێت ئەم بابەتە گرنگە شرۆڤە و بە دواداچوونی
بۆ بکرێت، کە ڕەنگە زۆرشت لەومێژووە بگۆڕێت،
سەرباری ئەوانەش هەندێك بەراورد و نزیکی هەیە لە
ڕووی(تەمەن، ئەزمونی سەربازی، ژینگەی خوێندن،
ستایڵی کارکردنی هونەری) لە نێوان (عەبدولقادر
ڕەسام ١٨٨٢-١٩٥٢ ) و(محەمەدئەمین زەکی بەگ
١٨٨٠-١٩٤٨ )، بەجۆرێك هەردووکیان لە ڕووی
تەمەنەوە زۆرنزیکن و تەنیا دوو ساڵیان نێوانە،
هەردووکیشیان وێڕای خوێندنی زانستی سەربازی
لە سکوڵی (جەنگی) پایتەختی عوسمانییەکان،
هەریەکەیان بە جۆرێ نیگارکێشانی خوێندووە کاتێك
کە ئەفسەربوون لە نێو سوپای عوسمانییەکاندا،
عەبدولقادر ڕەسام لەسەر دەستی ئوستادەکانی
ئەستەنبوڵ فێری هونەری نیگارکێشی بووە،
هاوڕێیەتی لەگەڵ چەند هونەرمەندێکیشدا هەبووە،
چونکە یەکێك لە بابەتە گرنگەکانی خوێندنی ئەو
سکوڵە سەربازییانە (وانەی نیگارکێشان) بووە.
ئەمەیش کولتورێکە عوسمانییەکان لە ئەوروپاوە
وەریانگرتووە، چونکە هەموو ئەفسەرێك بێجگە
لە وانە سەربازییەکان، پێویستە دەروونناسی و
شوێنەوارناسی و جوانناسی بخوێنێت. دیارە ئەم
کولتوورە لە نێو مێژووی سەربازیی یەکێتی سۆڤیتی
جاراندا زۆر گرنگیی پێ دراوە. تەنانەت لە
کۆلێژی سەربازی عێراقی ساڵانی هەشتادا، یەکێك
لەوانەکان شوێنەوارناسی بوو، ئەمە بێجگە لەوەی
کەم تا زۆر گرنگی بە نیگارکێشانیش دراوە، کە
دیارە درێژکراوەی هەمان کولتوری ئەوروپایە.
ئەوەی تایبەتیشە بە مێژوونووسی گەورەی کورد
(ئەمین زەکی بەگ) بێجگە لەوەی خۆی دەستی
وێنەکێشانی هەبووە، لە (مەڕسەمخانە)ی ئەستەنبوڵیش
خوێندویەتی، لە ڕووی ستایڵی کارکردنیشەوە،
هەردوو ناوبراو، بە ستایڵی (ڕیالیزم) کاریانکردووە،
بڕوانە وێنەی ژ(١)،(٢)،(٣)،(٤) . ئەمەش ڕەنگە

**(تابلۆی ١) گاریە، هۆیەکی گواستنەوەی سەردەمی عوسمانی، وێنەکێشانی محەمەدئەمین زەکی**

بۆ ئەوە بگەڕێتەوە کە هەردوو ناوبراو لە یەك ژینگە خوێندویانە و لە یەك ژێدەریش سوودیان وەرگرتووە، لێرەدا پرسیارێك دێتە ئاراوە، ئایا یەکتریان ناسیوە و ئاگاداری یەکتربوون، لە کاتێکدا هاوولاتی یەك نیشتمان بوون و لە بەغداش ژیاون؟ هەموو ئەمانە پرسیارگەلێکن شرۆڤەی زۆریان دەوێت، بەلام ویڕای ئەو لێك نزیکییانەی ئاماژەمان بۆکرد لە سەرەوە، دەبینین کە (ئەمین زەکی بەگ) لە ڕووی مەعریفییەوە پیاوێکی (ئینسایکلۆپیدیایی ) بووە و لە ڕووی پلە وپایەی وەزیفیشەوە، جێگەیەکی بالای هەبووە. ئەمەش وادەکات کە بگاتە سەروو ئاستی هونەرمەندە پێشەنگەکانی عێراق، بە تایبەتی گەر بێت و تابلۆ ئۆرجینالەکانیمان بەردەست بکەوێت. ئەوا ڕەنگە هەندێك ڕاستی شاراوەمان بۆدەربکەوێت کە پنتێك بێت بۆ ساغکردنەوەی زۆرشتی مێژوویی.

لە ڕاڤەکردنی ئەم دوو تابلۆیەدا، دەردەکەوێت کە زۆر بە کارایی و سەلیقەوە وێنەی دیمەن و فیگوڕاتەکانی کێشاوە و بە هەستیاری پڕ لە خەسلەتی ستاتیکی تایبەت بە ڕەنگی ئاوییەوە توانستی هونەری خۆی لە بەرجەستەکردنی ڕووناکی و سێبەر و پێرسپێکتیف و شەفافیەت و تێکسچەر و گشت توخمە هونەرییەکانی تردا نەخشاندووە، بەلام لە هەموویان گرنگتر ئەوەیە کە ئەم دوو تابلۆیە لە ڕووی بەهای هونەری و ستایل و تەکنیکە وە بە( تێپەڕاندنی کولتووری نیگاری میناتۆری و نیگاری سەردیوار و ژێرشووشە دادەنرێت بەرەو دامەزراندنی هونەرێکی هاوچەرخ کە لەسەر بنەمای پرەنسیپە ئەکادیمییەکان بونیاد نراوە ). هەموو ئەمانەش وادەکات کە محەمەدئەمین زەکی بەگ ببێتە یەکێك لە پێشەنگەکانی هونەری هاوچەرخ لە کوردستانی باشوور و تەنانەت لە عێراقیش. چونکە هەرچەندە تەنیا ئەم دوو تابلۆیەمان لەبەردەستایە و بە قەبارەش زۆر بچووکن، بەلام لە سێ لایەنەوە زۆرگرنگن : یەکەمیان: لە ڕووی مێژووییەوە، ڕەنگە بە یەکێك لە سەرەتاکانی هونەری نیگارکێشان دابنرێت لە کوردستان.

دووەمیان: لە ڕووی هونەرییەوە، هەمدیسان بە سەرەتایەك دادەنرێت لە تێپەڕاندنی هونەر وەك هۆکارێك بۆ ڕازاندنەوە، بەرەو قۆناغێکی زانستی ئەکادیمی، کە ئەمەیان بە وەرچەرخانێکی گرنگ دادەنرێت لە سەربەخۆبوونی هونەری نیگارکێشان لە پاشکۆیی هونەری تەلارسازی و زەخرەفە و نەخشە میللییەکان .

سێیەم: ئاستی ڕۆشنبیری چاوەکی: ئەم ڕەهەندەیان لە هەموویان گرنگترە، بە تایبەتی لە نێو کولتوورێکدا کە (نیگار و نیگارکێشان) تیایدا تا ڕادەیەکی زۆر (حەرام و گوناه ) بێت و ئاستی ڕۆشنبیری چاوەکی لە پلەی (سفر)دا بێت . چونکە کولتووری ئێمە زیاتر کولتوورێکی (بیستەکی، زارەکی– سمعی، شفوی ) یە و فەرهەنگێکی زیاتر حیکایەتخوانییە و خوێندن و فێربوون لە نێو (حوجرە و مزگەوت)ەکانەوە بووە، و (چەمکی نیگار) لە نێویدا، جێگەی نەبۆتەوە. هەموو ئەمانەش ئاماژەن بۆ کراوەیی (هزر و دیدگا) ی ئەمین زەکی بەگ. بەسەر جیهانی (مۆدێرن )ە و گەڕان بەدوای هونەر و مەعریفەدا، پەی پێبردنی بە بایەخی (هونەری نیگارکێشان ) وەك کایەیەکی مەعریفی و ستاتیکی، هەرچەندە کە ڕەنگە بە هۆی سەرقالییەوە، تەنیا لە چەند وێستگەیەکدا بۆی ڕەخساوە نیگاربکێشێت، بەلام گرنگ ئەوەیە کە لە هەولی پەیداکردنی زانیاری تردا بین، بە دیاریکراویش بە دەستخستنی ئەو تابلۆ ئۆرجینالانەی کە ( واژۆ و سالی دروستکردنی) پێوەیە، چونکە ئەم لایەنە یەکێکە لە پرەنسیبە گرنگەکانی چەسپاندنی (خاوەنداریتی) هەرکایێکی هونەری.

(تابلۆی ٢) بەری کەرخ لەسەر قشلەو ئەمبەری ڕووبارەوە وێنەکێشانی محەمەدئەمین زەکی

# هەڵوەشاندنەوەی سەرەتا (محەممەدئەمین زەکی بەگ)ی نیگارکێش

وەهبی ڕەسوڵ

وەك پێش ئاخافتنی هەر شتێك دەربارەی ئەم دوو تابلۆیەی ڕۆشنبیر و مێژوونووس و کەسایەتی سیاسی مەزنی گەلەکەمان شادڕەوان بەڕێز (محەممەدئەمین زەکی بەگ)، {شێوەی(١) و شێوەی(٢)}، دەمەوێت ئەوە بڵێم نزیکەی ساڵێکە ئاشنا و بە ئاگا بووم بە بوونی ئەم دوو تابلۆیە، لەڕێی بینینی وێنە و کۆپیەکەیانەوە لە بنکەی ژین. هەواڵی بوونی ئەم دوو کارە هونەرییە و ئامادەیی وێنەکانیان تا دەگاتە زانیاری دەرباری هەبوون و کێشانی چەندانێکی تر لەلایەن هەمان کەسایەتییەوە، شتێك بوو تا چەند سەرسوڕهێنەر هێندە و بگرە دەیان و سەدان هێندە دڵخۆشکەر، چوون دەمان گێڕێتەوە بۆ هەبوون و ئامادەیی کردەییانەی مێژوویەك لە نیگارکێشانی کوردیدا (وەك تابلۆ) کە پێشتر هەر بە ئاماژە و ئاخافتن، نەك بە بوون و ئامادەیی کردەیی کاری هونەریی، دەرباری بوونی کارکردن و نیگارکێشان لەو سالگارەدا ئامادەیی هەبووە.

کۆنترین مێژووی نیگارکێشان لە هەموو عێراق بە گشتی و لە کوردستانی باشووردا بەتایبەت، دەگەڕێتەوە بۆ سەرەتای سەدەی پێشوو، واتە بۆ سەرەتای ساڵی (١٩٠٠)، کە دەربارەی ئەو ئەفسەرەی سوپای عوسمانییە کە خەڵکی شاری سلێمانی بووە بە ناوی (عوسمان بەگ). ئەم مێژووە تەنها مێژوویەکە بە تۆمارکردن و باسکردن، بەبێ بوون و مانەوەی کارێکی هونەریی لەبەردەستا بوو یاخود بینراو.

هەموو ئەوەش کە دەربارەی ئەم هونەرمەندە نیگارکێشە، واتە (عوسمان بەگ) وتراوە و تۆمارکراوە هەر هێندەیە کە:

(د.سلسل العانی) لەم بارەیەوە وتویەتی: «دەڵێن لە ساڵانی سەرەتای ئەم سەدەیەدا، (مەبەست سەدەی بیستەمە) لە شاری سلێمانی، (عوسمان بەگ) ناوێك، کە نیگارکێشێکی شارەکە بووە، دەچووە ناو گۆڕستانی شار و ڕەسمی ئەو ژنانەی دەکرد کە لەسەر گۆڕەکاندا لە ناو گوڵ و سەوزاییدا دادەنیشتن. ئەم دیاردەیە لەو سەردەمەدا بە شتێکی ناجۆر و سەیر دەزانرا و ژنان لە هەموو لایەك باسیان دەکرد. بەڵام لەگەڵ ئەوەش، ئێمە تا ئێستا هیچ تابلۆیەکی ئەو هونەرمەندەمان بە دەست نەگەیشتووە»(١)

شێوەی (٧)

لەم بارەیەوە (جبرا ابراهیم جبرا) دەڵێت:" لە گۆڕستانێکی سلێمانیدا لە سەرەتای ئەم سەدەیەدا ئەفسەرێك بووە، ناوی (عوسمان بەگ) بووە، وێنەی ئەو ئافرەتانەی کێشاوە کە دیدەنی گڵکۆی مردووەکانیان کردووە، ئەو ئافرەتانەی کە گوڵ و سەوزایی بەهار دەورەی داون، ئەگەرچی هیچ تابلۆیەك لەو تابلۆیانەی ئەم هونەرمەندە کوردە نەماون، بەڵام تا ئێستا یادی ئەو هونەرمەندە هەر ماوەتەوە" (٢)
هونەرمەند(خالید سەعید)یش لە چاوپێکەوتنێکدا کە هونەرمەند (خالید ڕەسوڵ) لەتەکیدا سازیداوە دەربارەی ئەم هونەرمەندە دەڵێت:"من لە(تۆفیق وەهبی بەگ)م بیستووە، ئەفسەرێکی کوردی خۆمان، کە ئەفسەر بووە لە سوپای تورکیدا، ڕەسمی سەرقەبرانی کردووە لە بەهاردا کە گوڵەکان هەمووی پەمەیی و مۆرە"(٣)
لەم چەند زانیارییە بترازێت هیچ شتێکی تر دەربارەی ئەم هونەرمەندە نازانرێت، تەنانەت نازانرێت کارکردن و بەرهەمی هونەریانەی ئەو بە چەند ساڵ لە دوا ساڵانی هەزار و نۆ سەدەوەیە؟ بەڵام لێرەدا ئەوەی گرنگە مێژووی ئاماژەپێکراوی کارکردنی هونەریانەی (محەممەدئەمین زەکی بەگ)، دەگەڕێتەوە بۆ پێش ئەو مێژووەی (عوسمان بەگ) تیا کاری هونەریانەی کردووە، ئەمەش وێڕای ئەوەی مێژوویەکە بە ئاماژە پێدان هاوکات مێژوویەکە بە ئامادەیی کاری هونەریی، کە ئەم دوو تابلۆیە نمونەی زیندوو و لەبەردەستابووی ئەو کارکردنە هونەرییەن. بەهای ئەم دوو کارە هونەرییە هەر هێندە نییە و بەس، بەڵکو لەڕێی ئەم دوو تابلۆیەوە، وێناکردنی ئێمە بۆ شێواز و چۆنیەتی و ئاستی کارکردن و تەنانەت مادده و کەرەسەی کارکردنی هونەریانەی ئەو سەردەمە ڕوون و ئاشکرا تر و دیاریکراو تر دەکات،(هەرچەندە گەر دانەی ئۆرجینالی ئەم دوو تابلۆیەمان بە ڕاستەخۆ بدیایە، توانای ئەم دیاریکردنەمان دەستنیشانکراو تر و وردتر دەبوو) کە پێشتر تەنها وێناکردنێکی نادیار بوو، تەنانەت بۆ جۆر و شێوازی کارکردنی هونەریانەی نیگارکێشێکی وەك (عوسمان بەگ)یش، کە ئەویش وەك (محەممەدئەمین زەکی بەگ) ئەفسەر بووە لە سوپای عوسمانیدا، هەر بەدیارکەوتنی ئەم دوو کارە هونەرییە وا دەکات کە وێناکردنێکی ڕوونمان هەبێت بۆ جۆر و شێوازی نیگارەکانی (عوسمان بەگ) یش، کە بە هەمان شێوازی ڕیالیستی ئەکادیمیی دروست و بەرجەستە کرابن، کە شێوازێکە لە نیگارکێشانی ڕۆژئاوایی، و بە دڵنیاییەوە بزاوتی نیگارکێشانیش(وەك هەر بوارێکی تری ژیاریی) دوادوایی سەردەمی دەوڵەتی عوسمانی کەوتۆتە ژێر کاریگەری هەژمونی کولتووری ڕۆژئاواییەوە.
چوون گەر سەرنج لە شێوازە هونەرییە (بەنزیکی) هاوشانەکانی ئەو مێژووە بدەین بە تایبەت لە کوردستانی ڕۆژهەڵات، (بۆیە ڕۆژهەڵاتی کوردستان بەنمونە دێنینەوە، چونکە ئاسەواری هونەریی لەو مێژووە کارکردنەدا هەبووە وماوەتەوە و لەبەردەستدایە) ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت کە زیاتر شێوازی نیگارکێشان لەو مێژووەدا، شێوازێك بووە ئاوێتە لە توانا خۆڕەسییەکانی هونەرمەند و کاریگەریی شێوازە کارکردنی هونەری میناتۆری ڕۆژهەڵاتیی ئێرانی، وەك نمونە بڕوانینە "دوو تابلۆی هونەرمەند (عەبدوڵڵاخانی سالار/سالار ئالبلاخ) (١٨٧٣- ١٩٤٣){شێوەی(٣) و شێوەی(٤)} کە شەش ساڵ پێش (محەممەدئەمین زەکی بەگ) هاتۆتە دنیاوە و پێنج ساڵ پێش ئەویش کۆچی دوایی کردووە، یاخود کارێکی هونەریی هونەرمەند و کەڵە ڕۆشنبیر و نووسەر و کەسایەتی سیاسی (عەبدوڵڵا ئیفتیخار سەڵتەنە/ عەبدوڵڵای ناهید)

شێوەی (٢)

(١٨٩١-١٩٤٥) {شێوەی(٥)}کە لە هۆزی فەیزوڵڵا بەگیەکانە و
برا گەورەی هونەرمەندی گەورە (فەیزوڵڵاخانی ناهید)ە. ئەم
هونەرمەندەش کە دوانزە ساڵ دوای (محەممەدئەمین زەکی
بەگ) هاتۆتە دنیاوە و بەڵام سێ ساڵ پێش ئەو کۆچی دوایی
کردووە".(٤)
یاخود ئەگەر کەمێك زیاتر بگەڕێینەوە بەرەو ڕابردوو بڕوانینە
کارێکی نیگارکێشانی کەڵە نووسەر و شاعیر و هونەرمەند
(عەبدوڵڵا بەگی میصباح دیوان) (*){شێوەی (٦) کە نیگارێکی
هێڵکاریی (ناصرەدین شای قاجاری)یە بەنزیکی لە نێوان ساڵانی
حەفتا و هەشتای سەدەی نۆزدە (١٨٧٠-١٨٨٠) کێشاویەتی}
(**) گەر (عەبدوڵڵا بەگ) بەنزیکی شەست و پێنج ساڵێکیش
ژیابێت، ئەوا سی ساڵێك پێش مامۆستا (محەممەدئەمین زەکی
بەگ) هاتۆتە دنیاوە و سی و دوو ساڵێك پێش ئەویش کۆچی
دوایی کردووە.
لە تێڕوانینێکی بەراوردکارییانەدا لەنێوان کاری هونەریی ئەم
هونەرمەندانە (کە زیاتر کەوتونەتە ژێر کاریگەری هونەری
نیگارکێشانی ڕۆژهەڵاتی) و (محەممەدئەمین زەکی بەگ)دا
بەڕوونی ئەو بۆچوون و جیاوازییەمان لە شێوازی کارکردنیاندا بۆ
دەردەکەوێت. ئەمە و ئەو خاڵەش بە ڕوونی دەردەکەوێت کە
لەو مێژووە سەرەتایەی بزاوتی نیگارکێشانی کوردیدا، بەتایبەت
لە کوردستانی باشووردا، هێڵێکی تایبەت و کاریگەر بە شێوازی
نیگارکێشانی ئەکادیمیی هاوشانی کاریگەری شێوازی هونەری
نیگارکێشانی میناتۆریانەی ڕۆژهەڵاتیی ئێرانی ئامادەیی هەبووە،
ئەمە سەرباری ئەو شێوازە هونەرییانەی کە پشتبەست بوون بە
توانا خۆڕەسیەکانی هونەرمەندان خۆیان و هونەرە میللییەکان.
هۆکاری سەرەکی بوونی ئەم هێڵە کارکردنە ئەکادیمییە لەو
سەردەمەدا، دەگەڕێتەوە بۆ دامەزراندنی (قوتابخانەی ڕوشدییەی
عەسکەریی) لە شاری سلێمانی، لە ساڵی(١٨٩٢)دا، کە تەنها
لەشاری موصل و شاری سلێمانی لە باکووری عێراقدا لە
جۆری ئەم قوتابخانەیەی تیاکراوەتەوە، کە ئەو سەردەمە لەم
قوتابخانەیەدا وانەی هونەری نیگارکێشان بەشێوە ئەکادیمیەکەی
هەبووە و خوێندراوە. بوونی قوتابخانەیەکی لەو جۆرە و لەو
مێژووەدا، کە دیارە چۆن گرنگییان بە بوارێکی وەك هونەر بەو
شێوە نوێیە داوە، هەر ئاواش لەتەك کایە مەعریفییەکانی تری
ئەو سەردەمەدا مامەڵەیەکی نوێ و تایبەتیان کردووە، نەك هەر
کاریگەریی لەسەر سەرەتای دامەزراندنی بزاوتی نیگارکێشان/
هونەر هەبووە لەسلێمانیدا، بەڵکو کاریگەریی لەسەر باڵاکردنی
سەرجەمی کایە کولتوورییەکانی نێو شاری سلێمانی بە گشتیی
کردووە.
کەواتە ئێستا وێنەی ئامادەیی ئەو ئاراستە هونەرییە جیاوازانە
هەرچی زیاتر لەتانوپۆی شێوازی کاکردنیاندا ڕوون دەنوێنێت
و دەکرێت وێنا بکرێت و هاوکات بیرکردنەوە و ئاخافتن و
دەرەنجامیشی لەسەر بنیات بنرێت.
دەبینین ئامادەیی و کاریگەریی ئەم چەند ئاراستەیە لە شێوازی
بزاوتی نیگارکێشانی سەرەتادا، وای کردووە کە کەسێکی

عەبدوڵڵا بەگی مسباح دیوان

حەسەن فەلاح ١٩١٠-١٩٧٦

عەبدوڵڵا ئیفتیخار سەڵتەنە ١٨٩١-١٩٤٥

وەك مامۆستا (جەمال ڕەشید) ئاماژە بە "ڕۆڵ و كاریگەریی گەڕانەوەی دەستەیەك لە ئەفسەرانی كورد بدات لەنێو ڕیزەكانی سوپای عوسمانیدا، لەسەر بزاوتی سەرەتای هونەری شێوەكاری/نیگاركێشان لەكوردستانی باشووردا"(٥) ، كە ئەو كاریگەرییانە دوور و نزیك هاوشانی كاریگەرییە هونەرییەكانی تر لە دروستبوونی توانایەكی هونەریی وەك هونەرمەند (حەسەن فەللاح)دا (كە دەستپێكی دیار و كاریگەری تایبەتی بزاوتی نیگاركێشانە لە شاری سلێمانیدا)، ڕۆڵی خۆی بگێڕێت.
ڕاستە كاتێك بە سەربوردەی ژیانی مامۆستا (محەممەدئەمین زەكی بەگ)دا دەگەڕێین ئەوەمان بۆ دەردەكەوێت، كە ئەو كاتانەی ئەو سەرقاڵی كاری نیگاركێشان بووە و بەرهەمی هونەریی هەبووە، زیاتر لە دەرەوەی كوردستان، لە بەغداد و ئەستەنبوڵ بووە، كە دەستپێك بە ساڵی (١٨٩٦) لە ئامادەیی سەربازیی/ئیعدادیەی عەسكەریی لە بەغداد دەگرێت و بە ساڵی (١٩٠٢) بە تەواوكردنی قوتابخانەی ئەركانی سەربازی كۆتایی دێت لە ئەستەنبوڵ. هەر لە سەربوردەكەیدا ئاماژە بە دروستكردن و بەرهەمهێنانی چوار تابلۆ دەكرێت لەم قۆناغەدا (تابلۆی مزگەوتی شێخ عەبدلقادری گەیلانی، تابلۆی دیمەنی بەری قشڵەی عەسكەری كە بەسەر ڕووباری دیجلەدا دەڕوانێت، دوو تابلۆی دیمەنی كازمییە كە یەكێكیانی بە موشیر پاشا بەخشیوە و ئەوی تریانی بردووە بۆ ئەستانبوڵ و لەوێ پێشكەشی وەزارەتی جەنگی كردووە)
وەك سەربوردەی ژیانی دیارنییە و ئاماژەی بۆ نەكراوە دوای ئەو مێژووانە كە بەردەوامیی دابێت بە كاری نیگاركێشان یاخود سەرقاڵی ئەو بوارە بووبێت.  بەڵام گرنگ لە ساڵانی خوێندنی پۆلی سێیەمیەوە لە قوتابخانەی ڕوشدییەی عەسكەری لە سلێمانی، ئەو سەودایی لەتەك نیگاركێشاندا هەبووە و لەوێش زانیاری و ڕێنمایی و شارەزایی لەسەر ئاستێكی ئەكادیمی نیگاركێشان وەرگرتووە كە دواتر ئەو شارەزاییەی لە قوتابخانەی ئیعدادی عەسكەریی بەغداد باڵاتر كردووە، ئەم هەڵكشانە بەردەوام بووە تا گەیشتن بە (مەكتەبی حەربییە) لە ئەستەنبوڵ. ئەمە بەلایەك، بەلایەكی تر گرنگ ئەو

**عەبدوڵڵا سالار ١٨٣٧-١٩٤٣**

شارەزایی و زانیاریە ئەكادیمییەی نیگاركێشان لەنێو كوردستان/سلێمانیدا هەبووە گەر بە شێوەیەكی سەرەكی و ڕاستەوخۆیی لەڕێی ئەمیشەوە نەبووبێت، ئەوا لە ڕێی كەسانی تری هاوپۆلی ئەمدا، ئاشنا و بڵاو بووەتەوە.
ئەم دوو تابلۆیە وێڕای ئەوەی ئەو دیوە كەسایەتییەی بۆ خستینەڕوو، كە هونەرمەند و نیگاركێشە لە (محەممەدئەمین زەكی بەگ)ی زانا و مێژوونووس و ئەندازیار و كەسایەتی سیاسیدا، هاوشان وێنەی ئەو میتۆدە هونەرییەی لا بەرجەستە كردین كە لە شێوازی نیگاركێشانی ساڵانی دوادوایی حوكمی عوسمانییەكاندا پەیڕەو كراوە، تا درێژ بوونەوەی كاریگەریەكانی بۆ سەر وڵاتان و میللەتانی ژێر ئەو قەڵەمڕەوە.

### دەربارەی دوو تابلۆكە

دوو تابلۆكە وەك جۆری ڕەنگی بەكارهاتوو، بەڕەنگی ئاویی كێشراون و پێوانەكەیان بە پێی بینین و باسكردن(٣*) پێوانەیەكی بچوكە كە لە پێوانەی پۆستكارتدان. هونەرمەند وەك بابەتی كارەكانی دوو بابەتی واقیعی هەڵبژاردووە لە ژیانی ڕۆژانەی خۆیەوە لە شاری بەغداد، جا ئەگەر ساتەوەختی كێشانی ئەم دوو نیگارە هونەرمەند خۆی لە بەغداد بووبێت، یاخود پشتبەست بە بیرەوەری یا بەسوودمەند بوون لە فۆتۆگراف لە زەمەنێكی دواتردا

شێوەی (٣)

شێوەی (٤)

کێشابێتنی. بە تەکنیکی جێبەجێکردنی کارەکاندا شارەزایی و کارامەیی تەکنیکی لە ڕەنگی ئاویدا دەردەکەوێت، بەجۆرێك کە هونەرمەند تەواو وەك نیگارکێشێکی ئەکادیمی ئەم بوارە نیگاری کێشاوە. گەر وەك لە گێڕانەوەکاندا ئاماژەی پێ دەدرێت کە (عوسمان بەگ)ی هونەرمەند چووەتە سەرقەبران و ڕاستەوخۆ لەوێ نیگاری کێشاوە، ئەمە مانای ئەوەمان دەداتێ کە نیگارکێشانی ئەو دەمە گەیشتووەتە هوشیاریی بەرجەستەکردنی ڕاستەوخۆ لە سروشتەوە و لە بەرامبەر خودی سروشت خۆیدا، کە ئەمەش ڕشتە و نەریتێك بوو، ئیمپرێشنیزمەکان(ئینتیباعیەکان) لە فەرەنساوە لە سەدەی نۆزدەوە و بە نزیکی لە ساڵی (١٨٧٠)دا هێنایانە نێو هونەری نیگارکێشانی ئەوروپییەوە. لێرەوە ئەگەینە ئەو خاڵەی کە ئەو جۆرە بیرکردنەوەیە لە نەریتی نیگارکێشاندا لای ئەم هونەرمەندانەش ئامادەیی خۆی هەبووە، هەر بۆیە بە دوور نازانرێت ئەم دوو کارەش بە ڕاستەوخۆیی لەبەرامبەر دیمەنە بەرجەستە کراوەکانیاندا نەکێشرابن.
پێ دەچێت بەم هۆکارەش کارەکان بە ڕەنگی ئاویی کێشرابن، ئەمە وێڕای گرانی و دوورەدەستی و بەئەرکیی ڕەنگێکی وەك ڕەنگی زەیتی بۆ پرۆسێسی نیگارکێشانێکی لەو شێوەیە. هەر لەم میانەوە لە کتێبی (هونەری نیگارکێشان)دا کە ساڵی (٢٠٠٦) چاپکراوە، بە مەزەندە ئاماژەم بەوە دابو کە دەبێت ئەو جۆرە ڕەنگەی (عوسمان بەگ) نیگاری بابەتەکانی لە سەرقەبران لە سلێمانی پێ کێشابێت، ڕەنگی ئاوی بێت، شێوەی(١) تابلۆی {(گاریە) هۆیەکی گواستنەوەی سەردەمی عوسمانی} شێوازی کارکردن تیایدا دەچێتەوە سەر شێوازی نیگارکێشانی نیگارکێشە ڕۆژهەڵاتناسەکان، هەرچەندە وا دەردەکەوێت کە هەردوو نیگارەکە لە ڕووی ڕەنگەوە بەرەنجامی تێپەڕبوونی کات و جۆری ماددەی کاکردن و ڕووی کارەکە و تەنانەت جۆری هەڵگرتن و پارێزگاری لێکردنەکەی، تا ئاستێکی باش تێکچووبن، بەڵام کەم تا زۆر توانا و بەسەلیقەیی دانانی ڕەنگەکان هەست پێ دەکرێت.
دواجار ماوەتەوە بڵێین سوپاسی تایبەت بۆ ئەو ماندوێتییەی ئەو مامۆستا بەڕێزانەی بەدەست کۆکردنەوە و چاپکردنی کار و بەرهەمەکانی مامۆستای زانا (محەممەدئەمین زەکی بەگ)ەوە کێشاویانە، کە لەنێو ئەو ئەرکە گەورەیەدا، هاوکاتی ئەوەی ڕووناکییان خستە سەر بەشێك لە مێژوویەکی نادیاری بزاوتی نیگارکێشانی کوردی لە کوردستانی باشووردا، جێ شانازیەکی نوێ و تایبەتیشیان بە مامۆستایان و هونەرمەندان و خوێندکارانی هونەری شێوەکاری بەخشی، دەستی ماندووبوونیان دەگوشم.

**پەراوێز و سەرچاوە :**

(١) پیربال، فەرهاد: مێژووی هونەری شێوەکاری لە کوردستاندا: لە کۆنەوە تا پەنجاکان، هەولێر: دەزگای مێرگ ٢٠٠٦، ل٦٩.

(٢) پیربال، فەرهاد: هەمان سەرچاوە، ل ٦٩.

(٣) لەم بارەیەوە بڕوانە: چاوپێکەوتنی هونەرمەند خالید سەعید، سازدانی: خالید ڕەسوڵ، بەکامێرای (**VHS**)، ماڵی حاجی ڕەسوڵ، گەڕەکی چوارباخ، سلێمانی، ڕێکەوتی ١٩٩١/٨/٢٩.

(٤) افخمي، ابراهيم : تاريخ فرهنگ و ادب مكريان ، بوكان : مركز پخش انتشارات محمدى سقز، فروردين سال ١٣٦٤،ل٦١٥ ـ ل٦١٨.

(٥) رشيد،جمال : في البدو كان حسن فلاح، ڕۆژنامەی (التاخي) ژمارە (١٣١٤)ی ڕێکەوتی (١٩٧٣/٤/٢٣).

(*) عەبدوڵڵا بەگی میصباح دیوان (ئەدەب) (..؟ ــ ١٩١٦) کە ساڵی هاتنە نێو ژیانی نازانرێت و دیاریکراو نییە،و ساڵی کۆچی دوایی کردنیشی بەهەوڵ و بەدواداچوونی مامۆستای بەڕێز (محەممەد حەمە باقی) لە چاپی تازەی پێزیادکراوی ساڵی (٢٠١٠) دیوانەکەیدا ساغکراوەتەوە، کە دەکاتە ساڵی (١٩١٦)ە. لەم بارەیەوە بڕوانە: دیوانی

شێوەی (٥)

شێوەی (٦) نەسرەدین شای قاجاری

ئەدەب، چاپی تازەی پێزیادکراو، کۆکردنەوە و ساغکردنەوە و ئامادەکردنی: محەممەد حەمە باقی، سلێمانی: مەڵبەندی کوردۆلۆجی، ٢٠١٠،ل٢٤ ـ ل٣٦.

(**) بەرەنجامی هەوڵ و بەدواداچوونم، چەند ساڵێك لەمەوپێش لەسەردانێکمدا بۆ مۆزەی هونەرەجوانەکانی کۆشکی ڕەزا شا لە تاران، لە نهۆمی سێیەمی ئەو مۆزەیەدا، کە تەرخانی نیگار وتابلۆ کێشراوەکانی مێژووی کۆنی ئێران کراوە، تابلۆیەکم بەرچاو کەوت کە بە ڕەنگی زەیتی کێشراوە و پێوانەکەی بە نزیکی (١٠٠×٨٠)سم زیاتر دەبێت، مێژووەکەی دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی (١٨٧٥)، بابەتی تابلۆکەش (میرزایەکی قاجاڕی)یە و ناوی نیگارکێشەکە نووسراوە (عەبدوڵڵا خان)، ئەم تابلۆیە {شێوەی (٧)} بە ساڵی دروستکردن و ناوی نیگارکێشەکە و تەنانەت بابەتی ناوەڕۆکی تابلۆکەشی، زۆر پێ دەچێت کاری نیگارکێشیی (عەبدوڵلاخانی میصباح ئەدەب دیوان) بێت، چون ئەدەب سەروسەخت و نزیکی لە تەك قاجارەکاندا زۆر بووە و هەر یەکێ لە شاکانی ئەوانیش کە(محەممەد عەلی وەلیعەهدی قاجاڕی)یە نازناوی (مصباح الديوان)ی داوەتێ. بە داخەوە تا ئێستا بەرەنجامی نەبوونی پشتگیریی و هاریکاری و زانیاری توانای ساغکردنەوەی خاوەنی ئەم تابلۆیەم نەبووە، بەڵام گەر ئەم تابلۆیە بە دەست و پەرەموچی ئەدەب کێشرابێت، ئەوا بە کۆنترین تابلۆ لە مێژووی نیگارکێشانی کوردیدا مەزەندە دەکرێت.

(*٣) بەڕێز مامۆستا (سدیق ساڵح) ئەم وردەکارییانەی دەربارەی دوو تابلۆکە پێ بەخشیم سوپاسیان ئەکەم و دەستخۆشی ماندویتی و شەونخونییان لە کارکردنی ئەم بوارەدا لێ دەکەم.

تێبینی/ لێرەدا زۆر سوپاسی مامۆستای بەڕێز و ئازیزم (محەممەد حەمە باقی) دەکەم، کە بەرەنجامی گەڕان و کۆشینی دڵسۆزانەی خۆی دەرباری ژیان و بەرهەمەکانی (عەبدوڵڵابەگی میصباح دیوان)، توانیویەتی نیگارەکانی بدۆزێتەوە و بە گەورەیی خۆیان وێنەی ئەو کارانەیان خستە بەردەستم، سوپاسیان ئەکەم.

شێوەی (٧)

# محەمەدئەمین زەکی بەگ وەك هونەرمەندێك

کامەران سوبحان

ڕەنگە ناونیشانی ئەم بابەتە بۆ زۆر خوێنەر جێگەی سەرسوڕمان بێت، کە مێژوونووسێکی دیاری کورد و خاوەنی کتێبی مێژوویی (خولاسەی تەئریخی کورد و کوردستان) وەك هونەرمەندێك ئاماژەی بۆ بکەین، بەڵام ئەوە شتێکی بەڵگە نەویستە و ئەم مێژوونووسە گەورەیەی نەتەوەکەمان وێنەکێشێکی دیار و بە سەلیقەی هونەریش بووە و هەرگیز کاری سەربازیی و کارگێڕی ڕێگەی ئەوەی لێ نەگرتووە کاری هونەریی بکات، بەڵام بەداخەوە ئەو تابلۆ هونەرییانەی کە کێشاونی، ئۆرژیناڵەکەی نەماوەتەوە و تەنها کۆپییەکەیەتی، ئێستاش بە پێی وتەی چەند هونەرمەند و ڕەخنەگرێکی هونەریی ئاستی هونەریی ئەو تابلۆیانەی ئەمین زەکی بەگ لە ئاستێکی زۆر باڵادایە.

ئەلبوومی محەمەدئەمین زەکی بەگ، ناوی ئەو کتێبە وێنەییەیە کە بنکەی ژین لە یادی ٢٢٨ ساڵەی دامەزراندنی شاری سلێمانیدا بڵاویان کردەوە، ئەم کتێبە لەلایەن بەڕێز سدیقساڵح ئامادەکراوە و ماندووبوونێکی زۆری پێوە کێشاوە تا زانیاری کتێبەکە و وێنە مێژوویی و دانسقەکانی محەمەدئەمین زەکی و خێزانەکەی و سەعید پاشای خەندان و ماجید بەگی عوسمان پاشا و حەمید بەگی عوسمان پاشا و چەند کەسایەتییەکی تری بەو کوالێتییە بەرزە تێدا کۆبکاتەوە، کە کۆمەڵێکی زۆر لەو وێنانە یەکەم جارە دەبینرێن و وێنەی دانسقە و مێژوویی گرنگن بۆ نووسینەوەی قۆناغێکی دیاریکراویی مێژووی نەتەوایەتیمان بە سوپاسێکی زۆریشەوە بۆ ئەم ژمارەیەی ڕۆڤار سوودێکی زۆرمان لەو وێنە مێژووییانەی ئەمین زەکی بەگ بینی .

بەشێکی زانیارییەکانی ئەم کتێبەی محەمەدئەمین زەکی بەگ نووسەر لەگەڵ م.جەعفەر ساڵی ٢٠٠٨ لەماڵی خاتوو سانیحەی کچی محەمەدئەمین زەکی بەگی مێژوونووس و دکتۆر ژاڵەی کچەزای لە بەیرووت دەستی کەوتووە، ئەو زانیاریی و دەستنووس و وێنانەی

ئەم مێژوونووسە گەورەیەی کورد دەبێتە کەشکۆڵێکی گەورە بۆ ئەوەی لە داهاتوودا بە وردی و بە ڕاستگۆیی مێژووی نەتەوەکەمان بنووسرێتەوە، بێگومان بەشێکی زۆری ئەو دەستنووس و کتێبخانە و دیکۆمێنتە گرنگانەی ژیانی محەمەدئەمین زەکی بەگی مێژوونووس پێشووتر خاتوو سانیحە پێشکەشی کۆڕی زانیاری کوردی کردووە لە بەغدا، بەڵام تا ئێستا وەك پێویست سوود لەو کەرەستانە وەرنەگیراوە، ئەوەشی کە کراوە و سوودی لێوەرگیراوە وەك هەوڵێکی تاکەکەسی بووە، چونکە پێشتر لە چاوپێکەوتنێکی ژمارە ١٠٨١ ی ٩ی تەمووزی ساڵی ١٩٧٢ی ڕۆژنامەی (تەئاخی) ئۆرگانی پارتی دیموکراتی کوردستان، سانیحەی کچی محەمەدئەمین زەکی بەگ وتوویەتی، پێنج دەفتەری دەستنووسی باوکی لایە کە دوانیان بیرەوەرییەکانیەتی بە زمانی تورکی عوسمانی نووسیوویەتی، ئەوەشمان بیرنەچێت محەمەدئەمین زەکی بەگ جگە لە زمانی کوردی زمانەکانی (عەرەبی و فارسی و تورکی و فەرەنسی و ئینگلیزی و رووسی و ئەڵمانی) بەباشی زانیووە، ئەمە جگە لەوەی مێژوونووسێکی بە سەلیقە بووە و چەندین شیعر و چامەی شیعریی هەبووە و بڵاوکردووەتەوە، تەنانەت شیعری بۆ پیرەمێرد نووسیوە و دەشڵێن هەر پیرەمێرد پێی وتووە لە بری شیعر زیاتر خۆی بە مێژووەوە سەرقاڵ بکات و واز لە شیعر نووسین بهێنێت.

لایەنێکی تری محەمەدئەمین زەکی بەگی مێژوونووس کە ڕەنگە پێشتر زۆر بە کەمی ئاماژەی بۆ کرابێت توانای وێنەکێشان و سەلیقەی هونەرییەتی، کە لەم کتێبەدا کاك سدیق ساڵح ئاماژەی بۆ کردووە و تەنانەت دوو لەو تابلۆیانەشی پاراستووە، ئەمەش هێندەی تر لایەنی گەش و درەوشاوەی محەمەدئەمین زەکی بەگی مێژوونووس دەردەخات، کە پێشتر ئێمە و زۆر کەسی تریش ئەوەی نەزانیوە کە ئەم پیاوە وێنەکێش بووە و تەنانەت تا هەنووکەش هەندێ لە تابلۆکانی لە مۆزەخانەکانی تورکیا پارێزراوە، سەبارەت بە ئاستی تەکنیکی و ڕەنگ و دارشتنی تابلۆکان، بینەر هەست دەکات ئەمە کاری هونەرمەندێکی بەسەلیقە و پڕ ئەزموونە، دیارە ئەم ڕەهەندەی ژیانی ئەم مێژوونووسەمان تا هەنووکە وەك پێویست قسەی لەسەر نەکراوە بەسەر نەکراوەتەوە.(لەم ژمارەیەی ڕۆڤاردا هەردوو هونەرمەندی شێوەکار د.جەزا بەکر، وەهبی ڕەسوڵ، وەك دوو هونەرمەندی پسپۆڕ خوێندنەوەیەکی وردیان بۆ ئەو دوو تابلۆیە کردووە و لایەن و ڕەهەندە جیاوازەکانی کارکردنی هونەریی ئەم مێژوونووس و هونەرمەندەیان شیکردووەتەوە.)

لایەنێکی تری ئەم کتێبە کە پێویستە ئاماژەی بۆ بکەین، ساغکردنەوە و بەدواداچوونی بنەچەو ژیاننامە و بنەماڵەی ئەمین زەکی بەگە لە باو و باپیرانییەوە تا خۆی، کە پێم وایە ئەو ژیاننامەیەی ئەمین زەکی یەکێکە لەو ژیاننامە چڕ و پڕانەی کە تا هەنووکە نووسرابن و بە وردی و بە بەرفراوانی بە خوێنەران ناسێنراوە، ئەمە جگە لە هەمەڕەنگی و دانانی وێنەکانی کتێبەکە بە ئاستێکی بەرزی هونەرییانە. لەبەر ئەم لایەنە درەوشاوانەی ئەم ڕۆشنبیر و مێژوونووسە گەورەیەی نەتەوەکەمان، لە دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم بڕیارماندا (ڕۆڤار)ێکی تایبەت بە محەمەدئەمین زەکی بەگ دەربکەین و هەرچەندە بەشێکی زۆری ئەو ژمارانەی ڕۆڤار کە بۆ نووسەران و ڕۆشنبیرانی تر دەرکراون، هەموویان کەسی ناودارو داهێنەربوون، بەڵام ئێمە لە ڕۆڤار هەمیشە بۆ دەرکردنی ڕۆڤار بۆ کەسایەتییەکان ڕەچاوی ئەوەمان کردووە لەو سات و کاتەدا چ کەسایەتییەك زیاتر بەدەستەوە دێت و بابەت و وتار و وێنە و ئەرشیفی بەردەست دەکەوێت، ئەوەش بووەتە بنەمای ڕیزبەندی ژمارەکانی ڕۆڤار.

دوا خاڵ لەسەر گرنگی ئەم کتێبە و ژیاننامەی ئەم مێژوونووسە گەورەیەی کورد ئەوەیە کە هیچ کەسایەتییەکی کورد نییە هێندەی ئەم پۆست و پلەی گرنگی لە حکومەت و دەسەڵاتدارییەتی عێراقدا وەرگرتبێت، بەڵام یەك چرکەش لە هەستی نەتەوایەتی و خزمەتکردن بە کولتوور و ڕۆشنبیریی نەتەوەکەشی دانەبڕاوە، گرنگترین پۆستەکانیشی لە عێراقدا لە نێوان ساڵانی ١٩٢٥ بۆ ١٩٤٨ بریتیبوون لە جێگری سەرۆکی ئەنجومەنی نوێنەرانی عێراق، وەزیری جەنگ، وەزیری ئەشغاڵ و گەیاندن، وەزیری مەعاریف، وەزیری بەرگری، وەزیری ئابووری، نائیبی سلێمانی.

# (محەمەدئەمین زەکی) و ژیانی و چالاکییە ڕۆشنبیرییەکانی

هیوا حەمید

### ١ـ گرنگترین وێستگەی ژیانی:

محەمەدئەمین کوڕی حاجی عەبدولڕەحمانی کوڕی مەحموودی کوڕی سادق باپیرە، ساڵی ١٨٨٠
لە گەڕەکی (گۆیژە)ی شاری سولەیمانی لە دایك بووە، لەبەر زیرەکی هەر لە منداڵییەوە نازناوی (زەکی)یان پێ بەخشیوە.
سەرەتای خوێندنی لە سولەیمانی دەستپێکردووە، دوای تەواوکردنی قۆناغی سەرەتاییش، چۆتە قوتابخانەی (ڕوشدییەی سەربازی) لە سولەیمانی، ساڵی ١٨٩٦
ئەم قۆناغەشی تەواوکردووە و پەیوەندی بە(ئامادەیی سەربازی)کردووە لە بەغداد، دوای تەواوکردنی ئەم قۆناغەش بە سەرکەوتوویی چۆتە (ئاستەمبول)ی پایتەختی دەوڵەتی عوسمانی بۆ تەواوکردنی کۆلیژی سەربازی، ساڵی ١٩٠٢ بە ئەفسەری پلە دوو دەرچووە، دوای ئەوە ڕاستەوخۆ بۆ کۆلیژی(ئەرکان) هەڵبژێردراوە لە ئاستەمبول، ساڵی ١٩٠٤بەسەرکەوتویی ئەم قۆناغەشی تەواوکردووە و بۆتە (ڕەئیس ئەرکان).
هەر لە هەمان ساڵدا یەکەم کاری کارگێڕی گرتۆتە ئەستۆ و لە سوپای شەشەم لە بەغداد دامەزراوە، دوای کودەتای ئیتیحادییەکانیش لە ساڵی ١٩٠٨، لەسەر داوای خۆی گواستراوەتەوە بۆ سوپای(دوو)کە بنکەکەی لە(ئەدرنە)بوو، هەر لەم سەروبەندەدا کراوە بە ئەندامی لێژنەی (نەخشەکان)، هەروەها وەك ئەفسەری تۆبۆگرافی لە لێژنەی دیاریکردنی سنوری نێوان تورکیا و بولغاریا دانراوە، هەر لەم چوارچێوەیەدا کراوەتە ئەندام لە لێژنەی دیاریکردنی سنوری نێوان ڕووسیا و تورکیا لە ناوچەکانی (قەفقاسیا).
ساڵی ١٩١٢لە شەڕەکانی(بەلقان) بەشداری کردووە، وەك ئەفسەرێك لە تیپی(پێنجەم)، بۆ ماوەی ساڵێك لە بەرەکانی جەنگ ماوەتەوە.کاتێکیش جەنگی جیهانی یەکەم هەڵدەگیرسێ، بەدرێژایی ماوەی جەنگەکە لە بەرەکانی جەنگ دەبێت، لە چەندین شەڕی گەورە و بەناوبانگ بەشداری کردووە، لەوانە شەڕی بەناوبانگی(سەلمان پاك)، کە بۆ یەکەم جار هێزەکانی بەریتانیا لە عێراق تووشی شکست هاتن بەرامبەر سوپای عوسمانی، پاشان دوای گەمارۆدانیان لە ساڵی ١٩١٦هێزێکی گەورەی بەریتانی بە ناچاری خۆیان بەدەستەوەدا، لە دوا ساڵانی جەنگیش لە سوریا و فەلەستین بووە. دوای کۆتایی هاتنی جەنگ تا ساڵی ١٩٢٤لە تورکیا ماوەتەوە، لەم ساڵەدا گەڕاوەتەوە عێراق. (زەکی) لە دوای گەڕانەوەی چەندین جار پۆستی ئیداری و سەربازی و سیاسی گەورەی وەرگرتووە و چەند جارێك بۆتە وەزیر و ماوەیەکی زۆریش نوێنەری پەرلەمان بووە، تەنانەت لە دوا ساڵانی ژیانی بۆتە ئەندامی ئەنجومەنی پیران لە عێراق، تا لە ساڵی ١٩٤٨کۆچی دوایی کردووە.

## ٢- ڕۆڵی ڕۆشنبیری:

محەمەدئەمین زەکی، یەکێکە لەو کەسایەتییە ناودارانەی کورد، کە لە نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەم ڕۆڵێکی یەکجار گەورەی لە بواری ڕۆشنبیری بینیوە، گرنگترین هەنگاویشی لەم بوارەدا نووسینەوەی مێژووی کورد بووە، چونکە بە یەکەم نووسینەوەی مێژووی کورد دادەنرێت کە تا ڕادەیەك شێوەیەکی زانستی پێوەدیاربێت، ئەمەش بوو بە ڕێچکەیەك بۆ هەموو ئەوانی تر کە دوای ئەو گرنگییان بەم بوارە داوە.
ئەوەی ئێمە مەبەستمانە لەم بابەتە بیخەینە ڕوو، ڕۆڵی ڕۆشنبیری ئەم کەسایەتییەیە، گومانی تێدا نییە تەواوکردنی قۆناغەکانی خوێندن تا کۆلێژی سەربازیش لە (ئەستانبول) بە تایبەتی لە سەردەمێکدا خوێندەواران بە پەنجەی دەست دەژمێردران، کاریگەری زۆر گەورەی لە سەر فراوانکردن و دەوڵەمەندکردنی لایەنی ڕۆشنبیری ئەو کەسایەتییە هەبووە.
جگە لەمەش زانینی چەند زمانێکی تر یارمەتی دەرێکی گەورە بوو بۆ فراوانبوونی چالاکییەکانی لەو بوارەدا، ئەوەی لە سەرچاوەکان ئاماژەی بۆ کراوە(زەکی) جگە لە زمانی کوردی، زمانەکانی عەرەبی و تورکی و فارسی و فەڕەنسی بە باشی زانیوە، هەروەها بایەخی زۆری بە زمانەکانی ئینگلیزی و ئەڵمانیش داوە.
ئەم تایبەتمەندییانەی لە سەرەوە ئاماژەمان بۆ کرد، ڕێگا خۆشکەربوون بۆ(زەکی) تا بە شێوەیەکی چالاك کارە ڕۆشنبیرییەکانی ئەنجام بدات، بۆ ئەمەش هەر لە زووەوە دەستی بە نووسین کردووە، سەرەتای نووسینەکانیشی لەو کاتەدا بوو کە ئەفسەر بووە لە نێو سوپای عوسمانی و هێشتا نەگەڕابۆوە کوردستان. نووسینەکانی ئەو سەردەمەی لە چەند پەڕتووکێکی سەربازی خۆی دەبینێتەوە، کە ئەمانەن:

١- سوپای عوسمانی.
٢- لێکۆڵینەوەیەك لەسەر جەنگەکانی عوسمانی.
٣- چۆن عێراقمان لە دەست چوو.
٤- ڕووداو و شەڕەکانی سوپای عوسمانی لە جەنگی یەکەمی جیهانی.
٥- جەنگ و شەڕەکانی عێراق و هەڵەکانی.
٦- جەنگی (سەلمان پاك).
٧- بەغداد و ڕووداوی لە دەستدانی کۆتایی.
٨- کورتەیەك لە مێژووی جەنگی عێراق.
شایانی ئاماژە بۆ کردنە، ئەم بەرهەمانە هەمووی لە کاتی خۆی بە زمانی تورکی نووسراوە.

دوای کۆتایی هاتنی جەنگی یەکەمی جیهان و هەڵوەشانەوەی دەوڵەتی عوسمانی، ئەفسەر و فەرمانبەرە کوردەکانی ناو دامودەزگاکانی حکومەت و سوپای عوسمانی یەك لە دوای یەك لە ساڵی ١٩٢٤بە یەکجاری گەڕایەوە.
بارودۆخی ئەو کاتەی عێراق و کوردستان لە بارتر بوو بۆ گرینگیدان بە بواری ڕۆشنبیری و نواندنی چالاکی، ئەمەش لە ئەنجامی ئەو کەشوهەوا ئازادەی دوای نەمانی دەسەڵاتی عوسمانی سەری هەڵدا بوو، ئەمەش دەرفەتێکی گونجاو بوو بۆ(زەکی) تا دەست بە چالاکییە ڕۆشنبیرییەکانی بکات. یەکێك لەو چالاکییە ڕۆشنبیرییانەی(زەکی) بە گوڕو تینەوە تێدا بەشدار بووە، دامەزراندنی(یانەی سەرکەوتنی کوردان)ە، کە لە ئایاری١٩٣٠لە شاری بەغداد، لەلایەن ژمارەیەك ڕۆشنبیری کورد بە مەبەستی گرنگیدان بە بوارە جیاکانی ڕۆشنبیری کوردی دامەزرا. ئەم یانەیە بە یەکێك لەم دەزگا کوردیانە دادەنرێت کە درێژترین ماوە توانیویەتی خزمەتی زمان و ئەدەب و مێژووی کورد بکات، کە تا ساڵی١٩٥٨بەردەوام بوو.(زەکی) بە هۆی ئەو پێشینە ڕۆشنبیری و ئەو کەسایەتییە بە هێزەی هەیبووە، لە کۆنگرەی یەکەمی یانەکە وەك یەکەم سەرۆکی یانەکە هەڵبژێردراوە، لە ماوەی سەرۆکایەتییەکەشی یانەکە چالاکی فراوانی ئەنجام داوە.

بوارێکی تری ڕۆشنبیری کە (زەکی) ڕۆڵی گەورەی تێدا هەبووە،کردنەوەی بەشی کوردی ئێزگەی بەغدادە،کە لە ڕۆژی ٢٩کانوونی دووەمی ساڵی١٩٣٩کرایەوە. شایانی باسە (زەکی) هەوڵێکی زۆری داوە بۆ کردنەوەی ئەم بەشە، ئەمەش لە زمانی شایەتحاڵێکی ڕادیۆکە باسی لێوەکراوە، ئەویش(کامیل کاکەمین)ی یەکەم بەڕێوەبەری بەشی کوردییە لە ئێزگەی بەغداد، لەم بارەیەوە وتویەتی:((هەر یەك لە محەمەدئەمین زەکی و تۆفیق وەهبی بەشدارییەکی گەورەیان لە دامەزراندنی بەشی کوردی و یارمەتیدانی بەڕێوەبەرایەتییەکەهەبووە)).
گرنگترین بواری ڕۆشنبیری و زانستی کە (زەکی)کاری لەسەر کردبێت، بواری(مێژوو)بووە، وەك دەردەکەوێ (زەکی) جگە لەوەی بە بایەخەوە سەیری ئەو زانستەی کردووە، خۆشەویستییەکی بێ هاوتاشی بۆ هەبووە ـ بە تایبەتی بۆ مێژووی کورد و کوردستان ـ ، ئەمەش وای کردووە، هەر لە زووەوە گرینگی بەم بوارە بدات و خۆی بۆ ئامادە بکات. بۆ ئەمەش هەر لە ساڵی( ١٩٠٨)وە، دەستی کردووە بە کۆکردنەوەی سەرچاوەی پێویست دەربارەی مێژووی کورد و کوردستان، لەم سەروبەندەدا چەندین جار سەردانی کتێبخانەکانی(ئاستانە-ئەستانبول)ی کردووە، تەنانەت لەم کاتانەی بۆ کاری دەوڵەت ڕەوانەی ئەوروپا کراوە، دەرفەتەکەی قۆستۆتەوە و بە دوای ئەو کتێبانەدا گەڕاوە، کە سەرچاوەن بۆ مێژووی کورد و کوردستان.
دوای کۆکردنەوەی سەرچاوەکان، کەوتە ئامادەباشی بۆ

نووسینەوەی مێژووی کوردستان، بەڵام بە هۆی هەڵگیرسانی جەنگی یەکەمی جیهانی و چوونی بۆ بەرەکانی جەنگ پرۆژەکەی بۆ جێبەجێ نەکرا.
دوای جەنگ جارێکی تر گەڕاوەتەوە سەر ئەنجامدانی کارەکەی و دەستی بە نووسینەوەی مێژووی کورد کردووە، بەڵام ئەمجارەش کارەکەی بۆ ئەنجام نەدرا، بە هۆی ئەو ئاگرەی لە ساڵی ١٩١٩ئەو گەڕەکەی لە (ئاستەنبول) سووتاند، کە (زەکی) تێدا نیشتەجێ بوو، لەم ڕووداوەدا هەموو کتێبخانەکەی و گشت ئەو نووسینانەی ئامادەی کردبوون سووتا و هیچ شتێکی بۆ نەماوەتەوە.
دوای ئەوەش بەهۆی ڕووخانی دەوڵەتی عوسمانی و ئاڵوزبوونی بارودۆخی سیاسی و ناسەقامگیری ژیانی (زەکی) تا دوای گەڕانەوەی بۆ عێراق شتێکی لەم بوارە ئەنجام نەداوە، بەڵام جارێکی تر ئەم پرۆژەیە لەلای تازە بۆتەوە و بۆ ئەمەش دەستی داوەتە قەڵەم و چەند کتێبێکی پوختی لەسەر مێژووی کورد و کوردستان نووسیوە، کە تا ئێستاش بە سەرچاوەی گرنگی مێژووی کورد دادەنرێت.
لێرەدا هەوڵ دەدەین بە کورتی باس لە بەرهەمەکانی (زەکی) بکەین:
١ـ کورتەی مێژووی کورد و کوردستان لە کۆنترین سەردەمە مێژووییەکان تا ئێستا. ئەم بەرهەمە لە دوو بەش پێك دێت، بە زمانی کوردی نووسیوەتی، بەشی یەکەمی لە ساڵی ١٩٣١ لە بەغداد چاپکراوە و نزیکەی(٤٠٠) لاپەڕەیە، ئەم بەشە لە ساڵی١٩٣٩ لەلایەن (محەمەد عەلی عەونی) وەرگێڕدراوە بۆ سەر زمانی عەرەبی.
بەشی دووەمی هەمان کتێب لە ساڵی ١٩٣٧ لە بەغداد چاپکراوە و نزیکەی(٤٣٠) لاپەڕەیە، کە تێدا باس لە مێژووی سەدەکانی پێش مێژووی کورد دەکات، ئینجا دێتە سەر مێژووی میرنشینە کوردەکانی سەردەمی ئیسلامی تا دەگاتە سەدەی(١٩)ز، بەهەمان شێوە، ئەم بەشەش لەلایەن (محەمەد عەلی عەونی) لە ساڵی١٩٤٥وەرگێڕدراوەتە سەر زمانی عەرەبی.

٢ـ مێژووی سلێمانی و دەوروبەری: ئەم کتێبەشی بە زمانی کوردی نووسیوە، ساڵی ١٩٣٩لە بەغداد چاپکراوە، نزیکەی(٣٠٠) لاپەڕەیە، وەکو بەرهەمەکانی تری ئەم بەرهەمەشی لەبەر گرنگی خراوەتە سەر زمانی عەرەبی، بەڵام ئەمجارەیان لەلایەن مێژوونووسی کورد (محەمەد جەمیل ڕۆژبەیانی) لە ساڵی ١٩٥١ کارەکە ئەنجام دراوە.
ناوەڕۆکی ئەم کتێبە باس لە مێژووی سلێمانی و دەوروبەرەکەی دەکات، لەوانە ناوچەی (شارەزوور) هەر لە سەردەمە کۆنەکانەوە تا دەگاتە سەردەمی ئیسلامی و پاشان کۆتاییەکانی سەردەمی عوسمانی، هەروەها باس لە میرنشین و میرە کوردەکان کراوە، تەنانەت ئاماژە بۆ هۆزەکانی ناوچەکەش کراوە، ئەمە جگە لە ئاماژەدان بە هەردوو تەریقەتی (نەقشبەندی و قادری).

٣ـ ناودارانی کورد و کوردستان لە سەردەمی ئیسلامیدا: ئەم بەرهەمەی لە دووبەش پێکدێت، بەشی یەکەم لە ساڵی١٩٤٥ و بەشی دووەمیش لە ساڵی١٩٤٧لە بەغداد چاپکراون. ناوەڕۆکەکەیان پێکهاتووە لە ئاماژەکردن بە ناساندنی هەموو ئەو زانا و ناودارە کوردانەی لە سەردەمە یەك لە دوای یەکەکانی حوکمڕانی دەوڵەتی ئیسلامی ڕۆڵ و چالاکییان هەبووە.

٤ـ جگە لەم بەرهەمانەی، (زەکی) دوو نامیلکەشی بە زمانی کوردی نووسیوە، ئەوانیش بریتین لە، (محاسبەی نیابەت) کە لە ساڵی١٩٢٨نووسیویەتی و پێکهاتووە لە(٣١) لاپەڕە. دووەمیشیان، (دوو تەقەڵای بێ)، کە لە ساڵی ١٩٣٥نووسیویەتی و لە (٦٩) لاپەڕە پێکهاتووە، شایانی ئاماژە بۆ کردنە ناوەڕۆکی ئەم دوو نامیلکەیە تەرخانکراوە بۆ چالاکییەکانی خودی خۆی لەو کاتانەی نوێنەری سلێمانی بووە لە پەرلەمانی عێراقی.

١- جاهید ٢- سانیحە ٣-محەمەدئەمین زەکی ٤-ماجد ٥- بەدیع -- ئەستەمووڵ ١٩٢٢